## پێشەکی

### حەمەکەریم عارف

"١"

مارك توین(١٨٣٥-١٩١٠) یەکێك بووە لەو ئەدیبانەی کە نەیویستووە لەسەر ڕێبازو میتۆدی ئەدیبە ئەمریکییە هاوچەرخەکانی خۆی،کە زۆر دڵبەندو دڵبەستەی ئەدەب و هونەرو هزرو کەلتوری ئەوروپا بوون.بڕوات.چونکە پێی وابوو یەکێك لە مەرجەکانی ڕەسەنایەتی راستەقینە ئەوەیە کە ئەدیب لە ئاخی وەڵاتی خۆیدا بۆ ڕەگوریشەی ئەدەبەکەی بگەڕێت،چونکە هەرشتێك لە دەرێڕا بهێنرێت و هاوردە بکرێت،ئەدەب و هونەر هاوردە ناکرێت..ئەگەرچی رواڵەتی شۆخی و کۆمیدی بەسەر بەرهەمەکانیدا زاڵە،لێ هونەرمەندانە بە تەوس وتوانج وساتیران موتوربەی کردوون و بیرو باوەرو سیستەمە کۆمەڵایەتی و حکومەتییە باوەکان لە تیری تەوس و توانجی نەخەلەسیوون.

مارك توین،لەشاری هانیبالی ویلایەتی میزوری سەر روبار می سی سی پی لە دایك بووە.هەر لە منداڵییەوە گیانی گەڕان و کەشفکاری تیابووە.لە تەمەنی دەساڵیدا لەبەر نەداری و دەستکورتی و لە پێناوی دابینکردنی بژێوی ژیاندا قوتابخانەی تەرککردووەو ملی داوەتە بەرکاری جۆراوجۆرو سەردەمی منداڵی و لاوی بە سەفەرو گەڕان و ڕیسکان بەسەر بردووە.بەڵام پاش مردنی بابی بە شاگردی لە چاپخانەیەکدا کەوتووەتە کار کە بۆ ئەو قوتابخانەیەکی گەورە بوو.چونکە هەر کتێبێك کە لەو چاپخانەیە دەردەچوو،ئەو بەدەم کارو ئیشەوە دەیخوێندەوەو لە سەرەتای لاویدا شارەزاییەکی تەواوی لە ئەدەبیاتی ئینگلیزیدا پەیداکرد..بەڵام چونکە کەسێکی ئاشقە گەران وسەفەران بوو،لە سەرەتای لاویدا دەستبەرداری کاری چاپخانە بوو،ولە روباری میسیسیپی دا کەوتە کاری کەشتیڕانی..پاشان بۆ ماوەی چەند هەفتەیەك،لە جەنگی ئەهلی دا،بوو بە سەرباز لە سوپای کۆنفیدرالیدا.دوای ئەوە بوو بە پەیامنێری گەرۆك لە نیڤاداو کالیفۆرنیا.دیارە ئەم هەموو سەفەرو گەرانە بەردەوامە بۆ خۆی ئەزموونێکی دەوڵەمەند بوو،ولە نزیکەوە بە ژیان و تەبع و تەبیعەتی مرۆڤی ئاشناکرد و ئەمە بە ئاشکرا لە بەرهەمەکانیا ڕەنگی داوەتەوەو بە خۆی دانی بەوەدا ناوە کە هەر هەموو کاراکتەرێن رۆمانەکانی،لەو خەڵك و کەس و کەسایەتیانەوە هەڵێنجاون کە دیتوونی و لە کارێن هەمەجۆردا،ولە دەڤەرێن جیاوازی وەڵاتدا کارو سەفەرو مامەڵەی دەگەڵ کردوون.

مارك توین،وەکو گەلێك لە ئەدیبە ئەمریکییەکان، ژیانی ئەدەبی خۆی لە کاری رۆژنامەوانییەوە دەست پێکردووەو توانیوییەتی لە میانەو رێگەی کاری رۆژنامەوانییەوە میتۆدو رێبازێکی ئەدەبی رۆمانەوانی تایبەت بە خۆی بدۆزێتەوە، لە ساڵی ١٨٦٥دا یەکەم رۆمانی لەژێر سەرناڤی(الچدفدعە القافزە المبجلە)نووسی،کە زنجیرە تابلۆیەکی جوانی ئەو دیمەن و کەسانەیە کە دیتوونی و هەڵسەکەوتی دەگەڵ کردوون..لەگەڵ بڵاوبوونەوەی رۆمانی ناڤبریدا نێوبانگ و شۆرەتێکی زۆری پەیداکرد..مارك توین،وەکو ئاماژەمان کردێ کەسێکی ئاشقە گەران و سەفەرو

سەرکێشی و ریسکان بوو.بۆ نموونە سیازدە ساڵ لە دوورە وەلاتیدا ژیاوە،بیست دانە جار بە ئۆقیانووسی ئەتلەسیدا پەڕیوەتەوە..بۆیە بە شێوەیەکی گشتی رۆمانەکانی دەنگدانەوەو رەنگدانەوەیەکی هونەریانەی ئەم سەفەرو گەڕانانەی خۆین چ لە ناوەوەو چ لە دەرەوی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا.بۆیە ئۆتۆبیوگرافی و دیتن و باری سەرنجە شەخسییەکانی بوون بە کەرەستەی خاو وتیمەی زۆربەی رۆمانەکانی.بەلام ئەمە هەرگیز لە بایەخی هونەریی رۆمانەکانی کەم ناکاتەوە،چونکە خاوەنی جیهانبینی فیکری،وگیانی تەنزبازی و رۆحی کۆمیکی ونەفەسی گێرانەوەی خۆبەخۆیی تایبەتی خۆیەتی،و توانیویەتی چ لە قارەمانەکانیا و چ لە هەڵوێست و چ لە دیدو بۆچوونانیدا،هەموو رەگەزە هەڤدژەکان بە جۆرێکی هونەریی ئەوتۆ ئاوێتە بکات کە هەرگیز نەکاتە تۆمارکردنێکی راپۆرکارانەی رووت و بیرتووشی دیتنە شەخسییەکانی خۆی.هەرهەموو ئەم فاکتەرانە کردوویانەتە کارێك کە لە بواری رۆمانی ئەمریکیدا بە پێشەنگ و سەرامەد بژمێردرێت.ئەوەتا ئێرنست هەمینگوای لە بارەیەوە دەڵێت:"هەموو ئەدەبی ئەمریکی هەڵقوڵاوی کتێبی(هاکلبری فین)ی مارك توینە،و ئەم کتێبە تا ئیستا باشرین بەرهەمی ئەدەبی ئەمریکییە.."

"٢"

کەواتە مارك توین،سەرامەدو پێشەنگی بێ هەڤرکی رۆمانی ئەمریکییە.یەکەم کەسە کە بە دووی رەسەنایەتی هونەریدا گەڕاوەو نەیویستووە لاسایی نموونە ئەدەبییەکانی ئەوروپا بکاتەوە.توانیویەتی لە رێگەی ئەو وێنە هونەریانەوە کە لەمەڕ دۆڵی بەرینی میسیسیپی،کە بە دڵی ئەمریکا دەژمێردرێت،گرتوونی کەسایەتی ئەمریکی بەرجەستە بکات.لێ رۆماننوسەکانی بەر لەو وەك: (هاولز،ملفیل،وهۆترون..)هەمان رێچکەو رێبازی رۆمانەوانی ئەوروپایان گرتەبەر.بەلام مارك توین،بە پێچەوانەوە دژی ئەو پاشکۆیاتیە وەستاو بە جددی عەوداڵی دۆزینەوەی هونەریانەی رەگ و ریشەی کەسایەتی ئەمریکی بوو.ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە بە لاسایی کردنەوەو چاولێکەری قاییل نەبێت و رێبازو رێچکەی تازەی خۆی بدۆزێتەوە..هەڵبەتە لەسەر ئەمە رەخنەیەکی زۆری لێدەگیراو بە نەزان و کۆنەپەرست و بیرتەسك تۆمەتبار دەکرا.بەلام ئەوانەی کە رەخنەیان لێدەگرت غافڵ بوون لەوەی کە مارك توین عەوداڵی رەسەنایەتی نەتەوەییە،ورەسەنایەتی نەتەوەییش لە نۆرین و روانگەی ئەوەوە دەیکردە سەربەخۆیی تەواو ونۆڕینی بابەتیانە بۆ کەسایەتی نەتەوەکانی دی.بەلام وێڕای ئەمەش زۆر بە درەنگەوە خوێنەران گەیینە ئەو قەناعەتەی کە مارك توین ئەدیبێکی رەسەنی خودا نۆرین و جیهانبینی هونەریی خۆیەتی.وەك دیارە مارك توین سەردەمی منداڵییەتی لە بازێری هانیبال بەسەربردووە.هانیبال بازێرۆکێك بووە لەسەر روباری میسیسیپی،راستە شوێنێکی بچووك بووە، لێ شارێکی پڕجم و جوڵ و چالاکی بووە،خاڵی پێکگەییشتنی رۆژهەلاتی کۆن و رۆژاوای تازە بووە،بە هەزاران کۆچبەری ئەورووپی بە هانیبال دا بەرەو قەڵەمڕەو ودەڤەرەکانی دی تێدەپەرین..مارك توین لەم بازێرۆکەدا قولەرەش وکۆیلە و جەنگاوەران و پیاوکوژان و قاچاغچی و یاخی و کرێکاری کەشتی ناسی.بەلام سەرباری ئەم هەموو جم و جوڵ و جەنجاڵییەش،شارێکی مارك توین گوتەنی

خەواڵۆو هێمن و هێدی بوو.هەرکە کەشتییەکان دەڕۆییشتن،ئیدی ئارامی و هێمنی و خەواڵۆیی باڵی بەسەر بازێڕۆکەکەدا دەکێشایەوە..ئەم باکراوندانە لە زۆربەی بەرهەمەکانی مارك توین دا رەنگی داوەتەوە.وەك: (تۆم سویر-١٨٧٦،هاکلبری فین-١٨٨٤،لە کەنارێن می سی سی پی-١٨٨٣) مارك توین بەهەمان چاوەوە دەیروانییە میسیسیپی کە میسرییە کۆنەکان دەیانڕوانییە روباری نیل.ئیدی میسیسیپی بۆ ئەو رەمزی خۆشی و ئاشتی،خەم وتەنیایی،ترس وهەڕەشە بوو.هەموو ئەم حاڵە لێکدژانە لە بەرهەمی توین دا رەنگی داوەتەوەو جۆرە زندوویەتی و پاراوییەکی تایبەتیان پیێ بەخشیوە..وئەم باکراوندە وەسفییە لە لای ئەو بووە بە رەگەزێکی زندووی بارگاوی بە نوێڕینێکی هزری و هونەری بەرزو جوان.

***

ئەوەی کە لە رۆمانەکانی مارك توین دا مایەی سەرنجە ئەوەیە کە کاراکتەری کاریگەری ئافرەتی یان تیا نییە یان زۆر زۆر کەمە.جگە لە (سەربردەکانی جاندارك) کە لەوێدا مارك توین یەجگار دڵبەندی کەسایەتی جاندارکە، ئیدی جیهانی رۆمانەکانی زیاتر جیهانی مێردمنداڵ و نۆلاو و پیاوانە.لەوەش دەچێت هۆی نووسینی دەربارەی جاندارك بگەرێتەوە بۆ ئەو باکراوندە رۆشنبیرییە دەوڵەمەندەی کە لە بواری مێژوودا هەی بوو،تا لە میانەی کەسایەتی جاندارکەوە هەڵوێستی مرۆڤ لەمەڕ گەردوون بەرجەستە بکات..ئەم باکراوندو پاشخانە مێژووییە لە هەردوو رۆمانی (شازادەو گەدا- ١٨٨٢)و(یانکی لە دەرباری ئارتۆر شادا-١٨٨٩)دا رەنگی داوەتەوەو نووسەر وێنەیەکی خەیاڵی پڕ لە تەوس و توانجی لە میانەی ئینگلتەرای سایەی حوکمڕانی ئارتۆر شادا پێشکەش کردووە.ئەمەش ئەوە دەسەلمێنێت کە مارك توین،هەر بە گەشتی جوگرافیاییەوە نەوەستاوە، بەڵکو خۆی لە مێژووش داوە، تا بە شێوەیەکی هونەری لە سەردەمێکەوە بۆ سەردەمێکی دیکەی بگوازێتەوە،و ئەمەش بەڵگەو نیشانەی هەمەجۆری و دەوڵەمەندی خەم و کەڵکەڵەو خولیا هزری و هونەرییەکانییەتی.

یەکێك لەو دەسکەوتە راستەقینانەی کە مارك توین بۆ ئەدەبی ئەمریکی بە دەستهێناوە، ئەمەیە کە زاری باوی ئەمریکی بە دوور لەو قاڵبە زمانەوانیە تەقلیدییانەی کە لە ئەوروپاو زمانە ئەوروپاییەکانەوە هاتبووە ناو ئەدەبی ئەمریکییەوە، کرد بە زمانی نووسین و ئەدەبیات.کردی بە زمانێك کە بۆ نووسین و بەرهەمهێنانی ئەدەبی بشێت.هەروەها توانی ئەدەبی ئەمریکی لە پاشکۆیاتی و لاسایی کردنەوەی ئەو ئەدیبە ئەوروپاییانە رزگاربکات کە پێیان وابوو ئەدەبی ئەمریکی کۆمەڵە هەوڵێکی سادەو ساکاری خەڵکانێکی کۆلکە رۆشنبیرو کەم سیوات و مەعریفەتە،وهەموو ئاواتێکیان ئەوەیە لاسایی نموونە ئەوروپاییەکان بکەنەوە.جا ئەگەر(کۆپر و ئرفینج و پۆ و ویتمان)رێگەیان بۆ کەسایەتی سەربەخۆی ئەدەبی ئەمریکی خۆش کردبێت،ئەوا مارك توین توانی کۆڵەکەو پایەکانی ئەم کەسایەتیە بچەسپێنێت و بێگانان ناچار بکات بە چاوی رێزەوە بڕواننە ئەم کەسایەتیە،وتاکو ئەمرۆ رۆمانەکانی لە ئەوروپاو لە قەڵەمڕەوانی ئینگلیزی زماندا یەجگار بڵاو و بەڕەواجن.وخەڵکی بە خۆیان ئەوەیان کەشفکردووە کە چ جددییەتێکی راستەقینە لە پشت پەردەی رواڵەتی کۆمیدی بەرهەمەکانییەوە پەنهانە.جددیەتی توین لەوەدایە

کـە بـە کـردەوەو بـە نووسـین لـە ئەمریکییـەکانی گەیانـد کـە سـەربەخۆیی و جیابوونـەوەی راستەقینەیان لـە ئینگلتـەرا و لـە ئـەوروپا بـە بـێ سـەربەخۆیی هـزری و هونـەری ناچێبێت.مـارك تـوین بابایـەکی واقیعـی و بابەتگـەردا بـوو، ئـەم بابەتگەراییـەی زۆر بـە جـوانی لـە بەرهەمەکانیـدا بەکار بردووەو ئەمەش وایکردووە کە بەرهەمەکانی سـنووری کـات و شـوێن ببـەزێنن..مـارك تـوین زۆر بە خەمەوە بووە لە ڕێگەی کاراکتەرەکانییەوە بەها مرۆڤانییەکان بەرجەسـتە بکـات،و بۆیـەش لەم کارەیدا سەرکەوتوو بووە چونکە تواناو بەهرەیـەکی کۆمیکی و سـاتیری گـەورەی هـەبووە لـە هونەرانـدنی دیـاردەو ڕووداوەکانـدا، شـێوازێکی تەوسـامێزی زنـدووی لـە دەربـڕین و گوزارشـتدا هەبووە،شـێوە زارە باوەکـانی گۆڕیـوە بـۆ زمـانێکی هونـەری دیـالۆگی و بـە جـۆرێ خسـتویەتیە سـەرزاری کاراکتـەرو قارەمانـەکانی کـە ژیانیـان لێ هەڵـدەقوڵێت..بـەڵام وێـرای ئەمـەش لـە هەنـدێ هەڵـەو کـەم و کـوڕی هونـەری بـەدەر نـەبووە. لەوەدەچێت شـارەزاییەکی باشـی لەمـەڕ زەرورەتـی شێوەو فۆرمی هونـەری نـەبووبێت، بۆیـە هەنـدێ لـە ڕۆمانـەکانی بـڕیتین لـە زنجیرە هەڵوێسـت و دیتنێك کە دەشێت لە دوای هەر دیمەنێك بوەستن یان بەردەوام بن..هەڵبەتـە کارکردنی لـە بـواری ڕۆژنامەوانیدا تا ڕادەیەکی زۆر کاری لە شێوازی ڕۆماننووسـی ئـەو کـردووە.چـونکە زیـاتر بایـەخ بـەو هەڵوێسـتە دەدت کـە دەیگێڕێتـەوە بـێ ئـەوەی نـۆڕینێکی هەمـە لایـەنی بـۆ کارەکـەی وەکـو یەکەیـەکی یەکپارچـەی هونـەی هـەبێت.دیـارە ئەمـەش بـۆ کەسـێکی پێشـەنگ و سـەرامەد، بـۆ کەسێکی ڕچەشکێن،بۆ کەسێك نەهاتبێتە سەر کۆمەڵێك میتۆدی حازرو باو،زۆر ئاساییە..کەچی بـەو حاڵەشـەوە توانیویـەتی لـە ڕێگـەی شـێوازە خۆبـەخۆیی و ڕاسـتەوخۆیەکەیەوە کۆمـەڵێك ڕۆمانمـان پێشـکەش بکات کـە ژیانیـان لێهەڵـدەقوڵێت،جیهانێکمان پێشـکەش بکات کـە مـۆرك و شەقڵی تایبەتی ئەوی پێوەیـە.جا مـارك تـوین هەوڵیداوە لـەو جیهانـەوە پشـتیوانی لـە مـرۆڤ،دژی هـەر چەوسـانەوەیەك، دژی هـەر هـەوڵێك بـۆ بـە دەعـەجانی کردنـی مـۆرۆڤ و سـڕینەوەی دەوری مرۆڤانی مرۆڤ لە ژیاندا بکات،و بۆ بەرجەستەکردنی ئـەم مەبەسـتەش پـەنای وەبـەر بـەکارهێنانی هـەموو ڕەگـەزو ئـەوزارێکی کۆمیـدیا وسـاتیرو دیـالۆگ و وەسـف و ڕەگـەزە هونەرییـەکانی دیکـە بردووە، تا پشتیوانی لەو بەها مرۆڤانیانە بکات کە خـەڵکی لـە گەرمـەی ژیـن و کێشماکێشـەکانی ژیاندا لەبیری دەکەن..

"٣"

ناوی ڕاستەقینەی مارك توین(ساموئیل لانگهۆرن کلیمنسە). لە ١٨٣٥/١١/٣٠دا لە بازێڕۆکێکی ویلایەتی میزوری لە خانەوادەیەکی هەژاری دەستکورت لە دایك بووە.دایك و باوکی ساموئیل بـە ئومێدی بەدەستهێنانی سەروەت و سامان و دەوڵەمەندبوون لە شوێنانی تـرەوە بـۆ ئـەمریکا کـۆچ دەکـەن کـە هـەگیز بـەو ئاواتـەیان ناگـەن. سـاموئیل هەشـت نـۆ سـاڵان بـوو کـە بـابی مرد،بۆیـە لـە پێناوی دابینکردنی بژێوی ماڵباتەکەیاندا هەر بە منداڵی ملی بەکارو کاسبییەوە ناو قوتابخانـەی تەرك کرد.هەوەڵجار بە شاگردی لە چاپخانەیەکدا کەوتە کارکردن، ئیدی زۆر کاری جەڕبانـدو تـا لـە تەمـەنی بیسـت و یـەك ساڵیدا، کەوتـە کـاری کەشتیرانی لـە ڕوبـاری میسیسـیپی.جا نازنـاوی (مـــارك تـــوین) یادگـــاری ئـــەو قۆناغەیـــە کـــە لـــە ڕوبـــاری نێـــوبراودا کـــاری کەشـــتیرانی

دەکرد:کەشتیوانەکان زۆرجار بۆ ئەوەی ئەندازەی قووڵی ئاوی روبارەکە بە کەشتیەکان رابگەیەنن، نیشانەیەکیان بە ژمارەوە لە کەناری روبارەکە دەچەقاند،بۆ نموونە بە کەشتیەکانیان دەگوت بەلای(مارك تری–نیشانەی سێیەم)یان (مارك تواین–نیشانەی دووەم)دا حەرەکەت بکەن.ئیدی ساموئیلی نۆلاو کە تازە دەستی دابووە نووسین و کەم کەم وتارەکانی لە رۆژنامانـدا بڵاو دەکردەوە،بە دوای نازناوێکدا دەگەڕا و ناوی (مارك تواین– نیشانەی دووەم)ی پێ خۆشبوو،و لەوە بەدواوە ئەونازناوەی (مارك توین)ی بۆ خۆی هەڵبژارد.

مارك توین،پاش ئەوەی سووکە شۆرەت و نێوبانگێکی پەیداکرد،چوو بۆ نیویۆرك و لەوێندەرەوە بۆ سانفرانسیسکۆ رۆیی. بەرەبەرە چووە ریزی نووسەرە عەوامپەسندو خۆشەویستەکانەوە.مارك توین لەو شارەدا درێژەی بە چالاکی ئەدەبی خۆی دا و زۆری نەخایاند کە لە رێگەی بەرهەمە توند ورەخنە ئامێزو پڕ تەوسو توانج و کۆمیدییەکانییەوە نەك هەر لە ئەمریکادا بەڵکو لە نێو هەموو ئینگلیزی زمانانی جیهاندا نێوبانگی دەرکرد.

***

مارك توین لە ساڵی ١٨٧٠دا کە گەیی بووە لوتکەی ناوبانگ، ئاشنایەتی دەگەڵ کیژی ماڵباتێکی ئەرستۆکراتی دەوڵەمەندی ئەمریکاییدا پەیدا کرد و زەماوەندی دەگەڵ کرد، ولەشاری هارتفۆردا ژیانێکی هێمن و ئاسوودەو شکۆداری بۆ خۆی دامەزراند.هەرچەندە سەردەمی گومناوی و دەستکورتی مارك توین بەسەر چوو بوو ودەگەڵ دەوڵەمەندان و ئەرستۆکراتاندا تێکەڵ بووبوو، بەڵام ئەمە لە کاری پیرۆزی نووسینی دوور نەخستەوەو تا مردن قەڵەمە بوێرەکەی لە کارا بوو و هونەریانە رەخنەی لە کۆمەڵگەی کۆنی داتەپیوی خۆرافاتی دەگرت..

مارك توین لە ساڵی ١٩٠٠دا کە لە هەرەتی شۆرەت و ناوبانگدا بوو، جارێکی دی سەفەری بەریتانیای کردو لە لایەن زانستگەی ئۆکسفۆردەوە دکتۆرای فەخری پێ بەخشرا.مارك توین،لە ساڵی ١٩٠٩دا لە ئەنجامی مەرگی کیژە ئازیزەکەیدا کە هەمیشە لە گەڵیا بوو، نەخۆش کەوت،و باری تەندروستی رۆژ بە رۆژ خراپ بوو، تا لە ساڵی ١٩١٠دا، لە تەمەنی هەفتاو پێنج ساڵیدا بە نەخۆشی دڵ کۆچی دوایی کرد.

دیارە مارك توین ئەگەر بە ناسنامە ئەمریکایی بێت، ئەوا لە رووی گوتاری ئەدەبی و هزرییەوە وابەستە بە هەموو جیهانە.رازو نهێنی نێوبانگ و خۆشەویستی ئەم نووسەرە گەورەیە زیاتر لەمەدایە کە پتر لەهەر نیگارکێشێکی زەبەردەست، لە بەرجەستەکردن و هونەراندنی ژیانی پڕ هەڵچوون و جەنجاڵ و پڕ رووداو و بویەرو هەورازو نشێوی سەردەمی خۆیدا هونەرنوێنی کردووەو لە قاڵبی کۆمیدی و تەنزدا توندترین رەخنەی لە بارودۆخی کۆمەڵایەتی سەردەمی خۆی گرتووە.

ئەو رۆمان و بەرهەمانەی کە بوونەتە مایەی شۆرەت و ناوبانگی پڕ لە سەرفرازی مارك توین زۆرن کە هەندێك لەوانە بریتین لە: (تۆم سویر،هاکلبری فین،بەشەر چییە؟،سەربهوردی

جاندارک،ئەمریکاییەك لە دەرباری ئارتۆر شادا،ژیان لە کەناری میسیسیپی، ژیانی من،و شازادەو گەدا..)

شازادەو گەدا کە بە یەکێك لە بەرهەمە هەرە جوان و بەهادارەکانی مارك توین دەژمێردرێت و نووسەی تەنزبازی ئەمریکایی هەزاران درکەو خواستنی پڕماناى تیا بەکاربردووە کە نەك تەنیا پەردەی لە سەر دیمەنە تاریکەکانی مێژووی پێنج سەدەی میللەتی ئینگلیز هەڵماڵیوە، بەڵکو لایەنە دزێو و کرێتەکانی کۆمەڵگەی خویشی لەم ئاوێنە ساف و بێگەردو ئەفسوناوییەدا بە خوێنەران نیشانداوە،کە بەندە لە رووی خەمخۆریمەوە بۆ کتێبخانەی کوردی و بە مەبەستی بەردەوامانەدنی پەیوەندی هـزری و شارستانی دەگەڵ ئەدەبی جیهانیدا، پاچڤەم کردووەو پێشکەش بە خوێنەرانی کوردی زمانی دەکەم،هیوادارم تینوێتیان بشکێنێت، دەنا ماڵی قەڵب سەری ساحێبی..دەیسا فەرموون ئێوەو رۆمانی شازادەو گەدا

٢٠١١/٣/٥ سلێمانی/ گەڕەکی رزگاری

تێبینـــــــــــــــی:

بۆ نووسین و ئامادەکردنی ئەم پێشەکییە سوود لەم سەرچاوانە وەرگیراوە:

*- فرهنگ ادبیات جهان/زهرای خانلری/چاپ اول:١٣٧٥

*- شاهزادەوگدا/مارك تواین/مترجم:محمد قاچی/چاپ چهاردهم:١٣٨٨

*- دلیل القارئ الی الادب العالمی/ترجمه محمد الجورا/دارالحقائق/گ ١٩٨٦/١

*- موسوعه ادباء امریکا/الدکتور نبیل راغب/الجزء الاول/دارالمعارف/١٩٧٩

((١))

## له دایكبوونی شازادەو گەدا

له كەونه شارەكەی لەندەن دا، له رۆژێكی پایزداو لـه چارەكی دووەمـی سـەدەی شـازدەیەمدا، لـه خێزانێكی هەژارا به نێوی كانتی كوڕێك هاته رووی دنیا كه باب‌و داكی پێیـان خـۆش نـەبوو. لـه هەمان رۆژا مندالێكی ئینگلیزی دیكه لـه خێزانێكـی دەولەمەنـد به نێـوی تـودور هاتـه دنیـاوه كـه بـاب‌و دایكـی پـڕ بـه دڵ پێیـان خـۆش بـوو. هـەموو میللـەتی ئینگلیسـتانیش لـه دایكبـوونی ئـەم مندالەیان پێخۆش بوو. له مێژ بوو هەموو میللەت چاوەڕوانی له دایكبـوونی ئـەویان دەكـرد‌و بـه دڵ خوازیاری له دایكبوونی ئەو بوون‌و له قاپی خودا دەپاڕانەوه، هێنده به تاسەوه چاوەڕوانیان دەكرد كاتێ كه مندالە به راستی له دایك بوو، لەزگ بوو هەمووان له خۆشـی‌و كـەیفان شـێت بـبن. خەڵكی، هەر به حاڵ یەكتریان ناسیبا، دەست له ملان سەرو رووی یەكتریان ماچ دەكـردو هـاواری شادی‌و خۆشیان دەكرد. هەر كەست دەبینی دەستی له كاری خۆی هەڵدەگرت، گـەورەو بچـووك، دەولەمەندو فەقیر جەژنیان دەگێڕاو دەڕەقسین‌و دەسـترین‌و سـەریان دەكـردە خواردنـەوەی بـادەی نایاب‌و گەرم‌و ئەم جەژن‌و ئاهەنگه چـەندین رۆژو شـەو درێـژەی كێشـا. شـاری لەنـدەن بـه رۆژەوه یەكپارچه بەیداخ‌و ئالای جوان بوو كه لەسەر بان‌و بەر هەیوانی مالەكانەوه دەشەكایەوەو خەڵكی دەسته دەسته، به شەقامەكاندا رێیان دەكردو ئەم دیاردانه دیمەنێكی جوان‌و عەنتیكەیان به شار دابـوو. لـه شـەویش دا دیمـەنی ئاتەشـبازی بەشـكۆو كـۆڕو مەجلیسـی خـەڵكانی خۆشـگوزەران‌و ئـەهلی كـەیف‌و سـەفایان، كـه لـه هـەر سوچـێكا ئاهـەنگی خۆشـی‌و شـادیان بـەرپا كردبـوو، دیمەنێكیان به شار بەخشی بوو هەر زینەت بـوو تەمەشـای بكـەی. لـه سەرانسـەری ئینگلیسـتاندا باس هەر باسی ئەم نەوزایه واته ئیدوارد تودوری شازادەی ویلز بوو، له كاتێكا مندالە، بۆ خـۆی

لە نێو قومات و جێگای حەریرو ئەتلەسدا پاڵ کەوتبوو و شیری دەخواردو لە هەموو ئەم هەراو هەنگامەو جەژن و ئاهەنگە بێ ئاگا بوو و گوێی بە نەجیبانی دەرەجە یەکی دەرباری و ئەو خانمە بەڕێزو سەلارانەی کە سەرپەرشتیان دەکرد نەدەدا. بەلام سەبارەت بە نەوزاکەی تر، واتا سەبارەت بە توم کانتی کە لە نێو چنگێ پەڕۆ شڕی کۆنەدا کەوتبوو، جگە لە داك و بابە هەژارەکەی خۆی کە زۆر بە لە دایکبوونی قەڵس و نیگەران بوون، چ کەسێکی دی هەر باسیشی نەدەکرد.

((٢))

## قۆناغی هەوەڵینی ژیانی تۆم

**چەند ساڵێك بوری.**

لەندەن شارێك بوو پتر لە هەزارو پێنج سەد ساڵ بەسەر دامەزراندیا تێدەپەڕی و لەو رۆژگارەدا بە یەکێك لە وڵاتە گەورەو بە ئیحتوبارەکان دەژمێردرا. ژمارەی دانیشتوانی ئەم شارە سەد هەزار کەس بوو و هەندێك ژمارەی دانیشتوانەکەیان بە دوو ئەوەندە دەخەملاند. کوچەو کوڵان و شەقامەکانی بە تایبەتی لە گەڕەکەکانی دەوروبەری پردی لەندەن کە تۆم کانتی لەوێندەر ئاکنجی بوو، هەموو تەنگ و تاریك و پیس بوو. خانوو و بیناکان هەموو لە دارو تەختەو قاتی دووەمیان لە یەکەم پانتر بوو، تا خانووەکان بەرزتر بوایەن بە هەمان ئەندازە، واتە قات دوای قات پانتر دەبوون. لە دروستکردنی ئەم خانووانەدا، کۆڵەکەی مکوم و ئەستووریان لە شێوەی چەلیپادا دەچەقاندو ئەوجا بە کەرەستەی بیناسازی مکوم بەینەکانیان هەڵدەچنی و بە گەچ پڕیان دەکردەوە. کۆڵەگەو ئەستونەکانیان بە گوێرەی زەوق و سەلیقەی خاوەن ماڵەکە، بە رەنگێن سورو شین و رەش دەڕەنگان..، و ئەم نەخش و نیگارو رەنگکاریە دیمەنێکی جوانی بە روکارو رواڵەتی بیناکان دەدا. پەنجەرەکان هەموو بچووك بوون، و شووشە لاتەریبەکانیان، وەکو دەرگا، لەسەر ئەم پاژنە دەکرانەوە. ئەو خانووەی کە بابی تۆم تیایدا دەژیا، کەوتبووە کۆتایی کوێرە کوڵانی کەلاوەیەکەوە پێیان دەگوت ئوفال کورت (Offal Court)و کەوتبووە دەرێی دەروازەی پودینگ لین. خانووەکە بچووك و وێران بوو، لێ کۆمەڵێکی زۆر لە خێزانانی هەژارو بێنەوای شار لەوێندەر دەژیان. ماڵی تۆم کانتی، لە ژوورێکی قاتی سێیەمدا بوون. باوك و دایکی لە سوچێکی ئەو ژوورەدا شتێکی تەختە خەو ئاسایان هەبوو، لێ تۆم و نەنکی و دوو خوشکەکەی، بت و نەن تەختە خەوی تایبەتیان نەبوو و لە عاردی دەخەوتن، هەر کاتێ بیانویستبا دەیانتوانی بخەون. شتێك لە پاشماوەی کۆنە پە تۆیەکی چڵکن و چەند کۆنە حەسیرێکی شڕ لەو ژوورەدا هەبوو کە هەر بەناو پێخەف و نوێنی پێ دەگوتراو ئەندامانی خێزانەکە، بە رۆژەوە لولیان دەکردو لە سوچێکیان دادەناو بە شەویش پێی دەخەوتن.

بت و نەن دوو کیژی جمکانەی پانزە ساڵان بوون، هەردووکیان زۆر دلۆڤان و میهرەبان بوون،لێ چەپەڵ وشڕپۆش ولە رادە بەدەر جاهیل و نەزان بوون. دایکیشیان کوت و مت وەکو خۆیان بوو، لێ باب و نەنکیان دوو بوونەوەری نەگریس و شەڕاشۆ بوون، هەرکە دەرفەتیان بۆ هەڵکەوتبا

دەستیان بەمەی نۆشی دەکردو پاشان بەردەبوونە گیانی یەکتر، یان بەو کەسانەدا هەڵدەشاخین کە لە ڕێگەدا تووشیان دەبوون. ئەو جووتە چەپەڵە، دایمە یا مەست بوون یان برسی. چونکە کانتی دز بوو و دایکی سواڵکەرو گەدا، توانی بوویان مناڵەکانیش بکەن بە سواڵکەرو گەدا، بەڵام نەیانتوانی بوو بیانکەن بە دز. پیرەمێردێکی نەجیبو ڕۆحانی لە نێو دانیشتوانی دزی ترسناکی ئەو خانووەدا دەژیا کە هیچ شتێك دەگەڵ ئەوانی یەکنەدەخست، ئەمە پیاوێك بوو کە پاشای ئینگلتەرا لە کڵێساکەی خۆی دەری کردبوو، لێ مووچەیەکی کەمی بۆ بڕی بووەوە. ئەم کەشیشە چاکەکارە، کاتی خۆی بەوە بەسەر دەبرد کە مندالانی ئەو خانووەی لە گۆشەو کەنار دەگرتو ڕێورەسمو دابو نەریتی دروست و ئابڕومەندانەی ژیانی، بە نهێنی فێر دەکردن، بابا ئاندریو لەو ێگەیەوە، تۆمی فێری کەمێك زمانی لاتینو خوێندنو نووسین کردو دەیویست کچەکانیش فێر بکات، لێ کچەکان لە تانەو تەشەری دۆستانو هەڤسالانی خۆیان کە پێشکەوتن و گەشەسەندنی فیکریو روحیو دەرونی ئەوانیان پێ قووت نەدەچوو ترسانو دەرسیان نەخوێند.

سەرانسەری گەڕەکی ئۆفال کورت، وەکو ماڵەکەی کانتی، لە شارە هەنگ دەچوو. مەستیو بەدمەستیو قەرقەشەو شەڕ، بەرنامەی هەموو شەوێکی دانیشتوانی ئەو گەڕەکە بوو و زۆربەی هەرە زۆری شەوەکان تا بەرەبەیان بەردەوام بوو. چەند کەسی برسیو خەڵکی برسی تیا بوو، ئەوەندەش خەڵکی سەرو دەست شکاوی تیا بوو. بەم حاڵەشەوە تۆمی چکۆلە بوونەوەرێکی بەدبەختو نەگبەت نەبوو، هەر چەندە ژیانی وی بە دژواریو زەحمەت دەگوزەرا، بەڵام خۆی ئاگای لێ نەبوو. ژیانی ئەویش، کوتو مت میناکی هەموو ئەو مندالانەی دی بوو کە لە گەڕەکی (ئۆفال کورت)دا دەژیان، بۆیە تۆم وای دەزانی کە ڕەوتو ڕێبازی پێویستو دروستی ژیان هەر ئەوەیەو تەواو. تۆم دەیزانی کە هەر کاتێ شەوان بە دەستی بە تاڵ بۆ ماڵ بزڤڕێتەوە، هەوەڵجار بابی بەر جنێوانو قسەی ساردو سڕی دەداتو دارکاری دەکاتو پاشان نەنکە ترسناکەکەشی دەکەوێتە گیانیو داخی دڵی خۆی بەسەر ئەودا دەڕێژێ. هەروەها دەیزانی کە دایکە داماوەکەی سەرباری برسیەتی خۆی پاروی دەمی خۆی دەگرێتەوەو لەتە نانێك بۆ ئەو هەڵدەگرێتو کە پاژێکی شەو تێ پەڕێت، بەرەو سەر جێگاکەی ئەو دەخزێو ئەو لەتە نانەی وێدەدات. هەر چەندە زۆر جار لە سۆنگەی ئەو دلۆڤانیو دڵسۆزییەوە، لەلایەن مێردەکەیەوە غافڵگیر کراوەو لەبەر خاتری کوڕەکەی کوتەکی خواردووە.

بە هەرحاڵ ژیانی تۆم تا رادەیەك باش دەبوری، بە تایبەتی لە وەرزی هاویندا کە لە هەر وەرزێکی دی باشتر بوو. تۆم هەر ئەوەندە گەدایی دەکرد کە لە برساندا نەمرێ، چونکە یاساو ڕێسای توند دژی گەداییو سواڵ هەبوو و سەرپێچی کاران سزای قورس دەدران، بۆیە بەشی هەرە زۆری کاتی خۆی بۆ گوێگرتن لە چیرۆکە شیرینو ئەفسانە کۆنو خۆشەکانی بابا ئاندریو تەرخان دەکرد کە لەو نەقڵو حیکایەتانەدا باسی جنو پەریو دێوو درنجو کۆشكو سەرای جادوییو پاشایانو شازادانی پۆشتەو پەرداخو بە شکۆو شانو شەوکەت دەکرا. مێشکی تۆم لەم چیرۆکە خۆشو سەیرانە پڕ دەبوو، شەوان کاتێ لە سایەی تاریکی ژوورەکەدا، لەسەر

حەسیرە شڕو زبرەکەی خۆی پاڵدەکەوت، هیلاك‌و شەکەت‌و برسی‌و ئازای لەشی لە تاو ئازاری دارو کوتەك هاواری دەکرد، لە پڕ جڵەوی خەیاڵاتی شیرینی خۆی بەردەداو دەردو مەینەتی خۆی ژبیر دەبردو بە ئارەزووی شیرین‌و خۆشی ژیانی شادو پڕشکۆی شازادان‌و زیافەتی نێو کۆشکێن بە شکۆی شاهان–ەوە خەوی لێدەکەوت. تۆم ئاواتێکی لە دڵدا بوو کە شەوو رۆژ بەرۆکی بەر نەدەدا، ئەویش ئەوە بوو کە بە چاوی خۆی شازادەیەکی راستەقینە ببینیّ. تۆم جارێك ئەم ئاوات‌و ئارەزووەی خۆی بۆ هاوڕێ‌و هەڤساڵەکانی خۆی کە خەڵکی ئۆفال کورت بوون باسکرد، لیّ هێندەیان گاڵتە پێکرد کە بەلەنگازە ناچار بوو دەمی دابخات‌و لەوە بە دواوە، ئەو خەونە زێڕینانە تەنیا بۆ خۆی بدینیّ.

تۆم زۆر جار کۆنە کتێبەکانی پیرە کەشیشی دەخوێندەوەو داوای لێدەکرد بۆی راڤەو شرۆڤە بکات‌و دەربارەی بابەتەکانیان گەنگەشەو موناقەشەی دەکرد. خەیالاتی شیرین‌و خوێندنەوە بەرە بەرە گۆڕانێکیان بەسەری هێنا. قارەمانانی خەیاڵی ئەو ئەوەندە زۆرو پۆشتەو پەرداخ‌و بەشان‌و شەوکەت بوون کە ئەم لە سەرو فەساڵی چڵکن‌و پڵکن‌و لە جلکە شڕوشەپڕێوەکانی خۆی بێزار بوو، و ئارەزووی ئەوەی کرد کە میناکی وان پاك‌و خاوێن‌و بۆشناخ بێت. بەلاّم هەر درێژەی بە گەمەو وازی نێو قوڕو چڵپاوانیش دەداو لەزەتی لەوەش دەبینی، بەلاّم لە جیاتی ئەوەی تەنیا لە پێناوی گەمەداو بۆ سەرگەرمی لە روباری تایمزدا مەلە بکات، بەرەبەرە قەدرو بابەخێکی تازەی ئاوی روبارەکەی بۆ دەرکەوت، ئەویش ئەوە بوو کە خۆی پیّ بشوات‌و سەروو رووی پیّ خاوێن بکاتەوە.

تۆم هەمیشە لە دەوروبەری میپول، لە جیپ سایدو لە ناو بازاڕدا، سەرگەرمی‌و مەشغەڵەتی بۆ خۆی دەدۆزییەوەو جار ناجاریّ ئەوو گشت دانیشتوانی لەندەن، ئەو شانسەیان بۆ هەڵدەکەوت کە گروپێك لە سوپاییان بدینن، یانی لەو کاتانەدا کە یەکێك لە گەورە پیاوانی بەخت سوتیاگ لە رێگای زەمینییەوە یان بە بەلەم‌و قەیاخ لە رێگەی روبارەوە بۆ زندانی بورجی لەندەن دەگوازرایەوە، تەماشای مەسیرەی سەربازان بکەن، تۆم لە یەکێك لە رۆژەکانی هاویندا ئەو ئاسکیوییە داماوەی بینی کە دەگەڵ سیّ پیاودا لە مەیدانی سمیتفیلدا بە زندوویەتی خستیانە ئاگرەوەو گوێی لە وەعزی یەکێك لە ئەسقوفەکانی جارانیش بوو کە دوعای لەسەر دەیخوێندن، بەلاّم گوێی بە قسەکانی کابرای کەشیش نەداو هیچ حیسابێکی بۆ نەکردن. بەڵیّ ژیانی تۆم بە شێوەیەکی گشتی خۆش‌و هەمە جۆر بوو.

تۆم بەرە بەرە لە ژێر کاریگەری ئەو کتێبانەی کە دەیخوێندنەوەو لە ژێر کاریگەریی ئەو خەیاڵاتە سەیرانەی کە دەربارەی ژیانی شازادان دەیکرد، وای لێهات بیّ ئەوەی پیّ بحەسێت، کەوتە ئەوەی لاسایی رەفتاری شازادان بکاتەوە. بەرەبەرە گوتارو کرداری شەقڵی دەرباری‌و تەشریفاتی لەخۆ گرت‌و دۆست‌و ئاشنا نزیکەکانی بە رێزو حورمەت‌و سەرسامی تەمەشایان دەکرد. بەلاّم رۆژ بە رۆژ سەنگ‌و دەسەلاّت‌و کەسایەتی تۆم لە نێو هاوساڵەکانی خۆیدا زیادی کرد،و زۆری نەخایاند کە هەمووان بە رێزو حورمەتەوە نیگایان دەکردو بە کەسێکی بالاّو گەورەیان دەزانی. وایان دەهاتە بەرچاو کە تۆم زۆر شت دەزانیّ‌و دەتوانیّ زۆر شت بڵیّ‌و لە عۆیەی ئەنجامدانی

کارێن سەیرو عەجایەب دێت. بە راستیش تۆم کوڕێکی زرینگو بە ئاوەز بوو. منداڵان قسە خۆشەکانیو رەفتارو هەڵسو کەوتە سەیرەکانیان بۆ داكو بابی خۆ دەگێڕایەوە، وای لێهات ئەوانیش دەگەڵ تۆمدا کەوتنە قسەو گفتوگۆو بە چاوی بوونەوەرێکی ناوازەو شایستەو بەهرەداریان تەمەشا دەکرد. گەورە ساڵان، کێشەو گرفتاری ژیانی خۆیان بۆ باس دەکردو داوای چارەسەریان لێدەکردو زۆر جار سەریان لە تەگبیرو ئەقڵو ئاوەزو قسەزانی ئەو سوڕ دەما. ئەوی راستی بێ تۆم تەنیا لای ماڵباتەکەی خۆیان نەبێ، ئیدی لای هەموو ئەوانەی کە دەیانناسی بوو بە قارەمانێك، بەڵام دایكو بابی هیچ شتێکیان لە تۆم دا نەدەبینی.

زۆری نەبرد کە تۆم دامو دەزگایەکی بۆ خۆی دامەزراندو دەربارێکی کردەوە! پاشای ئەو دەربارە خودی خۆی بوو. برادەرو دۆستە گیانی بە گیانیو نزیکەکانی بوون بە پاسەوانو دەستو پێوەندو هاودەمو ئەشرافانی دەست بە سینگو ژنانو خانەوادەی پاشایەتی دەربار. هەموو رۆژێ بەیانی بە هەمان تەشریفاتو ئەتەکێتی کە لە کتێبانی ئەفسانەیی دا خوێندبوویەوە پێشوازی لە شازادە دەکرا. هەموو رۆژێ بەیانی، کاروباری گرینگی دەوڵەتە گاڵتینەکەی تۆم لە ئەنجوومەنی پاشایەتیدا دەخرایە بەر باسو موناقەشەو هەموو رۆژێ ئەو خاوەنشکۆیە دەستوورو فەرمانانی بۆ سوپای خەیاڵیو هێزی دەریاییو بۆ فەرماندارانو ستاندارانی خەیاڵی خۆی دەردەکرد.

دوای ئەوە بە هەمان جلکی شڕو شەپڕێوی خۆیەوە، دووی کاری خۆی دەکەوتو چەند دینارێکی سواڵ دەکردو کولێرە وشکەکەی خۆی دەخواردو کوتەکی رۆژانەی خۆی لە ماڵەوە نۆشی گیان دەکردو هەنگێ لەسەر پارچە حەسیرەکەی خۆی رادەکشاو بە دەم خەیاڵاتی خۆشی شەوەوە بەناو پایەو شکۆ خەیاڵییەکانی خۆی دەکەوت.

ئارەزوو ئاواتی دیتنی شازادەیەکی راستەقینە، ئەگەر بۆ تاقە جارێکیش بووە، رۆژ بە رۆژو هەفتە بە هەفتە لە ناخو نیهادیدا توندترو زیاتر دەبوو، بەڕادەیەك کە بەسەر هەر هەموو حەزو ئارەزووەکانی دیکەیدا زاڵ بوو، و بوو بە تاقە ئاواتی تایبەتی ژیانی.

لە رۆژێکی مانگی یەك دا لە کاتێکدا کە تۆم کانتی مژولی کاری رۆژانە خۆی، واتە گەدایی بوو، چەندین سەعات لە دەوروبەری (مینسینگ لینو لیتل ئیست چیپ)دا بەپێی خاوسو بەدەنی رچیوەوە سەرو خواری کردو لە پشت جامی پەنجەرەی دوکانانی خۆراکفرۆشییەوە، بە عەزرەتەوە روانییە خۆراکێن بەلەزەتی گۆشتی بەرازو هەموو خواردنە خۆشەکانی دیکەی کە لەوێندەر نمایش کرا بوو. وای هات بە خەیاڵدا کە ئەم خواردنانە شایستەی سفرەی فریشتانەو تەنیا لە رێگەی بۆنو بەرامەی خۆشی ئەو خواردنانەوە ئەو هەستەی دەکرد، چونکە بە خۆی هێشتا ئەو شادییەی پێ نەبڕا بوو کە دەستی بگاتە یەکێك لەو خواردنانە، یان تامی بکاتو بیخوات.

دنیا سارد بوو، باران نم نم دەباری. جەوەکەی یەجگار خەمناكو تاقەتبەر، و دنیا زۆر تاریكو نوتەك بوو. تۆم کانتی شەوێ بۆ ماڵ زڤڕییەوە، هێندە تەڕو شەکەتو برسی بوو کە بابیو ئەنکیشی نەیانتوانی بەزەییان بە حاڵی زاری ئەودا نەیەتەوەو بە حیسابی خۆیان دڵیان بە حاڵی

نەسوتێت. وێڕای ئەوەش ئاقیبەت، هەندێکیان لێداو ئەمریان پێکرد کە بڕوات بنوێ. تۆم ماوەیەکی زۆر بە دەم ئازارو برسێتی خۆیەوە تلایەوەو لەبەر دەنگە دەنگ و هەراو هەنگامەو قەرقەشەی باوی هەمە رۆژەی ناو ئەو خانووە خەوی لێنەکەوت، بەڵام خەون و خەیاڵاتی خۆش سەرەنجام تۆمیان بۆ وڵاتانی خەیاڵی و ئەفسانەیی بردو ئەو بەلەنگازە دەگەڵ شازادانی جەواهێر پۆش و زێڕ بە شاندا کە لە کۆشك و سەرایانی گەورەو بەشکۆدا دەژیان و نۆکەرو خولامان لە خزمەتیاندا کڕنۆشیان دەبردو حازرو ئامادەی جێبەجێکردنی فەرمانیان بوون، خەوی لێکەوت. پاشان وەکو عادەتی هەمیشەیی خۆی خەوی بینی و لە خەویا ئەویش یەکێك بوو لەو شازادانە.

پایەو شکۆو شان و شەوکەتی پاشایەتی تۆم بە درێژایی شەوەکە بەردەوام بوو. کە بە نێوی نەجیبانی دەرەجە یەك و خانمانی خشکۆك و جواندا رێی دەکردو بۆنی عەترێن دڵگیرو خۆشی دەکردو بەپێی ئاهەنگ و ریتمی ئاوازی موسیقای دڵنەواز، بادەو شەرابی دەخواردەوەو دەرباریان بەڕێزو حورمەتەوە سڵاویان بۆ دەکردو بە شکۆوە رێگەیان بۆ دەکردەوە هەندێ جار بە زەردە خەنەیەك و هەندێجار بە لەقاندنی سەر وەڵامی دەدانەوە.

کە بەیانی لە خەو رابوو و روانیە ژینگە هەژارانەکەی خۆی، و دەگەڵ ئەو خەونە خۆشەدا بەراوردی کرد، هەزار هێندەی جاران هەستی بە نەگبەتی و بێنەوایی ژینگەکەی خۆی کرد. هەنگێ خەم و پەژارەیەکی قورس نیشتە سەر روحی و دڵی شکاو رونك لە هەر دوو چاوانی قەتیس ما.

((٣))

## دیداری تۆم دەگەڵ شازادەدا

تۆم بە برسیەتی لە خەو ڕابوو، و بە برسێتی لە ماڵ وەدەرکەوت، لێ هێشتا بیری بە خەونە شیرین و زێڕینەکانی شەوەوە مژول بوو. وێڵ و سەرگەردان بە شاردا دەسوڕایەوە بێئەوەی بزانێ کێوە دەچێت و چ شتێك لە دەوروبەریا دەگوزەرێ. خەڵکی شانیان لێدەداو هەندێکیش قسەی زبرو ناهەنجاریان پێدەگوت، لێ هەموو ئەو شتانە لە جەم ئەو منداڵە ژیرە پەشم بوو. زۆری نەبرد کە تۆم خۆی لە (تمپل بار)دا بینییەوە، ئەمە دوورترین شوێن بوو کە لەو قوڵەوە بۆی چوو بوو. تۆم وەستا، مدەتێك ئەبڵەق و حەپەساو ڕوانییە هەر چوارنکالی خۆی. جارێکی دی رادەستی خۆشخەیاڵیەکانی خۆی بوو و لە دیوارەکانی شاری لەندەن ئاودیوو بوو. لەو رۆژگارەدا ئیدی (ستراند– Strand) کوێرە رێیەك نەبوو کە لە گوندەوە بۆ شار بێت، بەڵکو بۆ خۆی بە یەکێك لە شەقامەکانی شار دەژمێردرا کە کۆمەڵێك بیناو خانووی پەرتەوازە بەم بەرو بەو بەرییەوە هەبوون، یانی هەر چەند لە بەرێکی دا چەندین خانوو بە ریز هەبوون کە بە کەڵکی دانیشتن دەهاتن، بەڵام لە بەرەکەی تریدا، تاك و تەرا کۆشك و تەلاری بەرزو گەورە بەرچاو دەکەوتن کە کۆشکی ئەشرافێن دەوڵەمەندی شار بوون و هەر یەکەیان حەوشێکی گەورەو باخچەیەکی خۆشی هەبوو کە دەچووەوە سەر رەخی روبار. ئەو زەویانە ئێستا بە شێوەیەکی ناشیرین بە بەردو خشت ئابڵوقە دراوەو داخراوە.

تۆم خۆی لە گوندی (چرینگ)دا بینییەوە، لە ژێر چەلیپایەکی (سەڵیب، خاچ) جواندا کە یەکێك لە پاشا ناکامەکانی رۆژگارانی کۆن لەوێی دروستکردبوو، دانیشتو پشوویەکی دا، ئەوسا بە رێگەیەکی چۆڵو جواندا داگەڕاو بە تەنیشت کۆشکە بە شکۆکەی کاردینالٚ دا تێپەڕیو بەرەو کۆشکێکی جوانو فاخیر کە ویستمنیستەری ناوە داگەڕا. ماتو حەیران دەستی بە نۆڕینی کۆمای تەلارێن بەشکۆو کۆشكو سەراێن گەورەو قوللەو قەلاتێن ترسئەنگێز،وتاق ودەروازەێن بەردین و شکۆداری کۆشکی ناڤبری کە بەمحەجەرەی زێڕینو پەیکەرێن بە هەیبەتو شکۆداری شێرانی لە بەردی گرانیت دروستکراوو هەروەها رەمزو نیشانەکانی دیکەی ئیمپراتۆریەتی ئینگلیستان رازێنرا بووەوە. ئایا ئەمە ئاواتەکەی تۆم بوو کە خەریك بوو دەهاتە دی؟ بیٚ هیچ گومانو چەندو چوونێك ئەویٚ کۆشکی پاشایەك بوو. ئایا تۆم هەقی نەبوو کە ئێستا بە هێڤی دیتنی شازادەیەکی راستەقینە بێت؟ ئاه ئەگەر خودا ئەوەی کردبا چ دەبوو؟

لە هەر لایەکی ئەو تاقو دەروازە زێڕینەدا، پەیکەرێکی زندوو وەستا بوو وەك دەڵێن سەراپا لە ئاسنو پۆلادا نقوم بوون، لە تەپڵی سەرەوە تا بنی پیٚ لەو بەرگی جەنگەدا دەدرەوشایەوە. لە مەودایەکی تاڕادەیەك دوورەوە، چەند دێهاتیو شارییەك وەستا بوونو چاوەڕوانیان دەکرد تا بەڵکو یەکێك لە ئەندامانی خانەدانو بنەماڵەی پاشایەتی بدینن. فایتوونو گالیسکەێن یەکجار جوان کە پیاوانی گەورەو بە رێز سواریان بوو بوونو نۆکەرو فەڕاشان بە جلکی فاخیرو جوانەوە بە گەڵیان کەوتبوون، بەردەوام لە دەرگاکانی دیکەی حەساری کۆشکەکەوە دەهاتنو دەچوون.

تۆمی چکۆلەی بەلەنگاز بە جلکە شڕو شەپڕێوەکانی خۆیەوە چووە پێشترەوەو بە ترسو لەرزەوە بەلای پاسەوانەکەدا رەتبوو و بە دەم دڵەخۆرپەو ئومێدەوارییەوە، لەنکاودا، لە پشت محەجەرە زێڕینەکانی دەروازەکەوە چاوی بە دیمەنێك کەوت کە لەزگ بوو لە خۆشیان هاوار بکات. لەو دیو محەجەرەکەوە، کوڕیژگەیەکی جوانکیلەی گەنم رەنگی بەژنو بالاٚ رێكو پێکی بینی کە لە هەوای ئازادا یاریو پیاسەی دەکرد، جلەکانی سەراپا حەریرو ئەتڵەسی نایاب بوو کە لە زێڕو زێوەرو جەواهیراتدا دەدرەوشایەوە. شمشێرێکی بچووکی جەواهێرنیشانی بە قەدیا کردبوو، نیوپووتێکی جوانی پاژنە سووری لە پێدابوو،و کلاوێکی ئەرخەوانی لەسەر نابوو کە چەند پەڕێکی جوانو جەواهێرێکی درشتی گرانبەهای بە سەرەوە چەسپا بوو. چەند کەسێکی گەورە لە دەوری وەستا بوون کە بێگومان خولاٚمو نۆکەرانی ئەو بوون. خویا بوو کە ئەو منداڵە شازادەیەو شازادەیەکی واقیعیو راستەقینەیە، هیچ گومانو چەندو چوونێکی هەڵنە دەگرت. دیار بوو کە ئاقیبەت دوعای تۆمی دڵشکاو گیرا بووە.

تۆم بە جۆریٚ شپرزەو شڵەژا بوو کە هەناسەبڕکیٚو دڵەکوتەی پێکەوتو لەسەرسامیو حیرەتدا چاوانی ئەبڵەق بوون. لە پڕێکا هەر هەموو ئاواتو ئارەزوویەکی هاتە سەر ئەوەی کە خۆزیا دەیتوانی زیاتر لە شازادە نزیك بێتەوەو تێر بە چاوانی خۆی تەمەشای بکات.

تۆم بیٚ ئەوەی بزانێت چی دەکاتو پێش ئەوەی ئاگای لە دەوروبەری خۆی بێت، سەروچاوی بە محەجەرە زێڕینەکانی دەروازەکەوە نابوو. دوای تۆزێك یەکێك لە پاسەوانەکان هاتە پێشیٚو بە

توندی دەستی گرتو بۆ ناو ئاپۆرا لاپرەسەنو کونجکاوەکەی کە لە دێهاتیانی ناهەنجارو ناقۆڵاو شارییانی بێعارو لاسار پێك هاتبوو، دەڵەکی داو گوتی:
"ئەی سواڵکەر بەچەی لاسار، ئاگات لە رەفتاری خۆ بێت."
خەڵکەکە بە تەوسەوە پێی پێکەنین، لێ شازادەی بچووك بە هەشتاو بەرەو دەرگا گەورەکەو بە سەرو سیمای سورهەڵگەڕاوو چاوانی لە تورەییدا گڕگرتوو هاتو لە پاسەوانەکەی خوڕیو گوتی:
"بە چ هەقێك ئەو رەفتارەت دەگەڵ ئەو بەلەنگازە بەدبەختەدا کرد؟ بەچ هەقێك کەسێکت ئازار دا کە یەکێکە لە داماوترین رەعیەتی بابی تاجداری من؟ دەرگا بکەوە با بێتە ژوورەوە".
خۆزیا لەوێ دەبوونو دەتانبینی کە چۆن ئەو خەڵکە قەلەمون سیفەتو ترسنۆکە هەر کە گوێیان لەم قسەیە بوو، کڵاوەکانیان لە سەر داگرت. بریا لەوێ دەبوونو گوێتان لێ دەبوو کە چ هەراو زەنایەك لە نێویانەوە هەستاو هەموو یەك دەنگ هاواریان کرد کە:
"بژی شازادەی ویلز."
سەربازان بە تەورزینەکانیانەوە ئیکلامیان کردو دەرگای کۆشکەکەیان کردەوە، و کە شازادەی مەملەکەتی هەژارییو بێنەوایی بە هەمان جلکی شڕوشەپڕێوو چڵکنو پڵکنەوە وەژوورکەوتو دەستی بۆ شازادەی دیاری عیزەتو نازو نیعمەت بردە پێشێ، جارێکی دی ئیکلامیان کێشا. ئیدوارد تودور گوتی:
"تۆ شەکەتو برسی دێیتە بەرچاو، وادیارە بەدرەفتاریان دەگەڵ کردوویت. دەگەڵ من وەرە!"
شەش گاردی تایبەت، خۆیان خستە بەینیانەوە –هەڵبەتە من نازانم بۆ– دیارە دەیانویست پێش لەم رەفتارەی شازادە بگرن، بەڵام بە یەك ئامارەی شاهانەو ئامیرانەی جێنشینی چکۆلە، هەموو میناکی پەیکەر لەجێی خۆ ڕەق راوەستان. ئیدوارد، تۆمی بۆ تەهۆڵێکی جوانی نێو کۆشكو سەراکە کە شوێنی کاری خۆی بوو، برد. بە فەرمانی ئەو خواردنێکیان بۆ تۆم هێنا کە ئەو بەلەنگازە تەنیا لە کتێباندا وەسفی خوێندبووەوە. شازادە بە لوتفی سروشتی شاهانەو بە زەبری ئاوەزدارییو زیرەکی خۆی، گاردەکانی خۆی ناردنە دەرێ تا میوانە بەستەزمانە هەژارەکەی لەبەر چاوی ئەوان لە روو دانەمێنێ. ئەوسا بەخۆی لەلای ئەوەوە دانیشت. وەختێ کە تۆم مژوڵی خواردن بوو، بەمجۆرە دەگەڵیا کەوتە گفتوگۆ:
"ئێ، ناوت چیە؟"
"تۆم کانتی، قوربان. تۆ ئەم ناوەت پێخۆشە؟"
"ناوێکی سەیرە، باشە. ماڵتان لە کوێیە؟"
"لە شارە قوربان، لە گەڕەکی ئۆفال کورت، لە دەرێی دەروازەی پودینگ لین."ە
"ئوفاڵ کورت؟ ئەمەش ناوێکی سەیرە، ئەدی کەسوکارت هەیە؟"
"بەڵێ قوربان، دایكو باوکم هەن. داپیرەیەکیشم هەیە کە ئەوەندە حەزم لە چارەی نیە، و ئەگەر قسەیەکی خراپم کردووە خوا بمبەخشێت. هەروەها دوو خوشکی جمکانەم هەن بەنێوی نەنو بت."

"وا هەستدەکەم کە داپیرەت زۆر لەگەڵتا باش نەبێت، وانیە؟"

"نەك هەر دەگەڵ مندا بەڵکو لەگەڵ کەسدا باش نیە. دوور لە رووی تۆ دڵێکی بەردینی هەیەو شەوو رۆژ هەر خەریکی مەردم ئازارییە."

"تۆش ئازارو ئەزیەت دەدا؟"

"بەڵێ قوربان، مەگەر لە خەوا بیّ و دەستی کار نەکات، یان مەستی مەست بیّ. لێ هەرکە بێدار ببێتەوەو وەهۆش بێتەوە حەسیرمەیدانێکی باشم دەکات."

نیگای شازادە تورە بووو هاواری کرد:

"چۆن! یانی دارکاریت دەکات؟"

"بەڵێ قوربان، دارکاریم دەکات."

"وای! کوتەكو دارکاریو تۆی منداڵی لاوازی بچووك کوجا مەرحەبا؟" زۆر چاکە. هەر ئەمڕۆکە دەگەڵ زەردەپەڕی ئێواریّ دا لە بورجی لەندەندا حەپس دەکرێت.خاوەن شکۆی بابی من..."

"قوربان، وا دیارە تۆ کەسایەتی ئەوت فەرامۆش فەرمووە، ئەو کەسایەتیەکی روتەی کمە، بورجی لەندەن چەسپخانەو زندانی گەورە پیاوانو نەجیمزادانی میللەتە."

"راستە، راستە، من ئەم شتەم لەبیر نەبوو. بە هەرحاڵ بیر لە تەمبیّ کردنی دەکەمەوە. ئیّ، باشە بابت لەگەڵتا میهرەبانە؟"

"نەخێر قوربان، ئەویش لە داپیرەم باشتر نیە."

"باوکان هەموو هەروان، بابی من تەنانەت سەبرو حەوسەڵەی بوکەڵەشی نیە. کە دەست بکاتەوە، دەستی زۆر قورسە. لێ هیچ کاتێك لێم نادات، بەڵام چی بیّ لە تۆ نهێنی هەندیّ جار بە قسەی ناخۆش ئازارم دەدات. ئیّ، ئەدی دایکت لەگەڵتا چۆنە؟"

"دایکم باشە قوربان، بە هیچ جۆریّ ئەزیەتو ئازارم ناداتو خەفەتم ناداتیّ. (نەنو بت)ش لەم رووەوە وەکو دایکم وان."

"خوشکەکانت چەند ساڵانن؟"

"عەرزی باسەعادەتی تۆی بکەم، پانزە ساڵ".

"خوشکەکەی من، شادۆت ئەلیزابت چواردە ساڵانە، دۆتمامەکەشم، شادۆت جان گری بەزای منەو کیژێکی زۆر جوانو بەژن زراڤە، لیّ سیمای خوشکەکەی ترم شادۆت (مری) تورەو خەمینەو... باشە خوشکەکانی تۆش بەو بیانووەی کە پێکەنین روحیان دەلەوتێنیّ، ریّ لە پێکەنینی کارەکەرەکانیان دەگرن؟"

"خوشکی منو کارەکەر؟ تۆ پێت وایە کە خوشکی من کارەکەریان هەبیّ؟"

شازادەی چکۆلە تاوێك لە سیمای کوڕیژگەی هەژار ڕاماو هەنگیّ گوتی:

"هەڵبەتە، ئەدی بۆ نەیان بێت؟ ئەدی شەوان کیّ جلەکانیان بۆ دادەکەنیّو بەیانیان کە لەخەو هەستان، کیّ جلکیان لەبەر دەکات؟"

"هیچ کەس قوربان، چما تۆ گەرەکتە کە ئەوان کراسەکانیان لەبەر دابکەنو وەکو حەیوانات بخەون؟"

"کراس! بۆچی سەرو یەك کراسیان هەیە؟"

"جا قوربان، لە کراسێك زیاتر بۆ چییە؟ خۆ یەکی دوو بەدەنیان نیە."

"بەڕاستی قسەیەکی سەیرە!... لێ من مەبەستم شۆخیو سوعبەت نەبوو. خوشکانی میهرەبانی تۆ، بتو نەن بەم زووانە دەبن بە خاوەنی جلو بەرگو کارەکەرو خەزنەدارەکەی من ئەم کارەیان بۆ جێبەجێ دەکات. هیچ پێویستیش ناکات تۆ سوپاسی من بکەیت، چونکە شتەکە گرینگ نیە، بەڵام تۆ زۆر باش قسان دەکەیتو خۆش گفتو لفتی، ئایا خوێنەواریت هەیە؟"

"قوربان من خۆم نازانم خوێندەواریم هەیە یان نا. کەشیشێکی دلۆڤان کە نێوی (بابا ئاندریو)یە، بە لوتفو دلۆڤانی خۆی، لەبەر کتێبەکانی خۆی دەرسی پێ دەگوتمەوە."

"زمانی لاتینی دەزانی؟"

"کەمۆکەیەکی لێ دەزانم."

"لاتینی فێربە. ئەم زمانە لە سەرەتاوە تۆزێك قورسە. زمانی یونانی قورسترە لە لاتینی، بەڵام پێموایە هیچ یەکێك لەم دوو زمانەو زمانانی دیکەی دنیا بۆ شادوت ئیلیزابتی خۆشکمو دۆتمامەکەم قورس بن. خۆزیا بە گوێی خۆت گوێت لێیان دەبوو کە چۆن بە لاتینیو یونانی قسان دەکەن! ئێ. ئێستا باسی گەڕەکی (ئۆفال کورت)ەکەی لەمەڕ خۆتم بۆ بکە. ئەوێندەرت پێخۆشە؟"

"بەڵێ قوربان، بێ تۆ ناخۆش، بە ڕاستی خراپ نیە، دەقەتێ، مەگەر کاتێ مرۆڤ برسی بێت. لەوێ نمایشێن شانۆییو بۆکەڵەبازیو مەیمون هەیە. بە ڕاستی کە ئەم مەیمونانە حەیواناتی سەیرنو چەند جوان جل لەبەر دەکەن! هەروەها لەوێ نمایشی دیکەش هەن کە لەو نمایشانەدا هاوار دەکەنو شەڕ دەکەن تا هەمووان یەکتر بکوژنو ئەلهەقی زۆر جواننو هەر حەز دەکەی تەمەشای بکەی، نرخی بلیت یەك درهەمە–بەڵام قوربان گیان، گیانم بە فیدات، پەیداکردنی ئەو درهەمە بۆ من یەجگار زەحمەتە."

"ئێ، بەردەوام بە."

"جا ئێمەی منداڵانی ئوفال کورت، هەندێ جاریش بە دارو گۆپاڵان بەر دەبینە گیانی یەكو میناکی منداڵە مەکتەبلیان کوتەککاری دەکەین."

چاوانی شازادە پرشنگیانداو گوتی:

"بەه بەه! من ئەم یاریانەم پێخۆشە. ئێ چیتر."

"پێشبڕکێی غاردانێ دەکەین تا بزانین کێ لە غاردانێ دا خێراترە."

"ئێ، حەز لەم گەمەیەش دەکەم. چیتر.."

"قوربان، لە هاوینا، لە نێو روبارو رۆخاناندا خۆ دەشۆینو مەلە دەکەینو هەر کەسە هەوڵدەدا هاوڕێکەی تەنیشت خۆی بخاتە ژێر ئاوەکەوە. هەموو مەلە دەکەینو لە بەرزیەوە خۆ هەڵدەدەینە ئاوەکەوەو دەیکەین بە هەراو هەنگامەیەك نەبێتەوە..."

"بەه بەه، خۆزیا سەرانسەری وڵاتەکەی بابم دەداو تاقە جارێك لەزەتی ئەم گەمانەم دەچەشت. ئێ، تکایە لەسەر قسەکەی خۆت بڕۆ."

"قوربان، له چیپ سایدو له دەوروبەری میپول هەڵدەپەڕین، دەرەقسین و گۆرانی و ستران دەڵێین، هەروەها له نێو خیزەڵاناندا یاری دەکەین و هەر کەسەو هاوڕێکەی تەنیشت خۆی دەخاتە ژێر زیخ و لمەوە. هەندێ جاریش بەگڵ و قوڕ، نان و کێك و کولیچە دروست دەکەین. بەڕاستی قوڕو گڵێکی ناسك و باشە، له نەرمی و ناسکی دا له سەرانسەری دنیادا وێنەی نیە! دوور له رووی تۆ، ئێمە به کەماڵی ئیسراحەت لەو گڵەدا دەکەوین و خۆ دەگەوزێنین."

"ئەڵلا! تکات لێدەکەم بەسە. چەند خۆشە! کاشکێ دەمتوانی جارێك جلەکانی تۆ لەبەر بکەم و تەنیا تاقە جارێك بەپێ خاوسی بە نێو قوڕو قوڕاوان بکەوم و خۆمی تیا بگەوزێنم، بە مەرجێ کەس شەرم پێ نەفرۆشێت و رێگەم پێنەگرێت، هەنگێ من ئامادە بووم تەخت و تاجەکەی خۆم بدەم."

"بریا، شازادەی ئازیز، منیش بۆ تاقە جارێك دەمتوانی خۆم بکەم بە تۆو جل و بەرگەکەی تۆ لەبەر بکەم!"

"چۆن؟ مەگەر تۆ حەزت لە جلەکانی منە؟ ئەگەر وایە هەر ئێستا جلەکانمان دەگۆڕینەوە. تۆ جلکە شڕو شەپڕێوەکانی خۆت داکەنەو ئەم جلکە جوان و فاخیرانەی من لەبەر بکە. ئەمە دەرفەتێکی کورتە، لێ لەبارو گونجاوەو خراپ نیە، خێراکەو بەر لەوەی کەسێك بێت بە سەرداو لێمان تێك بدات، دووبارە جلەکانمان دەگۆڕینەوە."

دوای تۆزێك شازادە چکۆلەکەی ویڵز جلکە شڕو شەپڕێوو پیسەکانی تۆمی لەبەر کردو شازادە چکۆلەکەی دیارو مەملەکەتی هەژاری و بێنەوایی-ش جلکە جوان و فاخیرەکانی جێنشینی لەبەر کرد. هەردووکیان شان بە شانی یەکدی رۆییشتن و لەبەردەم ئاوێنەیەکی گەورەدا وەستان. لێ عەجایەب کە چ موجیزات و پەرجویەك روویدا! لە تۆ وایە کە هیچ گۆڕان و گۆڕینێك رووی نەداوە. هەردووکیان روانیانە یەکترو پاشان تەمەشای ئاوێنەکەیان کردو هەردوو حەپەسان تا ئەنجام شازادە کە تەواو حەپەسا بوو گوتی:

"کوڕۆ، تۆ لە مبارەیەوە چ دەڵێی؟"

"قوربان، داوای وەڵامی ئەم پرسیارە لە من مەکە. چونکە منی روتە حەدی ئەوەم نیە لە حوزوری جەنابتدا هیچ بڵێم."

"باشە، کەواتە من رەئی خۆم دەڵێم. من پێموایە کە قژی سەرو رەنگی چاوو تۆنی دەنگ و تەرزی رەفتارو شێوەو قەدو باڵاو سیمای تۆ وەکو منە. ئەگەر ئێمە هەردووکمان خۆ رووت بکەینەوە هیچکەسێك نازانێ کە تۆ کامەیەت و جێنشینی ئینگلیستان کامەیە. ئێستا کە من جلەکانی تۆم لەبەرە، دەتوانم هەست بەوە بکەم کە کاتێ ئەو پاسەوانە هۆڤییە لێیدایت چ ئازارێکت چەشتووە.. ئاه!... ئادەی بزانم، مەگەر دەست بریندار بووە؟"

"بەڵێ قوربان، بەڵام هیچ نیەو جەنابت دەزانی کە ئەو پاسەوانە بەدبەختە..." شازادە بەپشم و غەزەبەوە پێی بە عاردیدا کوتاو گوتی:

"نا، بەسە! ئەم کارە زۆر نەنگ و زاڵمانە بوو. ئەگەر پاشا... بە هەرحاڵ تا من نەگەڕێمەوە، هەقی ئەوەت نیە یەك هەنگاو لێرە دوور بکەویتەوە. ئەمە ئەمرەو دەبێ بە گوێم بکەی!."

شازادە، خێرا پڕی دایە شتێك کە بایەخ و ئیحتوباری نەتەوەیی هەبوو، و لەسەر مێزەکە کەوتبوو، هەر هەڵی گرت و لە سووچێکیا شاردەوەو بە خۆی بە سیمای تووڕەو چاوانی گڕگرتووەوە لە دەرکە وەدەرکەوت و بەو جلە شڕو شەپڕێوانەوە لە حەساری کۆشکەکەدا کەوتە غاردان. زۆری نەبرد کە گەییە دەروازەی کۆشك و محەجەرە زێڕینەکانی گرت و ڕایتەکاند و هاواری کرد:

"هێی بۆرە پیاو، دەرکە بکەوە!"

ئەو سەربازەی کە لە تۆمی دابوو، یەکسەر بە گوێی کردو کە شازادە خەریك بوو لە بەینی دوو تاکی نیمچە کراوەی دەروازەکەوە بە هەمان فیزو دەعیەی شاهانەوە ڕەت دەبوو، زللەیەکی هێندە توندی لە بنا گوێی سرەواند کە هەڵیدایە ناوەندی جادەکەو گوتی:

"بگرە هەی سواڵکەربەچە، ئەمەش سزای ئەوەی کە بوویتە بایسی ئەوە خاوەنشکۆ بە گژما بێت!"

کۆمەڵێك بێکار کە لەوێندەر وەستا بوون، بە تەوسەوە لە قاقای پێکەنینان دا. شازادە خۆی بە نێو قوڕو سیانەکەی دەرێی دا بکێش کردو بە پشم و غەزەب بەرەو پاسەوانەکە ڕۆیی و هاواری بەسەردا کرد:

"من خودی شازادەی ویلز و جێنشینی ئینگلیستانم و بوونم پیرۆزەو تۆ بە تاوانی ئەوەی دەست لێکردوومەتەوە، لە سێدارە دەدرێی".

سەربازەکە، تەورزینەکەی خۆی بە ڕەسمی ئیکلام کێشان بەرز کردەوەو بە دەنگێکی تەڵفیزی ئامێزەوە گوتی:

"من لە حوزوری خاوەنشکۆی شکۆدارا، عەرزی تەعزیم دەکەم." ئەوسا بە پشم و غەزەبەوە هاواری بەسەر شازادەدا کردو گوتی:

"هەیدێ، لەبەر چاوم گوم بە، چەپەڵ."

لەم کاتەدا ئاپۆڕا بێکارەکەی کە لەوێندەر وەستا بوون، لە دەوری شازادە چکۆلی داماو خڕ بوونەوەو بە ڕاکێش ڕاکێش بۆ سەر شەقامەکەیان بردو بەدەم هەراو زەناو بۆڵە بۆڵەوە هاواریان بەسەردا کرد:

"ڕێی خاوەنشکۆ، جەنابی جێنشین بدەن! ڕێی شازادەی ویلز بدەن..."

((٤))

## دەستپێکی نامرادیەکانی شازادە

شازادەی چکۆلە پاش ئەوەی چەندین سەعات لەلایەن سەر سەری و چەقۆکێشانی شارەوە ئەزیەت و ئازاردرا، ئاخری لە شەڕی وان خەلەسی و بە تاقی تەنیا مایەوە. تا توانای بەرگری هەبوو بە ڕەفتارو گوتاری شاهانەی خۆی هەڕەشەی لێدەکردن، هەمووان پێیان رادەبواردو گاڵتەیان پێدەکردو پێی پێدەکەنین و ئەزیەت و ئازاریان دەدا. بەڵام کە ماندوویەتی بڕستی لێبڕی و ناچاری کرد بێدەنگ بێ، ئیدی بە کەڵکی شۆخی و رابواردنی ئەوان نەدەهات و ناچار

دەستبەرداری بوونو ئیدی بۆ کەیفو قەشمەریو رابواردنو سەرگەرمی خۆ روویان کردە شوێنێکی دیکە. هەنگێ شازادە روانیە چوار دەوری خۆی، لێ نەیتوانی ئەو گەرەکە بدۆزێتەوە، تەنیا ئەوەندەی دەزانی کە لە ناوەندی شاردایە. بێ ئەوەی هیچ مەزڵو ئامانجێکی دیاری هەبێ، کەوتە رێو زۆری پێنەچوو سەیری کرد ژمارەی بیناو خانوو، و ژمارەی رێبواران لە کەمی دا. شازادە پێیە خوێناوییەکانی لەو رووبارەدا کە لەو رۆژگارەدا بەو ئاقارەدا دەرۆییو ئێستا لە جیاتی روبار کرا بوو بە شەقامی فارینگدون ستریت. شۆرد. دوای ماوەیەك پشووی دا، پاشان درێژەی بە رێگەی خۆی دا تا گەییە مەیدانێکی گەورە کە چەند خانوویەکی پەرتەوازەو کڵێسایەکی گەورەی بە دەورەوە بوو. شازادە ئەو کڵێسایەی ناسییەوە. بە دەوری دیوارەکانیا، ئەسکەلەو داربەستی بەرزیان دانا بوو و کۆمەڵێك کرێکار کاریان تیا دەکرد، چونکە دەیانویست کڵێساکە بە تەواوەتی نۆژەن بکەنەوە. شازادە چونکە لە دەردو مەینەتی خەلەسی بوو کەمێك ورەی بەرز بووەوەو بە خۆی گوت:

"ئەمە هەمان کڵێسا کۆنەکەی گری فرایەزەرە کە خاوەنشکۆ، بابی تاجداری من لە دەستی کەشیشانی دەرهێناو بۆ نیشتەجێ بوونی مندالانی هەتیوو هەژاری تەرخان کردو ناوەکەی گۆڕیو کردی بە کڵێسای مەسیح. بێگومان ئامادەن خزمەتی مندالی کەسێك بکەن کە ئەو هەموو مەحەبەتو چاکەیەی دەگەڵ کردوون، بە تایبەتی کە ئەو منداڵە ئێستا یەکێکە وەکو ئەوان. یا وەکو ئەوانەی کە لێرە بە دواوە داخڵی ئەم خانەیە دەبن، هەژارو داماوو بێکەسە."

زۆری نەبرد کە شازادە خۆی لە نێو ئاپۆڕای کۆمەڵێك مندالی هەتیودا بینییەوە کە بە دووی یەکدا غاریان دەدا، یەکیان راو دەناو هەڵبەزو دابەزیان دەکردو تۆپێنیان دەکردو یەکە و گۆتەکە و حەمزەل و گەمەی تریان دەکردو هەموو شڕو دڕو شەیتانو ئاژاوەچی بوون. جلەکانیان هەموو وەکو یەك بوو کە لەو رۆژگارەدا نۆکەرانو قوتابیان لە بەریان دەکرد. هەر یەکەیان کلاوێکی رەشی سافیان بە سەرەوە بوو کە بە ئەندازەی ژێر پیاڵەیەکی گەورە دەبوو. بۆیە ئەم کلاوەو بەو ئەندازەو تایبەتمەندیە، نە کلاوێك بوو بە کەڵکی لەسەر کردن بێتو نە جوان بوو کە بە زینەت حەساو بکرێت. قژی سەریان کاری بوو، یانی بێ ئەوەی لە ناوەندەوە بەملاو بەولادا دابهێنرێ، بەسەر هەنیەو دەورانەوری سەردا بە یەك ئەندازە بڕابوو، هەر هەمووان بەوێنەی کەشیشان داوێکیان لە مل کردبوو. جلەکانیان جبەیەکی شینباوی تەنگ بوو کە تاسەر ئەژنۆو خوارتر دەهاتو قۆڵەکانی درێژ بوو. کەمەربەندێکی پانی سووریان بەسەرا بەستبوو. گۆرەوییەکانیان زەردێکی کاڵ بوو لە ئەژنۆیان چەسپ بوو بوو. پێڵاوەکانیان ئەستوورو قورس بوو و بە ئاوزونەی ئاسنەوە. بەشێوەیەکی گشتی جلو بەرگەکانیان تا رادەیەك ناشیرین بوو.

منداڵەکان دەستیان لە گەمە هەڵگرتو لە دەوری شازادە خڕ بوونەوەو ئەویش بە هەمان ئارامیو نەجیبی سروشتی خۆیەوە گوتی:

"مندالانی دلۆڤان، بە مامۆستاکەتان بڵێن کە ئیدواردی جێنشینی ئینگلیستان دەخوازێت قسە دەگەڵ تۆدا بکات."

ئەم قسەیە ژاوە ژاوێکی خستە نێو منداڵەکانو کوڕێژگەیەکی زبرو بێ ئەدەب گوتی:

"تۆی گەدا نوێنەری خاوەنشکۆی؟"

شازادە لە تورەیی دا سوور بووەوەو بێ ئختیار دەستی بۆ شمشێرەکەی برد، بەلام هیچ شمشێرێکی بە قەدەوە نەبوو. قاقای پێکەنینی منداڵەکان بەرز بووەوەو یەکێکیان گوتی:

"منداڵینە ئێوە سەرنجی حەرەکەتەکەیتان دا؟ ئەم کوریژگەیە ویستی وا بنوێنێ کە شمشێری بە قەدەوەیە، وەکو ئەوەی بە ڕاستی شازادە بێت".

ئەم شۆخییە بووە بایسی پێکەنینی زیاتری منداڵەکان. ئیدواردی بەلەنگاز خۆی قوت کردەوەو بەوپەڕی فیزو دەعیەوە گوتی:

"من خودی شازادە جێنشینمو ئەم ڕەفتارەی ئێوە کە قەرزارباری چاکەو مەحەبەتی بابی منن. لەگەڵ مندا ڕەفتارێکی نابەجێیە."

منداڵەکان بەم قسەیە گەلەك خۆشحاڵ بوونو بە قاقای پێکەنینی بەرز شادی خۆیان نیشاندا. ئەو منداڵە لاسارو دڕەی کە یەکەمجار قسەی کردبوو، هاوڕێکانی خۆی بانگ کردو گوتی:

"ئەی هیچو پوچینە، ئەی خولامان، ئەی ئەوانەی کە دەسەندەخۆرو شۆرباخۆری بابی ئەم شازادەیەن، ئەدەبو ئەخلاقتان چی لێهات؟ یاڵلا هەموو چۆك دابدەنو لە بەرانبەر زاتی شاهانەو جلو بەرگی شڕو شەپڕێوی مەلیکانە سەری ڕێزو حورمەت دابنەوێنن."

منداڵەکان بە شادیو شۆخیەکی تەوس ئامێزەوە کەوتنە سەر چۆکانو بە درۆوە کڕنۆشیان بۆ نێچیرەکەی خۆیان برد. شازادە، نوکە شاپێکی لە نزیکترین منداڵی تەنیشت خۆیەوە هەڵداو بە پشمو غەزەبەوە گوتی:

"جارێ ئەمە جیرەی ئەمڕۆت بێو چاوەڕوان بە تا سبەی سێدارەت بۆ هەڵدەخەم."

ئیدی ئەمە سوعبەت نەبوو، لە شۆخی دەرچوو بوو. خەندەی سەر لێوان ئاوا بوو و پشمو غەزەب جێی گرتەوە. دە دوانزە کەس لە منداڵەکان هاواریان کرد:

"بیکەنە دەرێ. بە ئاخوڕی ئەسپەکەوەی ببەستنەوە، بە ئاخوڕی ئەسپەکە. سەگەکان لە کوێن کە پارچە پارچەی بکەن؟ ئەهای لاین ئەهای فنگز..."

پاشان واریقاتێك رووی دا کە ئینگلیستان تا ئەو کاتە شتی وای بە خۆوە نەبینی بوو. جێنشینی ئینگلیستان لەلایەن کۆمەڵە خەڵکێکی ڕەشو رووتەوە ئەزیەتو ئازار دەدراو سەگانی تێ بەردرا بوو وخەریك بوو پارچە پارچەیان دەکرد.

هەرکە رۆژ ئاوا بوو و شەو داهات، شازادە خۆی لە گەڕەکە دوورە دەستەکانی شاردا بینییەوە. لەشی کوتراوو بریندارو دەستی خوێناویو جلە شڕو شەپڕێوەکانی قوڕاوی بوو. بەلەنگازە حەیرانو سەرگەردان بوو، سات بە سات شپرزەتر دەبوو، هێندە شەکەتو ماندوو بوو کە نەیدەتوانی هەنگاو هەڵێنێ. ئیدی لێبڕا کە هیچ شتێك لە کەس نەپرسێت، چونکە لە جیاتی وەلام جنێویان دەدایە. لە بن لێوانەوە دەی بۆڵاندو بە خۆی دەگوت: "ئۆفال کورت، بەڵێ نێوی ئەو گەڕەکە وابوو. جا من ئەگەر بەر لەوەی لەپێ بکەومو بمرم ئەوێندەر بدۆزمەوە، نەجاتم دەبێت، چونکە دانیشتووانی ئەو گەڕەکە بۆ کۆشکم دەبەنەوەو دەیسەلمێنن کە من لەوان نیم، بەڵکو شازادەی راستەقینەمو ئیدی جارێکی دی دەگەمەوە لای کەسوکارم." ئەوسا ڕەفتاری

کریێت و درزێوی منداڵە هۆڤییەکانی کڵێسای مەسیح-ی بیرکەوتەوەو گوتی: "کە بووم بە پاشا تەنیا لە خەمی خواردن و جێگایاندا نابم، بەڵکو زێدەباری ئەوەی کە لە کتێبانەوە فێری دەبن خەمی فێرکردن و پەروەردەشیان دەخۆم چونکە سکی تێر لە هەنبەر کەللەی خاڵی و دڵی بۆش و بەتاڵدا هیچ بایەخێکی نیە. من ئەم واریقاتە فەرامۆش ناکەم و کارێك دەکەم کە ئەم دەرسەی ئەمڕۆم بەفیڕۆ نەڕوات. میللەتی من تەحەمولی ڕەنج و سەختی دەکات و تەنیا فێرکردن و پەروەردەیە کە دڵی مرۆڤ نەرم دەکات و سۆزو بەزەیی و چاکە ڕێشاژۆ دەکات".

چراو روناکی ماڵان کەوتنە ورشەو ورش. باران دەستی پێکرد. با هەڵیکرد، تۆفە شەوێکی تاریك دنیای پێچایەوە. شازادەی بێ جێ و ڕێ و دەربەدەر، میراتگری بێ نەوای تەخت و تاجی ئینگلیستان، هەر بەو شەقامە پیس و کۆڵانە پڕ پێچ و پەنایانەدا کە ماڵی هەژارترین خەڵکی شاری لەندەنی تیا بوو، دەسوڕایەوە. لە نکاودا بابایەکی مەست یەخەی گرت و گوتی:

" تا ئەم درەنگە شەوە هەر لە دەرەوەیت و تاقە دنیارێکت لەگەڵ خۆتا نە هێناوەتەوە! بە زاتی خوا ئەگەر ئەمەت کردبێ، من جۆن کانتی نەبم ئەگەر ئێسك و پروسکت وردو خاش نەکەم!".

شازادە خۆی لە چنگی دەرهێناو بە دەم پاك کردنەوەی شانە پیسەکانی خۆیەوە بە توندی و توڕەیی گوتی:

"ئاه! بەراست تۆ بابی ئەوی؟ یاخوا هەو بیت! ئەگەر وابێ دەتوانی ئەو لەوێندەر دەربێنی و من بگەیەنیتەوە ماڵی خۆم."

"بابی ئەو، یانی چی؟ من نازانم ئەم قسەیە مانای چیە؟ من ئەوەندە دەزانم کە بابی تۆم و تۆش بەزووترین کات ئەمە تێدەگەی."

"ئاه، تو ئەو خوایە شۆخی مەکەو قسەی بە توێکڵ مەکەو وەختەکە بە فیڕۆ مەدە. من شەکەت و بریندارم و لەوەی پتر تەحەمول ناکەم. من ببەوە بۆ لای بابم، بۆ لای خاوەنشکۆ پاشام ببەرەوە تا لە ماڵی دنیات بگرێ و هێندەت سەروەت و سامان بداتێ کە لە خەون و خەیاڵیشدا جێی نەبێتەوە. توبی توخودا باوەڕ بە قسەکانم بکەو دڵنیابە کە ئەوەی دەیڵێم درۆ نیە، ڕاست و دروستە. وەرە پیاوی چاك بە دەستم بگرەو نەجاتم بدە! باوەڕم پێ بکە من شازادەی ویڵز-م!

کابرا سەری داخست و حەیران و سەرسام روانییە کوڕیژگەی وێڵ و سەرگەردان، ئەوسا سەرێکی لەقاندو بەدەم پڕتەو خوتە خوتەوە، لە ژێر لێوانەوە گوتی:

"بڕۆ کوڕۆ، ئەلهەقی تۆ لە هەر شێتێك شێت تری."

ئەوسا جارێکی دی یەخەی گرت و بەدەم پێکەنینێکی تاڵ و قێزەوەرەوە گوتی:

"شێت بی یان ئاقڵ فەرق ناکات، پیاو نەبم ئەگەر لەگەڵ داپیرەتدا شوێنی ساغ لە لەشتدا بێڵینەوە".

کابرا ئەو قسەیەی کردو شازادەی توڕەی، کە هەر لەقەفرتێی بوو، بەڕاکێش ڕاکێش لەگەڵ خۆدا برد، لە کاتێکا کە تاقمێك سەرسەری و چەقۆکێش بە دەم هەراو هوریاو رابواردنەوە دوایان کەوتبوون، خۆی بە ماڵێکی ئەو نزیکانەدا کرد.

"٥"

## تۆم لە پایەی ئەشرافی دا

تۆم کانتی کە لە ژووری کارەکەی شازادەدا بە تەنیا مایەوە، کەوتە خۆ مژول کردن. لە بەردەم ئاوێنەیەکی بالأنمادا وەستاو بە ڕاستو چەپدا کەوتە روانینو بەراوردکردنی خۆی. ئەوجا بەدەم لاسایی کردنەوەی رەفتارو هەڵسوکەوتی شاهانەی شازادەوە، بە پانیو درێژی ژوورەکەدا کەوتە هاتوچۆو، لە ئاوێنەکەدا تەمەشای ئەنجامی ئەو کارەی خۆی دەکرد. دوای ئەوە شمشێرە جوانەکەی شازادەی لە کێلان دەرهێناو دەمەکەی ماچ کردوو نووکی شمشێرەکەی روو لە سینگی خۆی گرت، وەکو چۆن پێنج شەش هەفتەیەك لەوە پێش بینی بووی کە ئەفسەرێکی نەجیمزادە لە کاتی ڕادەست کردنی دوو زندانی پایەبەرز یانی لۆرد نورفۆكو لۆرد ساری دا لە بەردەم سەرۆکی زیندان دا بە هەمان شێوە ئیکلامی کێشابوو. تۆم روانیە ئەو قەمە جەواهیرنیشانەی کە بە قەدییەوە بوو. کەوتە تەمەشای کەلوپەلە جوانو بەشکۆکەی نێو ژوورەکە، هەر بۆ تاقیکردنەوە لەسەر یەك بە یەکی کورسیو مۆبیلە جوانەکان دانیشت. ئەوجا کەوتە بیری ئەوەی کە خۆزیا منداڵانی گەڕەکی ئۆفال کورت دەیانتوانی لەو کاتەدا لە دەرگاوە وەژوور بکەونو بەو شێوەو هەیئەتەو لەو سەڵتەنەتەدا تەمەشای بکەن. تۆم حەیرانو سەرسام لە دڵی خۆیدا دەیگوت ئایا کاتێ بۆ ماڵ بگەڕێمەوەو ئەم چیرۆکە سەیرو سەمەرەیە بۆ منداڵان بگێڕمەوە باوەڕم پێدەکەن، یان سەر دەلەقێننو دەڵێن کە بیرو خەیالاتی پەشێوو پەریشان ئەقڵیان تێك داوم.

دوای نیو سەعاتێك لەپڕ تۆم هەستیکرد کە شازادە زۆر دواکەوتووەو بەمە نیگەران بووو هەستی بە تەنیایی کرد. دڵی تەنگ بوو و دەستبەرداری شتە فاخیرو جوانەکانی نێو ژوورەکە بوو. پاش کەمێکی تر ناڕەحەت بوو بە هەر چوار نکالدا گوێی هەڵخستو ئەنجام نیگەرانو شپرزە بوو. ئەوجا کەوتە بیری ئەوەی کە ئەگەر کەسێك بە سەرا بێتو ئەو لە جلو بەرگەکانی شازادەدا بدینێو شازادە نەگەڕێتەوە کە هۆی ئەمەیان بۆ روون بکاتەوە چ دەقەومێ. ئایا یەکسەر لە سێدارەی نادەن، و دوای کوشتنی بە فایلەکەی ڕاناگەن؟ بەلەنگازە بیستبووی کە گەورەکان زۆر زوو بەکارێن بچووكو کەم بایەخ ڕادەگەن. سات بە سات پتر ترسو شپرزەیی لێدەنیشتو سەراپای کەوتبووە لەرزین. ئەوجا بە هەمان ترسو لەرزەوە، بە ئەسپایی دەرکەی ژوورەکەی تەنیشتی کردەوەو لێبڕا کە هەڵێتو شازادە بدۆزێتەوەو لە پەنای ئەودا رزگار بێتو خەیاڵی ڕەحەتو ئاسودە بێت. شەش کەس لە نۆکەرانی بۆشناخو پۆشتەو پەرداخو دوو جەوانی نەجیمزادەی خۆش سەرو سیما کە جلكو بەرگی رەنگاو ڕەنگی میناکی رەنگی پەپولەیان لەبەر بوو، بەرزەپێ لەبەری هەستانو کڕنۆشیان بۆ برد.

تۆم یەکسەر کشایەوەو دەرگاکەی لەسەر خۆی داخستو گوتی:

"وای! ئەمانە گاڵتەم پێدەکەن. هەر ئێستا دەچن خەبەرم لێدەدەن. خودایە چیم بەخۆ کرد، بۆچی هاتم بۆ ئێرەو گیانی خۆم خستە خەتەرەوە؟"

تۆم جارێکی دی بە ژوورەکەدا کەوتە هاتوچۆو بەترسو لەرزێکی زۆرەوە دەهاتو دەچوو، شپرزەو نیگەران گوێی هەڵخست. لە سووکترین دەنگ دەڕەوییەوە. لەپڕ دەرگا کرایەوە یەکێك لە نۆکەرەکان کە جلێکی ئاوریشمی لەبەر بوو گوتی: "شازادەخانم جێن گری!"
دەرگاکە لە دوای شازادە خانمەوە داخراو کیژێکی زۆر ناسكو نازدارو خشکۆك کە جلێکی نایابی لە بەردا بوو بە هەنگاوی وردو بتەوەوە هاتە پێشێ. لێ شازادەخانم لە پڕ وەستاو بە تۆنێکی شپرزەو پەشۆکاو پرسی:
"گەورەم چیتە؟"
تۆم هەناسەی سوار بوو، لێ بە هەزار زەحمەت هاتە قسەو گوتی:
"وای، رەحم بە حاڵی مندا بکەن! من شازادەنیم، من تۆم کانتیی هەژارو بێنەوای گەڕەکی (ئوفال کورت)م. تکایە رێم بدەن با شازادە ببینم، تا جلە شڕو شەپڕێوەکانی خۆم وێداتەوەو بە لوتفو مەرحەمەتی خۆی فریام بکەوێو نەیەڵێ هیچ کەسێك ئازارو ئەزیەتم بدات. توخودا رەحمم پێدا بکەو رزگارم بکە."
منداڵەی بێنەوا کەوتبووە سەر چۆکانو بە چاوانی پڕ تکاو پاڕانەوەوە دەیڕوانییە شازادە خانمو بە دەستو زار دەپاڕایەوەو دەگریا. کیژەی جەوان ترساو هاواری کرد:
"وای. خاوەنشکۆ، تۆ دێیتە سەر چۆکانو بۆ کێش بۆ من؟..."
کیژێ ئەوەی گوتو لە ترسا هەڵات. تۆم رەش بێنو بێ ئومێد لێی دانیشتو لەبەر خۆوە گوتی:
"واوەیلا بە حاڵم، کەس فریام ناکەوێ،و رێگای ئومێد لە هەموو لایەکەوە بەستراوە. هەر ئێستا دەگەنە سەرمو لە زیندانم توند دەکەن."
بەڵێ، لەو دەمەدا کە تۆم لە گۆشەیەکدا کەوتبوو، هەواڵێکی ترسناك لە کۆشکدا بڵاو دەبووەوە. هەموو بە گوێی یەکیاندا دەچپاند، ئیدی نۆکەران بە نۆکەرانو نەجیمزادان بە خانمان خەبەریان داو لە سەرانسەری ڕاڕەوو هۆڵەکاندا، لە هەموو قاتەکانی کۆشکەکەدا، ئەم خەبەرە بڵاوبووەوە کە شازادە شێت بووە. زۆری نەبرد کە لە هەموو ساڵۆنەکانو لە گشت راڕەوەکاندا خەڵکێکی فرە لە پیاو ماقولانی دەرباریو لە خانمانی پۆشتەو پەرداخو هەروەها کۆمەڵێك لە خزمەتکارانو فەرمانبەران کە هەموو ماتو حەیران مابوون، لە دەوری یەك خڕبوونەوەو کەوتنە چپاندن بە گوێی یەکتراو شپرزەییان لە سەروسیما نیشتبوو. لە ناکاودا یەکێك لە ئەفسەرانی شکۆداری دەرباری بەنێو ئەم تاقمو دەستە پەراگەندانەدا تێپەڕیو بەدەنگی بەرز ئەمەی ڕاگەیاند: بە ناوی بەرزی خاوەنشکۆ پاشاوە: هەر کەسێك گوێ لەم هەواڵە بێ بنجو بنەوانە بگرێتو یان بیگێڕێتەوە، یان لەم کۆشکەی بەرێتە دەرێ، بە فەرمانی خاوەنشکۆ شا، حوکمی مەرگ دەدرێت.
واتە واتو چپە چپەکە وەکو چۆن بە خێرایی بڵاوبوو بووەوە، بە هەمان خێراییش بڕاو نەما.
پاشان لە ڕاڕەوەکاندا واتە واتێك بڵاوبووەوە، هەموو دەیانگوت:
"تەمەشاکەن، ئێستا شازادە دێت، شازادە دێت!"

تۆمی بەلەنگاز بە هەنگاوی خاوەوە دەهاتو بە بەردەم حەشاماتێکی زۆردا کە سەری رێزیان بۆ دانەواندبوو، تێ دەپەڕیو زۆر بەزەحمەت هەوڵی دەدا سلاویان بسەنێتەوە.

بە چاوانی ئەبڵەقو ترس ئامێزەوە دەیڕوانییە ئەو سەروسیما سەیرانەی کە دەوریان گرتبوو. پیاو ماقولانی بۆشناخی دەرباری لە هەردوو دەستییەوە رێیان دەکردو واداریان دەکرد خۆی بەوانەوە بگرێ تا مکومو بتەو رێ بکات. چەندین پزیشکی دەرباریو چەندین خزمەتکاریش بە دوایەوە بوون. دوای تۆزێك تۆم خۆی لە یەکێك لە هۆڵە شکۆدارەکانی کۆشك دا بینییەوەو گوێی لێ بوو کە دەرگای هۆڵەکەیان لە دوایەوە داخست. ئەوانەی کە لە خزمەتیا هاتبوون لە دەوری وەستابوون.

پیاوێکی کەتەی زەلامی ورگن، دەموچاو پانی گۆشتنو گرژومۆن لە بەرانبەر تۆم دا بە مەسافەیەکی کەم دانیشتبوو. سەرە زلەکەی ماشو برنج بوو. ردێنیشی کە وەکو چوارچێوە دەوری دەموچاوی دابوو، هەر ماشو برنج بوو. جلەکانی لە قوماشو پارچەی فاخیرو نایاب بوون لێ برێك کون بوونو تەنانەت هەندێ شوێنی پوابوو. سەرینێکی گەورەیان لە ژێر لاقێکیاکە ئاوسابوو و سارغی پێچیان کردبوو، دانا بوو. بێدەنگییەکی تەواو باڵی بەسەر سەرانسەری هۆڵەکەدا کێشابوو و جگە لەو پیاوە، ئیدی هەر هەموو ئەوانەی دی سەری رێزیان دانەواند بوو. ئەم پیاوە گرژو مۆنو پیرو نەساغە هنری هەشتەمی پاشای ترسناکو بە دەسەلاتی ئینگلیستان بوو. هاتە قسەو بەدەم قسەوە بەرە بەرە رووی دەکرایەوەو دەگەشایەوەو میهرو خۆشەویستیو لوتفی لەخۆ دەگرت. پاشا گوتی:

"ئێ ئیدوارد، کوڕی من، جێنشینە ئازیزەکەم، دەتویست پاشایەکی میهرەبانو دلۆڤانی وەکو من کە بابی تۆمو هەمیشە بە لوتفو دلۆڤانی رەفتارت دەگەڵ دەکەم. بە سوعبەتێکی نابەجێ بترسێنی؟"

تۆمی بێچارە ئەوەندەی کە هزرو بیری پەریشان رێی دەدا، گوێی لە سەرەتای ئەم قسەیە گرت، لێ کاتێ قسەکانی پاشای دلۆڤانی بەر گوێ کەوت، رەنگی لەروو پەڕیو میناکی یەکێك گوللەی بەرکەوتبێ کەوتە سەر چۆکان، ئەوسا هەردوو دەستی بەدەم پاڕانەوەوە بەرز کردەوەو گوتی:

"واوەیلا بە حاڵم، تۆ پاشای! کەواتە کاری من کراوە."

وەك بڵێی ئەم قسەیە پاشای ناڕەحەت کرد، چونکە نیگای یەك بەیەکی ئامادەبووانی کردو هەنگێ چاوی بڕییە سیمای کوڕە کە لە بەردەمیا بوو،و بە دەنگێکی شپرزەو خەمناك گوتی: "من پێموابوو ئەم دەمگۆیە بێ بنجو بناوان بێ، لێ ئێستا دەبینم کە دروست بووە." هەنگێ ئاهێکی قووڵی هەڵکێشاو بە دەنگێکی نەرمو خۆش گوتی:

"وەرە کوڕم. وەرە لای بابت، پێدەچێ حاڵت باش نەبێ."

یارمەتی تۆمیان دا تا لە جێی خۆی هەستاو بە ترسو لەرزەوە لە خاوەنشکۆ پاشا نزیك بووەوە. پاشا دەموچاوی هەراسانو ترساوی ئەوی لە نێو هەردوو دەستی خۆ گرتو بۆ چەند دەمێك بە لوتفو سۆزو بە وردییەکی فرەوە لێی ڕوانی تا بەڵکو نیشانەیەکی گەڕانەوەی ئەقڵو

ئاوەز لە سیمایدا بدینێ، ئەوسا سەرە نازدارەکەی بە قژە لوولەکەیەوە، بە سینگی خۆیەوە قرساندو بە لوتف و دلۆڤانی کەوتە نەوازشتی و ئەنجام گوتی:

"کوڕەکەم، مەگەر بابی خۆت ناناسیتەوە؟ نەکەی دڵی منی پیرەمێرد بشکێنی. بڵێ دەتناسم. هەڵبەتە دەبێ من بناسیت، وانیە؟

تۆم گوتی:

"با، با، تۆ پاشاو وەلی نیعمەتی ئازیزی منیت و هیوادارم خودا دەست بە باڵتەوە بگرێ و راوەستاوت بکات."

پاشا گوتی:

"ئافەرین، ئافەرین، دروستە. کەواتە ئارام بگرە، مەلەرزە، مەترسە، ئاخر کەس لێرە نیە کە بیەوێ تۆ ئەزیەت و ئازار بدات. هەموو ئەوانەی لێرەن خۆشیان دەوێی. ئێستا حاڵت باشترەو ئەو خەوو خەیاڵە پەریشانە لە مێشکی خۆت دەربکە، وانیە؟ تۆ ئیتر ناوی خۆت دەزانیت و لەمە بەدواوە ناوێکی دی لە خۆت نانەی، وانیە؟ دەڵێن تا ئێستا چەند جارێك وات کردووە، ئایا ڕاستە؟"

تۆم گوتی:

"قوربان، تکا دەکەم باوەڕ بە قسەکەم بفەرموو، من حەقیقەتی تەواوم گوتووە. من سەر بە هەژارترین چینی رەعیەتی تۆم و لە خێزانێکی هەژار هاتوومە دنیا. رێکەوتێکی خراپ و بەدبەختی و نەگبەتیەکی ناگەهانی منی گەیاندووەتە ئێرەو هیچ خەتاو تەخسیرێکی خۆمی تیانیە. من هێشتا منداڵم و حەیفە لە ئێستاوە بمرم. تۆ دەتوانی بە تاقە وشەیەك گیانم بکڕییەوە، لە گیانم خۆش بی، ئاە خاوەنشکۆ، توبی توخودا قسەیەك بکە!"

پاشا گوتی:

"مردنی چی! ئاە ئەی شازادەی ئازیز قسەی وا مەکەو دڵی پەشێوو پەریشانی خۆت هێور بکەوە! دڵنیابە تۆ نامریت!"

تۆم بە خۆشی و شادیەکی فرەوە کەوتە سەر چۆکان و هاواری کرد: "ئا ئەی خاوەنشکۆ، خودا جەزای خێرت بداتەوەو تەمەنت درێژ بکات تا فەرمانڕەوایی مەمەلەکەتەکەی ئەو بکەیت!" پاشان هەستایەوەو رووی گەشی بۆ لای دوو کەس لە گەورە پیاوانی دەرباری کە گوێ بە فەرمانی ئەو وەستابوون وەرگێڕاو گوتی:

"گوێتان لێ بوو کە شا چی گوت؟ من نابی بمرم. پاشا بەدەمی خۆی گوتی."

ورتە لە کەسەوە نەهات، لێ هەمووان بەرێزەوە سەریان دانەواند. تۆم ماوەیەك دوو دڵ و نیگەران لە جێی خۆی وەستاو پاشان بە ترس و لەرزەوە رووی بۆ لای شا وەرگێڕاو گوتی:

"ئایا ئێستا بۆم هەیە بڕۆم؟"

شا گوتی:

"بڕۆی؟ هەڵبەتە هەر کاتێ بخوازی دەتوانی بڕۆیت، ئەدی بۆچی ناتەوێ تاوێ لای من وەمێنی؟ دەتەوێ بۆ کوێ بڕۆیت؟"

تۆم سەری داخستو بەو پەڕی لارەملیو گەردن کەچییەوە گوتی:
"ڕەنگە من بە هەڵەدا چووبم، بەڵام وام دەزانی کە ئازادمو بۆیە بە نیاز بووم بەرەو کوختە پەڕپوتەکەی خۆم، یانی بۆ ئەو شوێنەی کە تیای لە دایك بوومو بە هەژاریو نەگبەتی تیای گەورە بووم بگەڕێمەوە، بۆ ئەو شوێنەی کە ئێستا دایکمو خوشکەکانمی لێنو لانەو کاشانەی منە. من فێری ئەم شەوکەتو شکۆو جاهو جەلالە نیمو تکا لە خاوەنشکۆ دەکەم کە ڕێم بدات بۆ ماڵی خۆم بگەڕێمەوە."
پاشا ماوەیەك ماتو بێدەنگ لە فکران ڕاچوو. شپرزەییو خەم لە چارەو رووی نیشت. ئەوسا بەدەنگێکی پڕ ئومێدەوە گوتی:
"لەوەیە شێتی ئەم کوڕە تەنیا لە یەك رووەوە بێت، و لە رووەکانی ترەوە هیچ عەیبێکی نەبێت. ئیشەڵڵا هەر واش دەبێت، و با ئێستا تاقی بکەینەوە."
و یەکسەر بە زمانی لاتینی پرسیارێکی لە تۆم کرد کە ئەویش بە هەمان زمان وەڵامێکی نیوەچڵو تێك شکاوی دایەوە. پاشا خۆشحاڵ بوو. کەیفو خۆشی خۆی دەربڕی. نەجیمانو پزیشکانی دەرباریش شادیو خۆشی خۆیان دەربڕی. شا گوتی:
"ئەم وەڵامە پڕاو پڕی هۆشو گۆشو زانیاری ئەو نەبوو، لێ ئەوە دەردەخات کە ئەگەر ئەقڵی کەمێ عەیبدار بووبێ، بە تەواوەتی زایە نەبووە. ئەنگۆ چ دەڵێن؟"
ئەو پزیشکەی کە رووی دەمی پاشا لەو بوو، سەری ڕێزی دانەواندو گوتی:
"من پێموایە، مەزەندەکەی خاوەنشکۆ دروستە."
شا، بەم قسەیە، کە قسەی بابایەکی شارەزای گەورە بوو، شادو دڵخۆش بوو، و بە خەیاڵی ئاسودە درێژەی بە قسەدا:
"ئێستا هەموو تەمەشا بکەن. دەمانەوێ جارێکی دی تاقی بکەینەوە!"
و یەکسەر بە زمانی فەرەنسی پرسیارێکی لە تۆم کرد. تۆم بۆ چەند ساتێك ماتو بێدەنگ وەستاو لەوە نارەحەت بوو کە ئەو هەمووە چاوی نیگەرانیان بڕی بووە ئەو. ئەوسا بە ترسو دڵەرزەوە وەڵامی دایەوە:
" خاوەن شکۆ، من ئەم زمانە نازانم."
شا کەوت بەسەر پشتی کورسیە دەسکدارەکەی خۆیدا. گاردەکانی بە پەلە خۆیان گەیاندە دیاری کە یارمەتی بدەن، لێ شا دانیە دواوەو گوتی:
"وازم لێ بێنن، هیچ نیە، کەمێك دڵم بورایەوە. بەرزم بکەنەوە! باشە، بەسە! وەرە پێشێ کوڕەکەم، سەری پەریشانو پەشێوی خۆت بنە سەر دڵی بابتو هێور بەرەوە. بەو زووانە چاك دەبیتەوە."
ئەوسا رووی کردە ئامادەبووانی مەجلیسەکە، لێ لوتفو سەفاو خۆشیەکەی پێشتر بەروویەوە نەماو، و گرێکی ترسناك نیشتە سەرچاوانیو بەدەم ئەم حاڵەوە گوتی:
"هەموو گوێ بگرن! کوڕەکەم شێت بووە، لێ شێتییەکەی هەمیشەیی نیە. هۆی ئەم نەخۆشیە، خوێندنو خوێندنەوەی زۆرو تا ڕادەیەکیش تەنیاییو گۆشەگیری نێو ژوورەکانی کۆشکە. لە

ئێستا بە دواوە کتێب‌و دەرس‌و موعەلیم نیە! دەبێ ئاگاداری بن‌و بە وەرزش‌و گەمەو یاری دیکە سەرگەرم‌و مژوڵی بکەن تا چاك دەبێتەوە."

شا کەمێك لە جێی خۆی بەرز بووەوەو بە هەمان دەنگی وشك‌و تۆڕە لەسەری رۆیی:

"بەڵێ، شێت بووە، لێ هەرچیەك بێ کوڕی منە، میراتگری تەخت‌و تاجی ئینگلیستانەو شێت بێ یان ئاقڵ دەبێ پاشایەتی بکات. جا ئێوە بەوردی گوێ هەڵخەن‌و لە هەموو شوێنی رای بگەیەنن کە هەر کەسێك شتێك دەربارەی شێتی ئەو بڵێت، مانای وایە دژی ئاسایشی وڵات‌و دژی بەرژەوەندی سەڵتەنەت رەفتاری کردووەو لە سێدارە دەدرێت... ئاه... تۆزی ئاوی خواردنەوەم بدەنێ... هەستدەکەم خەریکە دەسووتێم. ئەم پێشهاتە خەمناکە هێزی لەبەر بڕیووم... وەرن پەرداخەکە بەرن... ئاه، بمگرن! باشە، باشە، بەسە. دەڵێن کوڕەکەم شێتە؟ جا باوابێ، ئەگەر هەزار ئەوەندەش شێت تر بێ هەر وەلیعادی ئینگلستانەو من کە پاشام ئەم فەرمانە مۆردەکەم. هەر ئەمڕۆ بە گوێرەی داب‌و نەریتی کۆن‌و دێرینە بە وەرگرتنی پایەو لەقەبی وەلیعادی‌و جێنشینی مشەرەف دەبێت‌و تۆش جەنابی لۆرد هرتفورد یەکسەر دەستوری پێویست لەمبارەیەوە دەربکە."

یەکێك لە نەجیبانی دەرباری لە بەرانبەر تەختەکەی پاشادا چۆکی داداو گوتی:

"جەنابی موبارەکی خاوەنشکۆ پاشا ئاگادارن کە ئەم کارە پڕ شانازیە، ئەرکی مارشاڵی گەورەی ئینگلیستانە کە حاڵی حازر لە بورجی لەندەندا زیندانە. هێشتا هیچ ئەمرێك دەربارەی..."

"بەسە، نامەوێ گوێم لە ناوی ئەو بێ. گوێم بە ناوی ئەو ئازار مەدە. بۆچی ئەم مێردەکی بۆرە پیاوە هەتا هەتایە هەر دەژی؟ یانی ناتانەوێ فەرمانی من جێبەجێ بکەن؟ یانی وەلیعاد دەبێ بە سەرگەردانی‌و مۆلەقی وەمێنێ چونکە دەرباری پاشایەتی ئینگلیستان مارشاڵیکی ئابرومەندی پاك‌و بێگەردو لە غەدرو خیانەت بە دووری نیە، تا ئەتەکێت‌و رێو رەسم‌و تەشریفاتی پێویست جێبەجێ بکات؟ قەسەم بە گەورەیی خودا شتی وانیە، هەر ئێستا پارلەمانەکەم ئاگادار بکەن کە هەر ئەمشەو، بەر لەوەی رۆژ ببێتەوە حوکمی مەحکومیەتی (نور فولك)م بۆ بێنن، دەنا بەرپرسیار دەبن‌و ئوباڵیان بە گەردنی خۆیان."

لورد هرتفورد گوتی:

"ویستی پاشا یاسایە."

ئەوسا لە عاردی هەستاو گەرایەوە شوێنەکەی پێشووی خۆی. بەرە بەرە شوێنەواری تورەیی‌و پەستی لە چارەو سیمای پاشای پیر رەوییەوە،و گوتی:

"وەرە کوڕم، وەرە ماچم بکە، چیە!... لە چی دەترسیت؟ ئەدی من بابی خۆشەویستی تۆ نیم؟"

تۆم گوتی:

"تۆ ئەی سەروەرو وەلی نیعمەتی بە دەسەڵات‌و دلۆڤان، ئەو پەڕی لوتف‌و مەرحەمەتت دەربارەی من هەیە،و من ئەم حەقیقەتە دەزانم. لێ... کە بیر لەوە دەکەمەوە کە دەبێ ئەو بمرێت زۆر داخ دەخۆم‌و ..."

پاشا گوتی:

"ئاه... تۆ هەر کوڕەکەی جارانی! هەمان قوماشیت! من دەزانم هەر چەندە مێشکت ئاسیوی دیتوە، دڵت وەکو خۆی ماوەتەوە، چونکە تۆ هەمیشە کوڕێکی دلۆڤانو بە بەزەیی بووی. ئەم دۆکە کۆسپێکی گەورەیە لە سەر ڕێگەی پایەو لەقەبی تۆ، من دەمەوێ کەسێکی دی لە جیاتی ئەو بخەمە سەر ئەم کارە کە ئەرکو وەزیفەی خۆی بە کاری دزێوو نەنگین نەلەوەتێنێ. کوری خۆم، تۆ ئارام بەو بیری ماندووو نەخۆشی خۆت بەم شتانەوە شەکەت مەکە."

"لێ قوربان تەسەور ناکەی مەرگی ئەو داماوە لە سۆنگەی منەوە بێت؟ ئایا ئەگەر من نەبوایەم لەگین نەبوو ئەو ماوەیەکی زۆر بژی؟"

"کوڕی خۆم، خەمی ئەوت نەبێ، چونکە ئەو شایستەی ئەم لوتفە نیە، وەرە جارێکی ترم ماچ بکەو بچۆ بەلای گەمەو سەرگەرمی خۆتەوە. من ئەم نەخۆشیە ئازارم دەدات، حاڵم باش نیەو دەخوازم ئیسراحەت بکەم. تۆش دەگەڵ خاڵە هرتفوردو گاردەکانی دیکەدا بڕۆو کە من ئیسراحەتم کرد هەنگێ وەرەوە بۆ لام."

تۆمیان، بە دڵێکی گیراوی خەمینەوە، لە خزمەتی شا بردە دەرێ. چونکە قسەکەی دوایی شا جەزرەبەیەکی کوشندە بوو لە باڵای هیواو ئارەزووەکانیو ئەو بێنەوایە وایزانی بوو کە دەستبەجێ ئازاد دەکرێت. لە کاتی تێپەڕیندا، دیسان ورتە ورتە پەیدا بووەوە کە دەیانگوت: "شازادە دێت! شازادە دێت."

لە کاتێکا کە بە بەینی دوو ریز لە دەربارییاندا ڕەت دەبوو، و دەرباریانی دی سەری ڕێزیان بۆ دانەواند بوو، سات بە سات پتر ورەی بەردەداو نائومێد دەبوو، چونکە وای لێکدەدایەوە کە بێ هیچ گومانو چەندو چوونێك زیندانیو دەستبەسەرەو دەبێ هەتا هەتایە لەم قەفەزە زێرینەدا دیلو یەخسیر بێت. وەهەتا هەتایە دەبێ شازادەیەکی بێ یارو یاوەرو نەگبەتو بێ تالح بێتو جگە لە خودا چ کەس ڕەحمی پێدا نەکاتو لە خەمی ئازادیو رزگاری ئەودا نەبێت.

تۆمی بەلەنگاز بۆ هەر لایەك سەری وەردەگێڕا، وای هەست دەکرد کە سەری بەرزو چارەی ئاشنای دۆك دونورفولك-ی گەورە دەبینێ کە زەق زەق دەڕوانێتە ئەوو لۆمەو سەرزەنشتی دەکات.

بەراستی خەونو خەیاڵە دێرینەکانی چەند خۆشو شیرین بوون، و ئەم حەقیقەتو واقیعەی ئێستای چەند خەمناكو گیانپڕوکێنە!...

"٦"

## تۆم مەشق دەدرێت

تۆم برایە ژوورێکی سەرەکی بە یەکێك لە عیمارەتەکانو لەوێ دانرا، هێندەی پیاوانی پیرو نەجیبانی پایە بەرز بەدەورەوە وەستا بوون کە بە زەحمەت رووی هات دانیشێت. تکای لەوانیش کرد کە دانیشن. لێ ئەوان وەکو ڕێزو سوپاسگوزاری سەری حورمەتیان بۆ دانەواندو ورتە ورتێکیان کردو هەر بە پێوە مانەوە. تۆم ویستی جارێکی دیکەش تکایان لێبکات دانیشن، لێ دۆك هرتفوردی خاڵی دەمی لە پەنا گوێی ناو گوتی:

"قوربان تکایە ئیلحاح مەفەرموو، چونکە بۆیان نیە لە حوزوری تۆدا دانیشن."
لەم کاتەدا خەبەریان دا کە لورد سانت جۆن بەنیازە تەشریف بێنێ. دوای تەشریف هێنان، عەرزی خزمەتکاری خۆی کردو گوتی:
"من بە فەرمانی خاوەنشکۆ، والا حەزرەت پاشا، بۆ شتێك مشەرەف بووم کە دەبێ بە نهێنی عەرزی جەنابی باسەعادەتتی بکەم. ئایا دەکرێ خاوەنشکۆت دەستور بفەرمووی کە هەموو گاردو دەستو پێوەندەکان، جگە لە جەنابی دۆك هرتفورد لە خزمەتی جەنابت مەرەخەس بن و بچنە دەرێ؟"
کە دۆك هرتفورد هەستی کرد تۆم نازانێت چۆن گاردەکانی لە خزمەت مەرەخەس بکات، دیسان سەری وەپەنا گوێی ناو حاڵی کرد کە تەنیا ئاماژەی دەست بەسەو ئیدی پێویست بە قسەکردن ناکات.
کە ئامادەبوان لە ژوور وەدەرکەوتن لۆرد سانت جۆن گوتی:
"خاوەنشکۆ، ئەمر دەفەرموون کە شازادە دەبێ بەپێی ئەرك و لە رووی پاراستنی بەرژەوەندی بالای ولاتەوە تا ئەو کاتەی کە بە تەواوەتی چاك دەبێتەوەو دەگەڕێتەوە دۆخی جاران، نەخۆشییەکەی خۆی بە هەر شێوەیەك بووە، بەپێی دەسەلات و توانای خۆی لە هەمووان وەشێرێ. شازادە نابێت نکوڵی لەم حەقیقەتە بکات کە وەلیعادو میراتگری تەخت و تاجی ئینگلیستانە. دەبێ هەمیشە کردارو رەفتاری شاهانە بێت و بێ چەندوچوون، رێوڕەسمی حورمەت و تەشریفاتی پەیوەست بە پایەو لەقەبی خۆی، وەکو چۆن لە کۆنەوە باو بووە، بەو ئاوایە قەبووڵ و جێبەجێ بکات. دەبێ لە ئێستا بەدواوە بە هیچ جۆرێ باسی ئەوە نەکات کە سەر بە چینی رەش و رووت و هەژارانە، چونکە ئەمە جگە لە پەریشانی هزرو حەواس و خەون و خەیاڵ هیچی تر نیە. دەبێ هەوڵ بدات سیمای ئەو کەسانەی کە لەمە پێش ناسیونی وەبیر خۆی بێنێتەوەو هەر کاتێ کە ئەمەی بۆ نەکرا، خۆی شپرزە نەکات و نە بە ئاماژەو نە بەقسە ئەوە دەرنەبڕێت کە ئەو سیماو شێوەو هەیئەتە ناناسێتەوە. دەبێ هەر کاتێ کە لە کاروباری بەڕێوەبردنی ولاتدا چ ئەنجامدانی فەرمانێك بێ یان دەربرینی ڕاو بۆ چونێك بێ تووشی گیروگرفتێك هات، نەزانی و ناپوختەیی نیشان نەدات و سەرنجی لاپڕەسەن و کونجکاوان و ئیرادگران بۆ لای خۆی ڕانەکێشێت. بەڵکو دەربارەی ئەو گرفت و کێشەیە پرس و راوێژ بەجەنابی لۆرد هرتفورد یان بەندەی گیان فیداو گیان لەسەر دەست کە بە فەرمانی پاشا، شەرەفی راوێژکاریی خودی وەلیعادم پێ سپێردراوە، تەگبیرو راوێژ بفەرموێت و ئێمەش بۆ ئەنجامدانی فەرمانێن شاهانە هەمیشە حازرو ئامادەی خزمەتین. بەڵێ ئەمە بوو فرمانێن شاهانەی خاوەنشکۆ کە سلاوی بۆ پایەبەرز وەلیعاد هەبوو و لە خوا پاڕایەوە کە شیفای عاجیل بۆ شازادە بنێرێت و پایەبەرز لە سایەی عینایەتی خۆیدا بپارێزێت."
لۆرد سانت جۆن ئیکلامێکی کێشاو لە سوچێکدا وەستا. تۆم لە رووی ناچاری و بێ دەسەلاتییەوە بەرسڤی دایەوەو گوتی:

"جا كه خاوەنشكۆ ئەمەیان فەرمووە، بەسەر چاو. كەس بۆی نیە فەرمانی شا لە عاردی بدات، یان بە كەیفی دڵی خۆی فەرمانێن ئەو بگۆڕێ، یان فێڵبازانە خۆی بدزێتەوەو لە ئەنجامدان‌و جێبەجێكردنیاندا خەمساردی بكات‌و بیانوان بدۆزێتەوە. ئەمری شا لەسەر سەرو چاوانە."

لۆرد هرتفورد گوتی:

"بەڵام سەبارەت بە فەرمانی خاوەنشكۆی موبارەك دەربارەی كتێب‌و خوێندن‌و دەرس‌و هەموو كاروبارێكی جددی لە ئێستا بە دواوە دەبێ هەموو ئەو كارانە وەلابنرێن‌و پایەبەرز شازادە، وەختی خۆی بە گەمەو سەرگەرمیانی سووكترو ئاسانترەوە بگوزەرێنی تا نەبادا هیلاك‌و شەكەت‌و ناڕەحەت لە جەژن‌و ئاهەنگدا بەشداری بكات‌و ئەمەش هێندەی دی بێزارو ناڕەحەتی بكات."

سەرسامی نیشتە سەر سیمای تۆم‌و كە بینی لۆرد سانت جۆن چاوانی پڕ لە خەمی بڕیوەتە ئەو، سوور بووەوە. لۆرد گوتی:

"قوربان، هێشتا مێشكی تۆ پەریشان‌و پەشێوە، بۆیە سەرت سوڕماوە. لێ هیچ نیە. زۆری بیر لێ مەكەوە. مێشكی خۆت نارەحەت مەكە. خەتای تۆ نیە. خەتای مێشكی لاوازو نەخۆشی تۆیە. جەنابی لۆرد هرتفورد باسی جەژنی گەورەی شار دەكات كە خاوەنشكۆ پاشامان دوو مانگ لەمە پێش بەڵێنی بەرپاكردنی ئەو جەژن‌و ئاهەنگەیان فەرموو بووو قەرار بوو كە پایەبەرز وەلیعاد لەو جەژن‌و ئاهەنگەدا بەشداری بفەرموون. ئێستا ئەو جەژنەت وەبیر هاتەوە؟"

تۆم كە جارێكی دی سور هەڵگەڕا بووەوە بە دەنگێكی لەرزۆك گوتی:

"بۆ نەگبەتی دەبێ دان بەوەدا بنەم كە بیرم چووبوو.".

لەم كاتەدا خەبەری هاتنی شازادەخانم ئەلیزابت‌و شازادەخانم جین گری-یان ڕاگەیاند. جووتە لۆردی سەرپەرشتیاری وەلیعاد نیگایەكی ماناداری یەكتریان كردو لۆرد هرتفورد یەكسەر بەرەو دەرگا چوو. لەو كاتەدا جووتە شازادەخانم وەژوور دەكەوتن، بە ئەسپایی بە گوێی دا چپاندن:

"خانمان تكایە گوێ بە گۆڕانی شێوەو ئەخلاقی پایەبەرز وەلیعاد مەدەن‌و سەرتان لە كەم هۆش بوونی ئەو سوڕ نەمێنێ. ئەگەر گوێ بەوە بدەن كە پایەبەرز بە هەموو شتێكی بچووك دوچاری حەیرمان دەبێت. بێگومان زۆری داخ بۆ دەخۆن‌و خەفەتبار دەبن."

لەو كاتەدا، لۆرد سانت جۆن سەری وەپەنا گوێی تۆم نابووو دەیگوت:

"قوربان، تكا دەكەم دەستورەكانی خاوەنشكۆ پاشامان فەرامۆش مەكەو تا دەتوانی رابردووو شتەكانی رابردوو وەبیر خۆت بێنەوەو ئەگەر نەشت توانی، وا بنوێنە كە هەموو شتێكت لە بیرە. كاریێ مەكە كە ئەوان هەست بە گۆڕانی حاڵی تۆ بكەن، چونكە ئەو هاووازیە دێرینانە، تۆیان زۆر خۆش دەوێ. دەزانی كە ئەوان تەحەمولی ئەم نارەحەتی‌و نەخۆشیەی تۆ ناكەن‌و دەزانی ئەم وەزعە چەند ئەوان خەمبارو ناڕەحەت دەكات. ئێ پایەبەرز، ئایا حەز دەكەی كە من لە لای تۆ بمێنم؟ گەرەكتە خاڵیشت بمێنێ؟"

تـۆم ڕەزامەنـدی خـۆی بـە ئاماژەیـەك‌و بـە ورتـە ورتێکـی سـووك نیشـان دا. چـونکە بەرەبـەرە دەرسەکان فێر دەبوو، و لە دڵی پاك‌و بێگەردی خۆیدا بڕیاری دابوو کە ئەوەندەی بتوانێت، خـۆی دەگەڵ ژینگەو نێوەڕۆکی فەرمانەکانی شادا بگونجێنێ.

بـەڵی سـەرباری ڕەچـاوکردنی ئحتیـاتی پێویسـت، هەنـدێجار گفتوگـۆی ئـەو شـازادانە دەگەییـە بنبەست‌و دەبووە بایسی ناڕەحەتی‌و سەرگەردانی. ئەوی ڕاستی بێ پتر لە جارێك لەزگ بوو تـۆم پەت بپچڕێ‌و ڕێك‌و ڕاست‌و بەڕاشکاوی بڵێت کە هاوشـان‌و شـەوکەت‌و پلـەو پایـەی ئـەو شـازادە خانمانە نیە، لێ زیرەکی‌و وریایی شازادەخانم ئەلیزابت فریـای دەکـەوت، یـان وشـەیەك لـە زاری هەر یەك لەو جووتە لۆردەی هاوڕێی کە لە کاتی خۆیدا دەگوترا، فریای دەکـەوت‌و نـەجاتی دەدا. جارێکیش جین گری رووی کردە تۆم‌و بەم پرسیارە نارەحەتی کرد:

"قوربان، ئایا ئەمڕۆ ئەرکی خۆت ئەنجام داو بە خزمەتی شابانۆی پایەبەرز مشەڕەف بوویت؟"

تۆم پەشۆکاو خەریك بوو قسەیەکی نابەجێ‌و ناپەسند بکات، لـێ لـۆرد سـانت جـۆن سـەرەداوی قسەکەی گرتە دەست‌و بە لێهاتووی‌و تەڕدەستی دەربارییانی کارامەو بە ئەزموون کە دەزانن چۆن لە کاتی ڕووبەڕوو بوونەوەی گیروگرفتـان دێنـە دەسـت‌و بەسـەر کۆسـپ‌و تەگەرانـدا زاڵ دەبن، لـە جیاتی تۆم وەڵامی دایەوە:

"بەڵێ خانم، پایەبەرزیش ئەمڕۆ بە خزمەتی شابانۆ مشەڕەف بوو، و بە تایبـەتی کـاتێ شـابانۆ لـە زمانی پایەبەرز شازادەوە هەواڵی سەلامەتی‌و چاکبوونی وەزعـی میزاجـی شـای زانـی، زۆری پـێ خۆش بوو. وانیە جەنابی شازادە؟"

تۆم لە بن لێوانەوە ورتـە ورتێکـی وەکـو نیشـانەی سـەلماندنی قسـەکەی لـۆردی دەرپـەڕانـد، لـێ هەستی دەکرد پێی ناوەتە سەر زەمینێکی ترسناکەوە. دوای تۆزێك باسـی ئـەوە هاتـە ئـاراوە کـە تۆم نابێ چیتر دەرس بخوێنێ، لێ کیژەی لاو گوتی:

"بەڕاسـتی حەیفـە، زۆریـش حەیفـە. خـۆ تـۆ لـە دەرسـەکانتا زۆر زیـرەك‌و پـڕ کۆشـش بوویـت. لێ قەیـدی نیـە، کـەمێ سـەبر بکـە ئەمـە زۆر ناخایـەنێ. تـۆ لـە فێـر بوونـدا وەکـو بابـت بـە بـەهرەیت‌و میناکی ئەو چەندین زمان فێر دەبیت."

تۆم کە بۆ چەند ساتێك مەوقعیەتی خۆی لە بیر چوو بوو گوتی:

"بابی من! وەی وەی! بابی من ناتوانێ قسەی ڕۆژانەی خۆیشی بکات. تەنیا بـەرازێن نێـو گـەوڕان لە زمانی ئەو حاڵی دەبن. بەڵام سەبارەت بەزانیاریانی دی..."

لێرەدا چاوی تـۆم لـە چاوانی لـۆرد سـانت جـۆن هەڵـەنگوت‌و هەسـتی کـرد لۆمـەو گازاندەیـەکی زۆرو مانادار لە چاوانی دا پەنگاوەتەوە.

بەستەزمانە ناچار زاری لێك ناو ڕەنگی سـوور هەڵگـەڕا. ئەوسـا بـە دەنگێکـی هێـواش‌و خـەمناك لەسەر قسەکەی ڕۆیی‌و گوتی:

"ئاه! هەمدیس ئەم نەخۆشیە بەرۆکی گرتمەوەو حەواسم پەرت بوو. من هـەرگیز مەبەسـتم نـەبوو کە تەوس بە شا بکەم."

شازادەخانم ئەلیزابت، دەستی برایەکەی بە شێوەیەکی حورمەت ئامێزو نەوازشکارانەو پڕ سۆزەوە لە نێو هەردوو دەستی خۆی ناو گوتی:

"بەڵێ قوربان ئێمە چاك دەزانین کە تۆ هیچ غەرەزێکت نەبوو. خەتای نەخۆشیو پەشێو فیکریەکەتە."

تۆم بە دەنگێکی منەتبارانەوە گوتی:

"تۆ ئەی شازادەخانمی شیرین زمان، چەند دلۆڤانو تەسەلابەخشیت، پڕ بەدڵ حەز دەکەم سوپاست بکەم، لێ ئەفسووس توانای سوپاسگوزاریم نیە."

جارێکیش جین گری شەیتان پرسیارێکی سادەی بە زمانی یونانی لە تۆم کرد. چاوانی تیژی شازادەخانم ئەلیزابت، لە پشت سیمای ماتو پەشێوی تۆم–ەوە، زانی کە شۆخییەکە لە سنوری خۆی دەرچووە، بۆیە هێدیو هێمن لە جیاتی تۆم بە چەند وشەیەکی یونانی وەڵامی دایەوەو بەو شێوەیە بابەتی گفتوگۆکەی گۆڕی.

بەڵێ، ڕۆژان بەخۆشی وئارامی تێدەپەڕین. بەرە بەرە ژمارەی ئەو کۆسپو تەگەرەو خەتەرانەی کە لەگێن بوو تۆم تووشیان بێت، کەم دەبوونەوە، و ئەویش سات بە سات ئاسوودەترو دڵنیاتر دەبوو، چونکە دەیبینی کە هەمووان لوتفو مەحەبەتی بەرانبەر دەنوێننو چاوپۆشی لە هەڵەو خەتاکانی دەکەن. کاتێ بۆی مەعلوم بوو کە شازادەخانمەکانیش لە شەوی جەژنی شارەوانی لەندەندا دەگەڵی دەبن، زۆر دڵخۆش بوو، چونکە هەستی کرد کە لەوە بە دوا لە نێو ئەو هەموو بێگانەو نەناسانەدا، بێ دۆستو هاوڕێ نابێت، لە کاتێکا ئەگەر سەعاتێ لەوەپێش پێیان گوتبا لەگینە شازادەخانمەکانی دەگەڵ بن، ئەوەی بە عەزابێکی گەورە بۆ خۆی دەژمارد.

دوو فریشتەکەی نیگابانی تۆم، یانی دوو لۆردەکەی لەمەڕ تۆم، لەوە نارەحەتو نیگەران بوون کە خەڵکانی دی دەهاتنە دیدەنی تۆمو قسەیان دەگەڵ دەکرد. ئەو جووتە هەستیان دەکرد کە لە ڕاستیا وەکو دوو کەشتیوانن و دەیانەوێ کەشتییەکی گەورە لە کەنداوێکی ترسناکەوە تێ پەڕێنن، بۆیە زۆر هەراسانو نیگەران بوونو ئەو ئەرکەی خۆیان بە گەمەی منداڵان نەدەزانی. بە هەرحاڵ وەختێ کە دیداری شازادەخانمەکان کۆتایی هاتو خەبەر هات کە لۆرد گیلفر دادلی بە نیازە تەشریف بێنێ. نەك هەر هەستیان کرد کە ئەو ڕۆژە ئەرکی تەواوی خۆیان ئەنجام داوە، بەڵکو زۆریش ماندوو بوونو ئیدی توانای ئەوەیان نیە ئەم کەشتییە بگێڕنە دواوەو سەر لە نوێ دەست بەم سەفەرە دژوارو ترسناکە بکەنەوە، بۆیە بەوپەڕی ڕێزەوە تۆمیان ئامۆژگاری کرد کە خۆی لەم دیدارە دوور بگرێو داوای بوردن بکات، تۆم–یش بە کەماڵی ئارەزوو بە گوێی کردن. لێ وەختێ شازادەخانم جین گری بیستی کە ڕێگای سەردانی ئەو لۆردە گەنجو جوانەیان نەداوە، تەمی خەمێك نیشتە سەر سیمای دڵفڕێنی.

لەو کاتەدا بێدەنگییەکی قورس، بێدەنگییەك کە لە چاوەڕوانی دەچوو، و تۆم تێی نەدەگەیی، باڵی بەسەر هەمووانداکێشا. تۆم بە نیگایەکی تایبەتی مانای ئەم بێدەنگییەی لە هرتفورد پرسی، و ئەویش ئاماژەیەکی کرد، لێ تۆم حاڵی نەبوو. شازادەخانم ئەلیزابت–ی سەلارو

سەنگین بە لوتف‌و روح سوکیە ئاساییەکەی خۆی وەهانایەوە هات‌و سەری ڕێزی بۆ دانەواندو گوتی:

"برا، بۆمان هەیە لە حوزوری بەرزی تۆ مەرەخەس بین؟"

تۆم گوتی:

"هەڵبەتە، مەیل مەیلی خانمانە، ئەگەر بەخۆتان بتانەوێ دەتوانن بڕۆن، هەرچەندە من ئامادەم چیم لە توانای ناچیزدایە بیدەم‌و لە لەزەتی هاونشینی ئەوان مەحروم نەبم. هەر بژین‌و خودا راوەستاوتان بکات‌و خواتان لەگەڵ."

ئەوسا لە دڵی خۆیدا پێکەنی‌و گوتی: "بەڕاستی خراپ نەبوو کە من سەبارەت بە شازادان‌و گەورە پیاوان کۆمەڵە شتێکم خوێندەوەو زمانی خۆم بە قسەی تەڕو بڕو مجامەلە ئامێزی ئەوان راهێنا."

وەختێ کە شازادخانمەکان لە ژوورەکە وەدەرکەوتن، تۆم هیلاك‌و ماندوو رووی کردە سەرپەرشتیار و شیرەتکارەکانی و گوتی:

"ئایا جەنابی لوردانی موعەزەم دەتوانن بەجێم بڵێن تا بڕۆم لە سوچێکا کەمێ ئیسراحەت بکەم؟"

لورد هرتفورد گوتی:

"ئەمر، ئەمری پایەبەرزە. تۆ دەبێ ئەمریان پێ بکەی، ئەمر لە تۆیەو جێبەجێکردن لەسەر ئێمەیە. هەڵبەتە دەبێ خاوەنشکۆ ئیسراحەت بفەرموون، چونکە ئەمشەو دەبێ سەفەری شار بکەی، بۆیە ئیسراحەت بۆ تۆ یەجگار پێویستە."

تۆم زەنگی لێداو نۆکەرێك وەژوورکەوت. نۆکەرەکە فرمانی وەرگرت کە بڕوات‌و سێر ویلیام هربرت بێنێ. نەجیمزادەی ناڤبری هات‌و تۆم-ی بۆ ژوورێکی تر برد. لەو ژوورەدا، یەکەمین هەوڵی تۆم ئەمە بوو کە بکەوێتە تاقیبی پەرداخە ئاوێك، لێ یەکێك لە خزمەتکارە تایبەتیەکان کە جلێکی لە ئاوریشم‌و مەخمەلی لەبەردا بوو، چۆکی داداو پەرداخێ ئاوی لەسەر سینییەکی زێڕ بۆ ڕاگرت.

یەخسیری ماندوو دوای خواردنەوەی ئاوەکەی لە سوچێکدا ڕۆنیشت‌و ویستی پێڵاوەکانی داکەنێ‌و ژێراو ژێر بە نیگایەکی شەرمنانەوپڕ ئەدەبەوە داوای کرد کە بە تەنێ جێبێڵن، لێ یەکێکی دی لە پێشخزمەتە تایبەتیەکان کە ئەویش جلێکی لە مەخمەل‌و ئاوریشمی لەبەر بوو، چۆکی داداو خێرا دەست پێشکەری کردو پێڵاوەکانی بۆ داکەند. تۆم دوو سێ جاری دیکەش ویستی بەخۆی کارەکانی خۆی بکات، لێ هەموو جارێ خزمەتکارێك خۆی دەگەیاندێ‌و کارەکەی بۆ ئەنجام دەدا، تا ئاقیبەت ناچار خۆی ڕادەستی ئەوان کردو لەبن لێوانەوە بە خۆی گوت:

"بەڕاستی سەیرە! ناکا لە جیاتی من هەواش هەڵمژن."

بەڵێ، تۆم پاش ئەوەی جووتێ نەعلیان لە پێکردو بیجامەیەکی نایابیان لەبەر کرد، ڕاکشا، لێ نەك بۆ وەی بنووێت، بەڵکو تا تاوێك ئیسراحەت بکات، چونکە خەیاڵاتی سەیر بەمێشکی دا دەسوڕایەوەو ژوورەکەش پڕ بوو لە خەڵکی. تۆم هەرچی دەکرد نەیدەتوانی ئەو بیرە پەشێوانە لە

خـۆی بتارێنـێ، چـونکە خـەیاڵات دەسـتبەرداری نـەدەبوو، و هـەروەها نەیـدەزانی بـە چ شـێوەو ڕەوشێك خزمەتکارو پێشخزمەتەکانی بکاتە دەرەوە، بۆیە ئەوانیش لـە ژوورەوە مانـەوەو ئەمـەش مایەی داخ و ناڕەحەتی هەردوو لایان بوو.

دوای ڕۆیشتنی تـۆم، جووتـە لـۆرد بـە تـەنیا مانـەوە. هـەردووکیان ماوەیـەك لـە فکـران ڕاچوون و چەندین جار سەریان لە قاندو بە ژوورەکەدا کەوتنە هاتوچۆ. ئەوسا لۆرد سانت جۆن گوتی:

"ئەرێ جەنابی لۆرد تۆ ئەم وەزعە چۆن دەبینی؟"

"ئەوەی ڕاستی بێ هەتاوی تەمەنی شا لە ئاوابووندایەو خوشکەزاکەی منیش شێتێکی تـەواوە. هەر بەو شێتاتییە دێتە سەر تەخت و بە شێتیش دەمێنێتـەوە. خـوا خـۆی ئینگلستان بپارێزێت، چونکە ئەم وڵاتە پێویستی بە یارمەتی خودایە."

"بەڕاسـتی ڕواڵـەتی کارەکـە وایـە لێ... ئایـا تـۆ گومـان ناکـەی کـە... کـە..." لـۆرد سـانت جـۆن قسـەکەی خـۆی تـەواو نـەکردو هـەر بـەنیوە چڵی هێشـتییەوە، چـونکە بێگومـان هەسـتی دەکـرد دەستی بۆ خاڵێکی هەستیار بردووە. لۆرد هرتفورد لە بەرانبەریا وەستاو بە نیگایەکی ئاشکرا لە سیمای ورد بووەوەو گوتی:

"بڵێ، قسەکەت تەواو بکە، جگە لە من کەسی تر لێرە نیە کە گوێی لـە قسـەکانمان بێت. گومـان ناکەم کە چی؟"

"من لە دەربڕینی ئەوەی لە مێشکم دایە بێزارم، بە تایبەتی لەگەڵ تـۆدا کـە خزمـی نزیکـی ئـەوی. هەڵبەتـە ئەگـەر جەسـارەت و پڕکێشـییەکم لـە ڕووی جـەنابتا کردبـێ داوای بـوردن دەکـەم، بـەڵام لۆردی ئازیز ئایا بە ڕای تۆ سەیر نیە کە شێتی ئەم کوڕە تا ئـەم ڕادەیـە ڕەفتـارو کـردارو خـووی ئەوی گۆڕی بێ؟ ئەمەیان هەر نەیسـە باشـە سـەیر نیـە کـە گوتـارو شـێوەی قسـەکردنی کـە جـاران شاهانە بوو، گۆڕاوەو خوو خەسێتی دەگەڵ جارانا گۆڕابێ؟ ئایا بـەڕای تـۆ سـەیر نیـە کـە شـێتی، یادی بابی، ئەوداب و نەریتەی کە ڕەچاوکردنی لە لایەن ئەوەوە فـەرزە، و تەنانـەت زمـانی لاتینـی، یونـانی و فەرەنسـی لـە بـیر بردبێتـەوە؟ لـۆردی ئـازیزم تکایـە زیـز نـەبی، بـەڵکو هـەوڵ بـدەی کـە خەیاڵی من لەم نیگەرانیانە ئاسودە بکەیت و سوپاسـی نـاخی دڵـم قـەبوڵ بکـەی. مـن ئـەم قسـەیەم زۆر بەلاوە سەیرە کە بۆچی دەڵێت من شازادە نیم و بۆیە..."

"لۆردی ئازیز بەسە، تۆ ئێستا خەریکی تاوانێکی گەورە دەکـەی. مەگـەر دەسـتووراتی خاوەنشـکۆ شات، لەبیر چووە؟ ئەوەش بزانە کە ئەگەر منیش گوێ لە تۆ بگرم، دەبم بە شەریکە تاوانی تۆ."

لۆرد سانت جۆن، ڕەنگی زەرد هەڵگەڕاو بە پەلە گوتی:

"من هەڵەم کردو دان بە تەخسیری خۆدا دەنێم. تکا دەکـەم سـڕم هەڵمەماڵـەو ئـەم بـێ ئەدەبیـەم لێ مەگرە. من جارێکی دی هـەرگیز نـە بـیر لـەم شـتە دەکەمـەوەو نـە باسـی دەکـەم. جـەنابی لـۆرد لـێم ببورە دەنا تیا دەچم."

زۆر چاکە جەنابی لۆرد، ئەوا لێت بورام. چونکە بـەڵێنت دا جـارێکی دی نـە لێرەو نـە لـە دەرێـی ئێرە هیچ شتێ نەڵێیت و هیچ قسـەیەکت لـە زار نەیەتـەدەر. مـن وای دادەنـێم کـە گـوێم لـەو قسـانە نەبووە. بەڵام دڵنیابە کە هیچ گومانێك لەم شتەدا نیە، ئەو خوشـکەزای منـە. لـە منداڵییـەوە گـوێم

بە تۆنی دەنگ‌و چاوم بە سیماو سەرو چاوی راهاتووە. هەڵبەتە شێتی بۆی هەیە گۆڕانی گەورەو سەیر تەنانەت گەورەترو سەیرتر لەوەی تۆ لەم کوڕەیدا دەبینی، لە ئینساندا دروست بکات. مەگەر (بارۆن مرلی) پیرە مێردت لە بیر نەماوە کەشێت بوو، لە ئەنجامی شێتییەکەیدا، شێوەی دەموچاوی خۆیشی کە شەست دانە ساڵ بوو لەگەڵیا دەژیا، لە بیر کردو وایدەزانی کە ئەو کەسێکی ترە؟ بارۆنی پیر تەنانەت ئیدیعای ئەوەی دەکرد کە کوڕی حەزرەتی مریەمەو سەری شوشەی ئەسپانیایی دروستکراوەو دەیگوت ئەگەر کەسێك دەست لە سەری بدات نایەشێت، لێ لەگینە بشکێ. بە هەرحاڵ گومان‌و دوو دڵی لای خۆت بسڕەوە: ئەمە هەمان شازادەی راستەقینەیەو من زۆر چاکی دەناسم. بەزووترین کات دێتە سەر تەختی پاشایەتی. ئەوەی کە پێویستە لە مێشکی تۆدا بچەسپێ ئەمەیە کە بەم زووانە دەبێت بە پاشاو جگە لەمە ئیدی باوەڕ بە هیچ شتێکی دی مەکە."

بەڵێ، دوای گفتوگۆیەکی زۆر کە لۆرد سانت جۆن هێندەی توانی هەڵەکەی خۆی پەردە پۆش کردو لێکدا لێکدا دەیگوت‌و دەیگوتەوە کە دوودڵی‌و گومانەکەی بە تەواوی ڕەوییەوەو ئیدی هەرگیز گومان‌و دوو دڵیم لەو بارەیەوە لا چێنابێت. لۆرد هرتفورد لۆرد سانت جۆنی لە خزمەت مەرەخەس کرد، هەر خۆی بە تەنێ بۆ پاراستن‌و چاودێری شازادە مایەوە. زۆری نەبرد کە لۆرد هرتفورد کەوتە گێژاوی بیرێکی قوڵەوەو دیاربوو تا پتر لەفکران ڕاچوو پتر نا رازی بوو. ئەنجام بەژوورەکەدا کەوتە هاتوچۆو لەبن لێوانەوە بەخۆی گوت:

"نا، نەخێر، هەر دەبێ شازادە خۆی بێت، باشە دەشێت کە لەم مەملەکەتەدا منداڵێکی دیکە لە خوێن‌و رەسەنێکی دیکە پەیدا بێ‌و تا ئەم ڕادەیە لە شازادە بچێت؟ باشە گریمان منداڵێکی دیکەی لەو شێوەو هەیئەتە هەبێت، ئاخر بە چ موجیزاتێك دەبێ دەستی تەقدیر ئەوی خسبێتە جێی شازادە؟ نا، نەخێر، ئەم بیرە شێتایەتیە. شێتایەتیە. شێتایەتی، شێتایەتی."

ئەوجا گوتی:

"ئێستا ئەگەر ئەم کوڕە داگیرکەر بوایەو خۆی بە شازادە زانیبا، زۆر ئاسایی بوو کە بڵێین شازادەی راستەقینە نیە، بەڵام کەسێك کە خودی خاوەنشکۆ پاشا، بە شازادەی دەزانێت‌و هەر هەموو دەست و پێوەندو دەرباریبان بە شازادەی بانگ دەکەن‌و هەموو خەڵکیش بەم پایەو لەقەبەی ئەو قایلن، کەچی بەو حاڵەشەوە ئەو نکوڵی لە ئەسڵ‌و فەسڵی خۆی لە پایەو لەقەبی خۆی دەکات، ئاخر ئەمە چ مانایەکی هەیە؟ نا، نەخێر قەسەم بەروح‌و گیانی سەنت سویتین، خودی شازادەیە، لێ شێت بووە!"

"٧"

## یەکەمین فراڤینی شاهانەی تۆم

سەعات یەك‌و چەند دەقیقەیەکی پاش نیوەڕۆ بوو کە تۆم بە ناچاری رازی بوو تا بۆ فراڤین جلکی تایبەتی لەبەربکەن. تۆم سەیری کرد کە جلە تازەکانی وەکو جلەکانی پێشووی نایاب‌و جوانە، لێ هەموو شتێکی لە یەخەیەوە بیگرە تا گۆرەویەکانی لە جلەکانی پێشوی جیاوازە.

یەکسەر بۆ ژوورێکی گەورەو رازاوەیان رێنوێنی کرد کە مێزێکی لە ناوەندا بووو بەشی یەک نەفەر قاپیان لەسەر ئەو مێزە دانابوو. قاپ و چەقۆو چەتاڵ و هەموو پێویستییەکانی دیکەی ئەو لە زێڕی خالیسە بوو، و بەنەخش و نیگاری زۆر جوان نەخشێنرا بوون، و ئەم نەخش و نیگارانە هێندەی دی بە هاداریان دەکردن، چونکە نەخش و نیگارەکان دەستکردی هونەرمەند (بیتڤینوتو) بوون. نۆکەران و خزمەتکارانی تایبەتی نیوەی ژوورەکەیان پڕ کردبوو. کەشیش دوعای خوێندو تۆم خەریك بوو لە برساندا بەربێتەوە، چونکە لە مێژ بوو هیچی نەخوارد بوو، لێ لەم کاتەدا لۆرد برکلی گرتی و بەروانکەیەکی لە سینەو بەرۆك بەست. چونکە ئەرك و وەزیفەی گەورەی بەروانکە بەستن بە سینەو بەرۆکی شازادانەوە، بە میرات بۆ خێزان و ماڵباتی ئەو مابووەوە. ساقییەکەی تۆم–ش لەوێ ئامادە بووو ئەرکی ئەویش چەشتنی شەرابی شازادە بوو. (پێش مەرگی) پایە بەرز وەلیعادیش لەوێ بووو ئامادە بوو لە کاتی پێویست دا هەر خواردنێك کە گومانی لێکرابا بچەژێت و بەر لەوەی وەلیعاد ژەهراوی ببێ، خۆی ببێ بە پێشمەرگی ئەو. کاری وی لەو رۆژگارەدا، زیاتر تەشریفاتی و رواڵەتی بووو بەدەگمەن رێدەکەوت کە پێشمەرگ وادار بە چەشتنی خۆراك بکەن، بەڵام پێشتر، واتە چەند نەوەیەك پێشتر، کاری پێشمەرگی بە کارێکی زۆر گرنیگ و پڕ خەتەر دەژمێردراو هەموو کەسێك حەزی لێ نەدەکرد. هەڵبەتە سەیر ئەمەیە کە بۆچی بۆ ئەم کارە سوودیان لە سەگ نەدەبینی، یانی بۆچی سەگیان بەکار نەدەهێنا. یان لەبەر خاتری جەماعەتێك قاپی خواردنەکانیان نیشانە نەدەکرد. لێ بە هەرحاڵ هەموو کارو کردەوەیەکی پاشایان عەجیب و غەریبە.

جەنابی لۆرد دارسی، خزمەتکارباشی و ئەندامی ئەنجومەنی پیاو ماقولانیش لەوێندەر بوو، لێ جگە لە خودا کەس نەیدەزانی کە کاری ئەو لەو ژوورەدا چیەو بۆ ئێمە ئەوەندە بەسە کە بزانین ئەویش لەوێ بوو. لۆرد بەرپرسی ئابدارخانەش لەوێ ئامادە بووو لە پشت کورسییەکەی تۆم–ەوە وێستا بووو رێو رەسم و تەشریفاتی پێویستی بە چاودێری لۆرد ئاشپەزباشی کە هەردووکیان لەو نزیکانە وەستا بوون بەرپا دەکرد، تۆم جگە لە مانە سێ سەدو هەشتاو چوار نۆکەرو خولامی دیکەی هەبوو، لێ ئەو ژمارەیە هەموویان لەو ژوورەدا نەبوون و تەنانەت جێگەی چواریەکیانیش نەدەبووەوە و ئەمە جگە لەوەی کە تۆم هەر ئاگای لەم هەموو نۆکەرو خولامانە نەبوو.

هەر هەموو ئەو کەسانەی کە لەوێندەر بوون. تەعلیم درابوون و ئاگادار کرا بوونەوە کە شازادە دووچاری شێتی کاتی بووەو دەستوریان پێدرابوو کە ئاگادار بن و بە هیچ جۆرێ سەریان لە دیتنی شێتبازیەکانی ئەو سوڕ نەمێنێ و هیچ کاردانەوەیەك نەنوێنن. بەڕیکەوت شێتبازیەکانی شازادە لە حوزوری ئەوان دا دەستی پێکرد، لێ ئەوان تەنیا داخ و کەسەری خۆیان دەربڕی و بە هیچ جۆرێ حیرەت و سەرسامیان نەنواند. زۆریان لەبەر گران بوو کە شازادەی ئازیزی خۆیان بەو پەشێوی و پەرێشانییە دەبینی.

تۆمی بەلەنگاز بە دەست خواردنی دەخوارد، لێ کەس وای نەدەنواند کە ئاگای لەم کارەیە. زۆر بە وردیو بەدیقەت کەوتە سەرنجدانی بەروانکەکەیو کە بینی لە پارچەیەکی زۆر ناسكو جوانو گرانبەها دروسکراوە، بەوپەڕی سادەییو ساکاری گوتی:

"تکایە ئەم بەروانکەیە هەڵگرن، دەترسم بەدەم خواردنەوە ئاگام لێ نەبێو پیس ببێت."

ئەو کەسەی کە بەروانکە لەمل بەستنی وەلیعادی بە میرات بۆ مابووەوە بەوپەڕی نەزاکەتو ڕێزو حورمەتەوە هاتە پێشێو بێ ئەوەی هیچ قسەیەك بکات، یان نارەزاییەك دەربڕێ، بەروانکەکەی لەملی داکەند.

تۆم بە وردی روانیە ئەو شەلەمو کاهووەی کە لەسەر مێزی نانخواردنەکە دانرا بوو، و پرسی کە ئەمانە چینو ئایا دەخورێن یان نا. هۆی ئەم پرسیارە ئەمە بوو کە خەڵکی ئینگلیستان تازە کەوتبوونە چاندنی شێلمو کاهو لە وڵاتی خۆیانداو ئیدی بەشێوەی جاران وەکو خۆراکێکی تەشریفاتیو دەوڵەمەنانە لە وڵاتی هۆڵەنداوە هاوردەیان نەدەکرد. بە ڕێزو نەزاکەتەوە وەڵامی پرسیارەکەی تۆم-یان دایەوەو کەسیش سەرسامی دەرنەبڕی. کاتێ تۆم لە خواردنی میوەی پاش فراڤین بووەوە، بەرکەکانی خۆی لە گوێز پڕکرد، لێ کەس خۆی لەم کارەی ئەو نەکرد بە ساحێبو نیگەرانیو نارەحەتی دەرنەبڕی. پاش تۆزێك تۆم بە خۆی لەم کارەی خۆی نارەحەت بووو نیگەرانی خۆی نیشان دا، چونکە ئەمە تەنیا کارێك بوو کە ئەو لە کاتی خواردندا، بە دەستی خۆی ئەنجامی دابووو هیچ گومانێکی لەوە نەبوو کە کارێکی دزێوو نابەجێو پێچەوانەی نەزاکەتو دابو نەریتی دەرباری کردووە. لەم کاتەدا پەڕەی کەپووی تۆم کەوتە لەرزینو سەری کەپووی کەوتە خورو. ئەم حاڵەتە درێژەی کێشاو تۆم زۆر نارەحەت بوو. بەسەزمانە بەنیگایەکی پاڕانەوە ئامێزەوە روانیە یەك بەیەکی لۆردە بۆشناخەکانی دەوروبەریو روندك لە چاوانی قەتیس ما. لۆردەکان بەهشتاو لێی چوونە پێشەوەو بەدەم پەشۆکانو نیگەرانیەوە هۆی ئەو حاڵەیان لێ پرسیو تۆم بە ترسو لەرزەوە گوتی:

"ئاغایان لوتفو کەرەم بکەن، لووتم زۆر دەخورێ. نازانم ڕێوو رەسمو عادەتی ئێوە لەم جۆرە حاڵانەدا چیە. هەرچیەك هەیە تکایە زوو فریام بکەونو دەست بەکاربن، چونکە لەوەی پتر تەحەمولی ئەم خرووە ناکەم."

بزە نەکەوتە سەر لێوی هیچ کەسێك. هەموو شپرزەو دەسەپاچەو حەیران دەیانڕوانییە یەکدیو چارەی ئەم کارەیان لە یەکتر دەپرسی. لێ مەسەلەکە زۆر ئاڵۆز دەهاتە بەرچاو، چونکە لە سەرانسەری مێژووی ئینگلیستاندا تاقە ئاماژەیەك نەبوو بۆ ئەوەی کە لەمجۆرە حاڵەتانەدا دەبێ چ بکرێ. سەرۆکی تەشریفات لەو کۆڕەدا ئامادە نەبووو کەسیش نەبوو زاتی ئەوە بکات پێ بخاتە ئەم دەریای پڕ ئاشوبەوە، یان بتوانێ ئەم کێشە دەگمەنو ئاڵۆزە چارەسەر بکات. حەیفێ! کەسیش نەبوو کە ئەركو وەزیفەی خوراندنی کەپوی وەلیعادی بەمیرات، و لە بابەل بابەوە بۆ مابێتەوە! لە ماوەی ئەم چەند دەقیقەیەدا فرمێسك لە چاوانی تۆم هاتبووە خوارێو بەسەر گۆناکانیا دەرژا. کەپووی هێشتا هەر زۆر دەخوراو دەبوایە بەزووترین کات چارەیەك بۆ ئەو کێشەیە وەدۆزرێ. ئاخری فەرمانی تەبیعەت، بەر بەستی دابو نەریتو تەشریفاتی تێك

شکاند، یانی تۆم داوای بوردنی کرد کە گەرەکیەتی کارێکی پێچەوانەی یاساو ڕێساو قەراراتی دەرباری بکاتو بە دەستی خۆی کەوتە خوراندنی لووتی،و بەمەش سوکنایی‌و ئارامی بەدڵی پەشێوو پڕخەمی دەرباریان بەخشی.

دوای نانخواردن، یەکێك لە لۆردە بەرێزەکان بە تەشتێکی زێڕینی پانو پەلەوەو بەگوڵاودانێکەوە وەژوور کەوت تا دەستو دەمی شازادە بشوات. لۆردێکی خاولیداریش، خاولییەکی پاکی بەدەستەوە بووو لەو نزیکانە وەستابوو. تۆم بۆ چەند ساتێك حایرو سەرسام روانیە ئەو تەشتە زێڕینە. ئەوسا بەرزی کردەوەو قومێك لە ئاوەکەی ناوی خواردەوەو ئەوسا تەشتەکەی دایەوە دەست جەنابی لۆردو گوتی:

"جەنابی لۆرد، ئاوێکی ناخۆشە. بۆنی خۆشە، لێ تامی خۆش نیە."

ئەم رەفتارە تازەیەی شازادە کە رەنگدانەوەو نیشانەی شێتایەتی ئەو بوو، دڵی هەموو ئامادەبووانی خەمبار کرد، لێ کەس سەرسامی لەمەڕ ئەم دیمەنە بەزەیی وروژێنە نیشان نەدا. یەکێك لە رەفتارەکانی دیکەی تۆم ئەمە بوو کە بەوپەڕی خەمساردی‌و بێ موبالاتیەوە، لە کاتێکا کە کەشیشەکە لە پشت کورسیەکەی ئەوەوە وەستا بوو،و چاوانی لێك نابووو دەستی نابوونە ناو یەکدی‌و دەیویست دوعاونزا بخوێنێ، تۆم لە پڕ لە پشت مێزی خواردنەکە هەستاو رۆیی. ئەمجارەش کەس گوێی بەوە نەدا کە شازادە کارێکی نا ئاسایی‌و پێچەوانەی نەزاکەتو ئەتەکێتی باوی کردووە...

هاورێ چکۆلەکەمان لەسەر داوای خۆی برا بۆ ژوورە تایبەتیەکەی خۆی‌و لەوێ بە تاقی تەنیا بەجێیان هێشت. کۆمەڵێك پارچەی جیاوازی دەستێك جلی جەنگی کە هەر هەمووی لە پۆڵای مشتو ماڵدراو بوو وبە زێڕ نەخش و نیگاری جوانی لەسەر نەخشێنرابوو، بە عەلاگەیەکی دار بەرووەوە هەڵواسرا بوو. ئەم جلە جەنگییە هی شازادەی راستەقینە بوو،و دیاری شابانۆ، دایکی بوو کە تازە پێشکەشی کردبوو. تۆم لە پێشا بەلەك پێچەکانو دەستکێشەکانو کڵاوخودە پەر لەسەرەکە و هەموو ئەو پارچانەی دی کە دەیتوانی بەبێ کۆمەکی خەڵکی لەبەر بکات، لەبەر کرد. ئەوجا کەوتە بیری ئەوەی کە نۆکەرەکانی گاز بکاتو پارچەکانی دیکەی جەنگەوزارەکانی لەبەر بکەنو جلە جەنگییەکە بە تەواوەتی لەبەر بکات. لێ لە پڕ ئەو گوێزانەی بیرکەوتەوە کە لەسەر خوانەکەی هەڵگرتبوونو لە بەرکی نابوون،و لە دڵی خۆیدا بەوە خۆشحاڵ بوو کە دەتوانێ بێ ئەوەی هیچ کەسێك چاو ببڕێتە دەستو دەمی ئەو،و بێ ئەوەی هیچ یەکێك لە لۆردە بۆشناخەکان بە عەرزی خزمەتی نابەجێ بێزاری بکات، دابنیشێتو بە کەماڵی ئیسراحەت گوێزی خۆی بخوات. بۆیە پارچە جوانەکانی جلکە جەنگییەکەی لە شوێنی خۆ دانانەوەو بەر بووە گوێز شکاندنو خواردن، هەستی کرد لەو رۆژەوە کە خودا ئەوی لە سزای تاوانەکانیا گۆڕیوەو کردویەتی بە شازادە، ئەمە یەکەمجارە کە شادی‌و خۆشی ئاسایی بەخۆیەوە ببینێ. کاتێ تۆم لە خواردنی گوێز بووەوە سەیری کرد چەند کتێبێك لەسەر رەفەیەك ریزکراوە، دەستی بردو یەکێکیانی دەرهێنا، ئەم کتێبە دەربارەی دابو نەریتو رێورەسمی ئینگلیستان بوو. ئەم کتێبە بۆ ئەو دیارییەکی پڕ بەهابوو. تۆم لەسەر مۆبیلەیەکی جوانو رازاوە ڕاکشاو زۆر

بەجدیو ئەڵهاوە کەوتە خوێندنەوەو فێربوونی نێوەرۆکی ئەو کتێبە. با جارێ ئەو بەوحاڵەوە بەجێ بێڵین.

"٨"

مەسەلەی تەمغەکە

نزیکەی سەعات پێنجی دوا نێوەڕۆ بوو کە هنری هەشتەم لە خەوێکی ناخۆش ڕابوو، و لەبن لێوانەوەو لەبەر خۆوە گوتی:

"پەح کە خەوێکی ناخۆشم بینی! ناخۆش ئەمما ناخۆش! هەتاوی عومرم روو لە ئاوابوونە. هەموو نیشانەکان ئەوە دەگەیەنن و نەبزی دڵیشم هەروا دەڵێت." ئەوسا لە پڕ چاوەکانی بە ئاستەم پرشنکیان داو لەبن لێوانەوە گوتی:

"نا، نەخێر، تا ئەو نەمرێت من نامرم."

گاردەکانی کە دیتیان شا هەستاوە، یەکێکیان لە خۆیان بۆ ژوورەوە نارد تا مۆڵەتی چوونە ژوورەوە بۆ سەرەك وەزیران کە بە نیازی سەردانی شا بوو، وەربگرێت.

خاوەنشکۆ بە روو گرژی گوتی: پێی بڵێن با بێتە ژوورەوە، بێتە ژوورەوە!"

سەرەك وەزیران وەژوورکەوت، لە بەرانبەر تەختە خەوەکەی شادا چۆکی داداو گوتی:

"قوربان، بە گوێرەی فەرمانی خاوەنشکۆتان فەرمانم بە ئەندامانی ئەنجوومەن، کە نهو بە جلکی رەسمییەوە لە پەرلەمان کۆبوونەتەوە،دا تا دۆك نورفولك-یان حوکم داو ئێستاش چاوەڕوانی فەرمانەکانی دیکەی خاوەنشکۆتانن."

شادییەکی دڕندانە نیشتە سەر سیمای شاو گوتی:

"هەڵم بستێنن! دەبێ بەخۆم بچم بۆ ئەنجومەن و بە دەستی خۆم حوکمێك مۆر بکەم کە من لەشەڕی..."

دەنگی شا خاوبووەوەو رەنگی هەڵبزڕکاو سووری لە رووی بڕا. گاردەکانی بە پەلە لەسەر جێگاکەی پاڵیان خستو بەلەز دەرمانێکی قوەتبەخشیان دایە.

شا لە پڕ بە دەنگێکی خەمناك گوتی:

"ئەفسوس! زۆر لە مێژ بوو چاوەڕوانی ئەم ساتە خۆشەم دەکرد! حەیفێ کە ئەم ساتە زۆر درەنگ هاتو من لە لەزەتی ئەو ساتە مەحروم بووم! بەڵام تۆ خێرا بکەو فەرمان بدە تا ئەم کاری خێرەی کە من نەمتوانی ئەنجامی بدەم خەڵکانی تر ئەنجامی بدەن. من مۆری دەکەم کە لیژنەیەك بۆ جێبەجێکردنی ئەم کارە پێکبهێنرێ. تۆ ئەندامانی ئەم لیژنەیە لە نێو لۆردانی بەرێزدا هەڵبژێرەو یەکسەر دەست بەکاربن. دەی لەزێ بکەن! دەبێ هەر ئەمشەو سەریم بۆ بێنن و بەچاوی خۆم بیدینم."

سەرەك وەزیران گوتی:

"فەرمانی شا یاسایە، ئەمرەکەن، ئایا دەکرێ خاوەنشکۆ ئەمر بفەرموون کە مۆرو تەمغەی پاشایەتیەکەم وێدەن تا من کارەکە ئەنجام بدەم؟"

"تەمغە؟ ئەدی لای تۆ نیە؟"
"قوربان، پێرێ خاوەنشکۆتان لێت وەرگرتم‌و فەرمووت کە تا بە دەستی خۆتان فەرمانی مەرگی دۆك نورفولك مۆر نەفەرموویت، نابێ بۆ هیچ کارێکی دی بەکاربهێنرێ."
"بەڵێ، بەڵێ، ڕاستە، هەنوکە بیرم کەوتەوە.. بەڵام چیم لە تەمغەکە کرد؟... من زۆر نەخۆشم... بیرم پەریشان‌و پەشێو بووە‌و ناچمەوە سەری... بەڕاستی سەیرە... زۆر سەیرە!"
شا، بەو دەقەوەو لە بن لێوانەوە درێژەی بە ورتە ورتە نا مەفهوومەکەی خۆی دەداو جار جار سەرە لاوازەکەی دەلەقاندو هەوڵی دەدا تا بەڵکو بیری بکەوێتەوە کە چی لە تەمغەو مۆری پاشایەتیەکە کردووە. ئاقیبەت لۆرد هرتفورد، لەبەر پێی شادا چۆکی داداو گوتی:
"ئەزبەنی، ئەگەر مۆڵەتم بدەی، عەرزی جەنابی باسەعادەتت بێ کە من‌و چەند کەسێکی دی لە دەرباریان چاکمان لە بیرە کە خاوەنشکۆتان تەمغە گەورەکەتان بە دەستی پایەبەرز وەلیعاد سپاردو فەرمووتان هەڵی بگرێت تا ڕۆژێ..."
شا، قسەکەی پێ بڕی‌و گوتی:
"دروستە، زۆر تەواوە! ڕاکەن بە دووی تەمغەکەدا، خێراکەن کات دێرە."
لۆرد هرتفورد بەغار بەرەو ژوورەکەی تۆم ڕۆیی‌و زۆری نەبرد کە هەراسان‌و شپرزەو پەشۆکاو، لێ بە دەستی بەتاڵ گەڕایەوەو بەمجۆرە عەرزی شای کرد کە:
"ئەزبەنی، زۆر بەداخەوەم کە ئەم خەبەرە ناخۆشە دێنمە حوزوری خاوەنشکۆتان، لێ چ دەکرێ کە ویستی خوا ئەمە بێ، نەخۆشییەکەی پایەبەرز وەلیعاد وەکو خۆیەتی‌و بیری ناکەوێتەوە کە تەمغەو مۆرەکەی لە دەستی خاوەنشکۆ وەرگرتبێ. لەبەر ئەمە بوو کە بەندەی گیان فیدا بە پەلە گەڕایەوە تا هەواڵی شتەکە بە حوزوری موبارەکتان بگەیەنێ‌و بیری کردەوە کە ئەگەر هەموو ژوورو هۆڵەکانی پایەبەرز بگەڕێ لەوەیە کاتەکە بەبێهودە بەفیڕۆ بڕوات‌و هیچ بە هیچش نەکات‌و..." لێرەدا شا ئاهێکی قووڵی هەڵکیشاو قسەکەی لۆرد هرتفوردی بڕی. خاوەنشکۆ دوای چەند دەمێك بە دەنگێکی پڕ ئازارو خەمناکەوە گوتی:
"ئەم منداڵە بەلەنگازە لەوەی پتر عەزاب مەدەن، دەستی قورسی خودا بەر تەپڵی سەری کەوتووە. زۆر دڵم پێی دەسووتێت‌و زۆر بە داخەوەم کە ناتوانم باری نەگبەتی ئەو بخەمە سەرشانی بێ تواناو مەینەتباری خۆم‌و لەم خەم پەژارەو دەردو مەینەتەی رزگار بکەم."
شا، چاوەکانی لێك ناو کەوتە ورتە ورت‌و پاشان لە پڕ مت‌و بێدەنگ بوو. دوای ماوەیەك چاوی کردەوەو نیگایەکی وشك‌و مردووی دەوروبەری خۆی کردو چاوی بە لۆرد سەرەك وەزیران کەوت کە بەهەمان دەقەوە لە پای تەختەکەی ئەودا چۆکی دادا بوو. پاشا، لە پڕ تووڕە بوو، ڕەنگی سوور هەڵگەڕاو گوتی:
"چیە! تۆ هێشتا لێرەیت! قەسەم بە عیزەتی خودا ئەگەر کاری ئەو خیانەتکارە تەواو نەکەی، سبەی ئەم وەختانە سەرت نابێ کە کڵاوی سەرەك وەزیرانی لەسەر بنەی."
سەرەك وەزیران بە ترس‌و لەرزەوە گوتی:
"خاوەنشکۆ، ئەزبەنی ببورە! من چاوەڕوانی تەمغەکە بووم."

"کابرا، مەگەر شێت بووی! ئەو مۆرە چکۆلەیەی کە جاران بە زۆری دەگەڵ خۆدا هەڵمدەگرت لە گەنجینەکەدایە. ئێستا کە تەمغە گەورەکە دیار نەماوە، ئایا ئەو تەمغە بچووکە بۆ ئەم کارە بەس نیە؟ ئایا بە ڕاستی شێت بوویت؟ دەی بڕۆ، لە زێکەو تا سەری ئەو دەگەڵ خۆدا نەیەنی بۆ لای منن نەگەڕێتەوە."

سەرەك وەزیرانی بێچارە بە پەلە رۆیی و لەو شوێنە ترسناکە وەدەرکەوت. ئەنجوومەنی پاشایەتیش بێ ئەوەی کات بەفیڕۆ بدات، فەرمانی شاهانەی بۆ پەسند کردن دا بە ئەنجوومەنی ئەڵقە لە گوێی ئینگلیستان و بڕیاری ئیعدامی گەورە نەجیمزادەو لۆردی مەزنی ئینگلیستان، واتا لۆرد نورفولك ی بەدبەخت و نەگبەت، خرایە سبەینێی ئەو رۆژە.

((٩))

## ڕێورەسمی جەژن و ئاهەنگی کەناری روبار

لە سەعات نۆی شەودا، بەشێك لە کۆشکی پاشایەتی کە بەرانبەر روبارەکە بوو، بوو بە چراخانێ ئەو سەری دیار نەبێ. روبارەکەش تا چاو هەتەری دەکرد پڕ بوو لە قەیاغ و بەلەمان کە خەڵکی بۆ گەشت و گەڕان بەکاریان دێنا، و هەر هەمووش چرای رەنگا و رەنگیان هەڵکردبوو و هێدی و هێمن بەسەر شەپۆل و پێلی روبارەکەوە دەجولان، دەتگوت باخێکی گەورەو بەرینی پڕ لە گوڵی جوان و رەنگا و رەنگەو بەدەم نەرمەباو شنەی سازگاری هاوینەوە، بەکاوەخۆ دەڕەقسێ. دالان و ڕاڕەوێکی گەورە کە قالدرمەکانی تا ناو روبارەکە دەڕۆیی، بەڕادەیەك گەورە بوو کە جێی لەشکری یەکێك لە شازادە ئەڵمانیەکانی تیا دەبووەوە. ئەم دالان و ڕارەوە بەریزی نێزەدارانی شاهییەوە کە زرێی بریقەداریان لەبەر کرد بوو، و بە ئاپۆرای گاردو نیگابان و خزمەتکارانەوە کە جلکی رەنگا و ڕەنگیان لەبەر کرد بوو، و بەردەوام لە جم و جۆڵدا بوون و هەڵدەسوڕان و هەورازو نشێویان دەکردو بە پەلە خەریکی ئامادەکردنی تەدارەکی ئاهەنگ و جەژن بوون، هەموو ئەمانە دیمەنێکی یەکجار جوان و سەرنجڕاکێشیان هەبوو.

لە پڕ فەرمانێك دەرچووو یەکسەر دوای فەرمانەکە زیڕوح بەسەر قالدرمەکانەوە نەما. خەڵکی بەدەم چاوەڕوانی و تاسەوە هەناسەیان لەخۆ بڕی بوو. تا چاو بڕی دەکرد دیار بووکە خەڵکی لە نێو قەیاغ و بەلەمەکانەوە هەستاونەتە سەر پێیان و بۆ پاراستنی چاوی خۆ لە تیشکی چراو مۆم و فانۆسان، دەستیان کردوە بە ساباتی چاویان و بەرەو کۆشکەکە هەڵدەڕوانن.

تاقمە بەلەمێك، کە چل پەنجا بەلەمی گەورە دەبوو، بەرەو قالدرمەکان هاتنە پێشێ. بۆدی هەموو بەلەمەکان بە شێوەیەکی یەکجار رازاوە زێڕکاری و پاش و پێشیان کەندەکاری کرا بوو. هەندێکیان بە ئالا و بەیداخی گەورەو بچووکی جوان رازابوونەوە، هەندێکیان بە نەواری زێڕین و بە قاڵیچەێن کە نیشانەو ئارامی پاشایەتیان پێوە دورا بوو رازابوونەوەو هەندێکیشیان ئالای ئاوریشمیان پێوە بوو کە زەنگوڵەێن وردی زیوینیان پێوە هەڵواسی بوون و کە شنە بایەکی سازگار دەیجولاندن ئاهەنگێکی مۆزیکی خۆش و دڵنەوازیان لێ هەڵدەستا. چەند قەیاغێکی گەورەی دیکە کە هی نەجیبانی دەرەجە یەك و گاردو پاسەوانی وەلیعاد بوو، بە بەیداخی رەنگاو

ڕەنگەوە کە ئارمو نیشانەی خانەوادەیی و ئەسڵ و ڕەسەنی خاوەنەکانیان بوو وەستابوون. هەر یەکێك لەم قەیاغانە لە لایەن بەلەمو قایەخی دیکەوە ڕادەکێشران. لە ناو هەر یەکێك لەم قەیاغانە جگە لە سەوڵەوانەکان، دەستەیەك سەرباز بە کڵاوخودی بریقەدارو جەوشەن و زرێی پولاییینەوە، لەگەڵ دەستەیەك مۆزیکوانانـدا دانیشتبوو. پێشەنگی کاروان کە بریتی بوو لە دەستەیەك تەورزیندار، لە هەنبەر دەروازەی گەورەی کۆشکدا دەرکەوت. پانتۆڵی ئەم دەستەیە، بریتی بوو لە قوماشێکی موقەلەمی ڕەشو زەرد. هەموو کڵاوی مەخمەلیان لەسەر بوو کە بە داوی زیوین نیگاری گوڵەباخیان لەسەر قەراخەکانیان چنی بووو سەرو چاکەتی سوری تۆخی مەیلەو شینیان لەبەر بوو، و لە پاشو لە پێشەوە نەخشی سێ پەڕیان پێوە بوو کە بە نیشانەو ئارمو ڕەمزی تایبەتی وەلیعاد دەژمێردراو هەر سێ پەڕەکەیان بە داوی زێرین چنی بوو. دەسکی تەورزینی ئەم سەربازانە بە مەخمەلی ئەرخەوانی پۆشرا بوونو ئەم مەخمەلەیان بە پەرچی زێرین لەسەر دەسکی تەورزینەکان داکوتا بووو گوڵینگەی زێریان پێوە هەڵواسی بوو. سەربازەکان چەپو ڕاستی دالانو ڕاڕەوەکەیان گرتو دوو ڕیزی درێژیان پێکهێنا کە لەبەر دەروازە گەورەکەی کۆشکەکەوە تا گوێی ئاوی ڕوبارەکە دەڕۆیی. پاشان نۆکەرانو خزمەتکارانی تایبەتی کە جلکی ئەرخەوانیو زێرینیان بە نیشانەی وەلیعادەوە لەبەردا بوو، مافورێکی موقەلەمیان لە بەینی ئەو دوو ڕیزە سەربازەدا ڕاخست. پاش تەواوکردنی ئەم ڕێو ڕەسمو تەشریفاتە، لە هەموو لایەکەوە دەنگی شەیپوران بەرز بووەوە. ئاهەنگی مۆسیقایەکی دڵنوازیش لە گروپی مۆزیکوانانی ناو ئاوەکەوە گەییە گوێ، و دوو پێشخزمەت کە سەرو دارعاسای سپیان بە دەستەوە بوو، بە هەنگاوی سووكو بتەوەوە لە دەروازەی کۆشك هاتنە دەرێ. لە دوای ئەوانەوە ئەفسەرێك هات کە دارعاسای پاشایەتی هەڵگرتبوو، و ئەفسەرێکی دیکە لە دوای ئەوەوە بوو کە شمشێری شاری لەندەنی هەڵگرتبوو، پاشان چەند گروبانێکی گاردی شار بە هەموو تەدارەکێکەوە هاتنە دەرێ کە نیشانانیان بەسەر قۆڵەوە بوو. لە دوای هەموو ئەوانەوە حەرس باشی شا کە لە دەستەی سوارەی بەر پرسی بەستنی زەنگاڵ و گۆرەوی بوو، لە جلو بەرگێکی کورتی بێ قۆڵدا پەیدا بوو. دوای ئەو کۆمەڵێك لە نەجیبانی ناسراو بە شاسوارانی گەرماو کە هەر یەکەو نەوارێکی سپیان بەسەری قۆڵیانەوە دروبوو هاتن. پاشان مەیتەرەکانیان هاتن. پاشان قازیو دادوەرانی شار بەجبەی سوورو کڵاوە تایبەتیەکانی خۆیانەوە پەیدا بوون. لە دوای ئەوان لۆردی پایە بەرز سەرەك وەزیرانی ئینگلیستان بە جلێکی سوری هاودامانی پێش ئاوالاوە کە بە فەروی سمۆرە یەخە دۆزی کرابوو، پەیدا بوو. ئەوسا دەستەیەك لە ڕاوێژکارانو شیرەتکاران بە جلکی سوورەوەو پاشان جماعەتێك لە سەرانی دایەرە جۆراو جۆرەکان بە جلکی فەرمییەوە پەیدا بوون. ئەوسا دوانزە کەس لە نەجیمزادانی فەرەنسی پەیدا بوون کە جلو بەرگی ڕازاوەیان لەبەر بوو، جلەکانیان بریتی بوو لە چاکەتی ئاوریشمینی سپی، پەراوێز زێرچنو عەبایەکی مەخمەلی ئەرخەوانی، پەراوێز چنراوی وەنەوشەییو چەکمەی سوور، و هەر هەموویان لە قاڵدرمەکانەوە داگەڕان، ئەم نەجیمزادانە گاردو هاورێیانی سەفیری فەرەنسا بوون، لە دووی ئەوانەوە دوانزە کەس لە سوارانی موحتەرەمو بەرێز کە لە گاردو هاورێیانی سەفیری

ئەسپانیا بوون، پەیدا بوونو جلەکانیان لە مەخمەلی رەش بوو، لیٚ هیچ نیشانەو ئارمێکیان پێوە نەبوو. لە دوای ئەوانەوە کۆمەڵێك لە نەجیبانی دەرەجە یەکی ئینگلیستان بە دەستو پێوەندو نۆکەرانیانەوە هاتن.

جارێکی دی دەنگی شەیپوران بەرز بووەوە،و خاڵی وەلیعاد کە پاشان نازناوی دۆکی گەورە سومرست-ی لێنرا، چاکەتێکی رەشی زێڕچنو جبەیەکی ئاوریشمی گوڵداری سووری زیوچنی لەبەر بوو، لە دەروازەی کۆشك هاتە دەرێ. چەرخەڵەیەکی کردو کڵاوە بە پەڕەکەی لەسەر داکەندو بە ئاستەمێك سەری رێزو حورمەتی دانەواند. ئەوجا بە قاڵدرمەکانی داڵانو ڕاڕەوەکەدا پاشەو پاش داگەڕاو لەسەر هەر پلیکانەیەك ئیکلامێکی دەکرد. دەنگی دوورو درێژی شەیپورێك هەستاو فریادێك هاتە گوێ کە دەیگوت:

"رێگا بۆ لۆردی بە توانا و پایەبەرز، ئیدواردی وەلیعادی ئینگلیستانو شازادەی ویلز چۆڵ بکەن." لەسەر دیوارانی کۆشکی پاشایەتیەوە، ریزێکی درێژی مەشخەلانی سوور، بڵێسەیان سەندو دەنگی هاژەیەکی بە سام بەرز بووەوە. ئاپۆڕای ئەو خەڵکەی کە لە نێو بەلەمەکاندا بوون، بە هەڵهەڵەو هاواری شادی خێر هاتنی وەلیعادیان کرد. هەنگێ تۆم کانتی کە بایسو قارەمانی هەموو ئەم دیمەنو نمایشانە بوو، پەیدا بوو، سەری شاهانەی بە ئاستەم لە هەنبەر خەڵکەکەدا دانەواند. جلێکی یەجگار نایابو بەشکۆی لە بەردا بوو، بریتی بوو لە چاکەتێکی ئەتڵەسی سپی کە پێشەکەی ئەرخەوانی بوو و دانە دانە ئەڵماسی پێوەنرا بوو، و فەروی قاقم-یان لە پەراوێزو بەر یەخەکەی نابوو. بەسەر چاکەتەکەدا، شانێڵێکی سپیو زێڕینی لەبەر کرد بوو کە سێ پەڕی زێڕینی، واتە نیشانەو رەمزی خودی وەلیعادی پێوە دەدرەوشایەوەو پەراوێزەکەشیان بە ئەتڵەسی شینباو درو بوو و جەواهێراتو بەردی نرخداریان بەسەراپای ئەم شانێڵەوە (پاڵتۆ) درو بوو و ئاوزونەیەکی ئەڵماسی درشتیشی پێدا شۆڕ بوو بووەوە. حەمایەڵی تایبەتی شاسوارانی بەرپرسی زەنگاڵو گۆرەوی بەستنو چەند نیشانەیەکی فەرەنگی شاهانەیان لە ملی وەلیعاد کردبوو، هەرجارێ کە تیشکی روناکی لەو هەموو جەواهێراتەی دەدا، بە جۆرێ شەوقی دەدایەوەو پرشنگی دەدا کە چاوی دەخستە رێشکەو پێشکە. ئا ئەی تۆم کانتی بەلەنگاز، تۆ کە لە کوختێکی پەرپوتا هاتوویتە دنیاوەو لە پەرپوتترین گەڕەکی شاری لەندەندا دا ژیاویو خووت بە شڕپۆشیو هەژاریو زەبوونیو کەساسییەوە گرتووە، تۆو ئەم دیمەنەیان گوتووە!

((١٠))

## کێشەو مەینەتیەکانی شازادە

ئێمە (جۆن کانتی)مان لە حاڵێکا بە جێهێشت کە خەریك بوو شازادەی راستەقینەی بۆ گەڕەکی ئۆفال کورت دەبردو کۆمەڵێك خەڵکی بێ سەروبەرو ئاژاوەچی دووی کەوتبوون. لەو بەینەدا تەنیا یەك کەس لەسەر کوڕەی یەخسیرو دیلی بێچارەو داماو هەڵیدایەو شتێکی گوت، لیٚ غەڵبە غەڵبو هەراو هەنگامەکە هێندە زۆر بوو کە هیچ کەس گوێی لە دەنگی ئەو نەبوو.شازادە لە هەوڵو تەقەلادا بوو کە خۆی رزگار بکاتو زۆر لەو رەفتارە تووڕە بوو کە دەرهەق بەو دەیانکرد،

تا ئاقیبەت جۆن کانتی ئەو نەختاڵە سەبرو حەوسەڵەیەشی کە هەی بوو لە دەست داو گۆپاڵە دار بەڕووەکەی هەڵبڕی تا بە تەپڵی سەری شازادەیدا بکێشێت. ئەو پیاوەی کە هەر خۆیو بە تەنیا داکۆکی لە شازەدا دەکرد هاتە بەرەوە تا دەستی جۆن کانتی بگرێت، لیٚ جەزرەبەی گۆپاڵەکە بەر مەچەکی دەستی ئەو کەوت، جۆن کانتی هاواری بەسەریا کردو گوتی:

"ناوبژی دەکەی؟ دەبخۆ دەی!"

گۆپاڵەکەی جۆن کانتی داهاتەوەو بەر سەری کابرای ناوبژیوان کەوت، ناڵەیەکی لیٚ هەستاو جەستەیەکی نیوەگیان لەبەر پێی خەڵکەکەدا تەختی عاردی بوو، و دوای تۆزێك تاریکییەکی سخو چڕ باڵی بەسەر هەموو شوێنێکا کێشا. خەڵکی بەوێدا تێپەڕینو ئەم رووداوە بە هیچ جۆریٚ کەیفو سەفای ئەوانی نەشێواند.

ئەنجام شازادە خۆی لە کوختەکەی جۆن کانتی دا بینییەوەو دەرگا لە رووی ئەوانی دی داخرا. شازادە لەبەر تیشکی مۆمێك کە لە دەمی بوتڵێك نرا بوو، وەزعو حاڵی ناڵەباری ئەو کوختەو دانیشتوانی کوختەکەی بینی. دوو کیژی پیسو چەپەڵو خانمێکی ناقساڵ لە سوچێکدا پشتیان بە دیوارەکەوە دابوو، و سیماو هەیئەتیان لە حەیواناتێك دەچوو کە دەقیان بە بێگارییەوە گرتبیٚو ئێستاش چاوەڕوانن بخرێنە ژێر کارەوە. پیرەژنێکی شڕپۆش کە گێسوە ماشو برنجەکەی بەسەر هەنیەو دەموچاویدا رژا بوو و چاوە زیتەکانی فێڵو تەڵەکەیان لیٚ دەباری، لە سوچێکی دیکەدا رۆنیشتبوو. جۆن کانتی بەو پیرەژنەی گوت:

"گویٚ بگرە دایکە، بزانە چ قەوانێکی خۆش لێدەدا! بەڕاستی باش گویٚ بگرەو بۆ خۆت کەیف بکە، پاشان تا دەتوانیت دەست شل بکەو دارکاری بکە... تۆش، کوڕۆ، لە دواتر بوەستەو ئەگەر لە بیرت ماوە، هەمان قسە شێتانەکانی خۆتی بۆ بڵێرەوە. باشە! جا ئێستا بڵیٚ بزانم ناوت چیەو کێیت؟".

شازادە، بەرادەیەك لەم بێشەرمیو سوکایەتییە پەستو تورە بوو کە خوێن زاییە دەموچاویو سوور هەڵگەڕا، نیگایەکی پڕ لە پشمو غەزەبو نەفرەتی ئەو پیاوەی کردو گوتی:

"ئەمە ئەوپەڕی بیٚ ئەدەبییە کە تۆ ئەمر بە من دەکەیتو دەم هێنیتە قسە. من وەکو پێشتریش پێم گوتیت، ئیدواردم، وەلیعادی ئینگلیستانمو تەواو."

پیرەژن بە جۆریٚ لەم وەڵامە حەیرما کە لە جێی خۆی چەقیو خەریك بوو هەناسەی قەت بیٚ. بە چاوانی ئەبڵەقو سەراسیمەوە روانییە سیمای کوڕیژگەکە، جون کانتی کوڕی پیرەژن زۆری کەیف بەم دیمەنە هات، لە خۆشیا لە قاقای پێکەنینی دا. لیٚ کاریگەری ئەم دیمەنە لە دەف دایکی تۆم کانتیو لە نك خوشکەکانی جیاواز بوو، خەمی ئازاری بەدەنی کوڕیژگەکە لەلای ئەوان بە جۆرێکی دی کەوتەوە، بۆیە لێی چوونە پێشیٚو بە سیمای خەمینو خەمبارەوە گوتیان:

"ژارۆ تۆم! نەگبەت خۆت کوڕیژگەی وێڵو سەرگەردان!"

دایکەی بێنەوا لە بەردەم شازادەدا هاتە سەر چۆکانو دەستی نایە سەر شانیو بە چاوانی تەژی رونکەوە، لێی راما. ئەوسا گوتی:

**"ئاھ، کوڕە بێ بەختو بێ تالحەکەم، ئاخری ئەم خوێندنو خوێندنەوە نا بەجێیانە ئەقڵیان تێك دایت! چەندم پێ گوتی دەرس مەخوێنەو تۆ بە قسەت نەکردمو دڵی دایکت شکاند!"**

**شازادە روانیە سەرو سیمای و بە لوتفو دلۆڤانییەوە گوتی:**

**"کوڕەکەت سەلامەتەو ئەقڵو ئاوەزی لە دەست نەداوە. خانمی دلۆڤان، کەمێ ئارام بگرە با من کۆشکەکەی خۆم بگەڕێمەوە کە کوڕەکەی تۆ ئێستا لەوێندەرە، هەنگێ بابم یەکسەر کوڕەکەت بۆ دەگەڕێنێتەوە."**

**دایکەکە گوتی:**

**"بابی تۆ پاشایە؟ وا وەیلا کوڕە بێچارەکەم، ئیدی ئەم قسەیە نەکەیت، چونکە لەوانەیە ببێتە بایسی سەرت، و سەری هەموو کەسوکارت بەبادا بدات. کوڕەکەم، ئەم خەیاڵ پڵاوە لە مێشکی خۆت دەربکەو هەوڵبدە ئەقڵت بێتەوە جێی خۆی. تەماشای من بکە! مەگەر من دایکی تۆ نیم کە تۆم هێناوەتە جیهانەوەو وەکو گیانی خۆم خۆشم دەوێی؟"**

**شازادە سەرێکی لەقاندو ناچار گوتی:**

**"خودا شایەدە کە من بە هیچ جۆرێ نامەوێ دڵی تۆ بشکێنم، لێ راستت دەوێ کە من تا ئێستا تۆم نەدیوە."**

**ژنە، پاشەوپاش کشایەوە، لە عاردی دانیشت، دەموچاوی لە نێو هەردوو دەستی ناو لە بانگی گریانو زاری دا.**

**جۆن کانتی هاواری کرد:**

**"زۆر چاکە، با ئێستا درێژە بەم گەمە پێکەنیناوییە بدەین. ئادەی نەن! ئادەی بت! ئەی گەدایانی بێ تەربێت بۆچی بە ریزەوە لە حوزوری شازادەدا ناوەستن؟ یاڵلا دەی، خێرا بکەونە سەر چۆکانو شەرتی ئەدەب ئەدا بکەن!"**

**جۆن کانتی، دوای ئەو قسانە جارێکی دی لە قاقای پێکەنینی دا. کچەکان لە رای براکەیان دەستیان بە پاڕانەوە کردو کەوتنە شفاعەت، و نەن گوتی:**

**"باوکە، تکا دەکەم واز لە تۆم بێنە با بڕوات بخەوێ، بەڵکو ئیسراحەت دەکاتو ئەقڵی دێتەوە جێ."**

**بت گوتی:**

**"راست دەکا بابە، واز لە تۆم بێنە با بخەوێ. ئەمڕۆ لە هەموو رۆژێك ماندووترە. سبەینێ چاك دەبێتەوەو دەبێتەوە بە (تۆم کانتی)یەکەی جارانو بە هەوڵو تەقەللایەکی زیاترەوە گەدایی دەکاتو ئیدی بە دەستی بە تاڵ بۆ ماڵ ناگەڕێتەوە."**

**قسەی کچەکان، جۆن کانتی هێور کردەوەو لە فکران راچوو، بە توڕەیی بەرەو لای شازادە گەڕایەوەو گوتی:**

**"سبەینێ دەبێ (دووپنی) بە خاوەنی ئەم کەلاوەیە بدەین. تێدەگەی! دووپنی! و ئەم پارەیە کرێی شەش مانگە، دەنا شڕوشیتاڵمان فڕێ دەداتە دەرەوە. دەی ئێستا کوا پێم نیشان بدە کە تۆی گەدای تەمەڵ چیت هێناوەتەوە!"**

شازادە گوتی:

"کاتی من بەم قسە بێسودو تووڕەهاتانە بە فیڕۆ مەدە. پێت دەڵێم من کوڕی پاشام."

مستێکی توندی بە شانی شازادەدا کێشا، و کەوتە باوەشی ژنە دلۆڤانەکەی (جۆن کانتی)یەوە، ئەویش ئەو کوریژگە بەلەنگازەی بە سینگی خۆیەوە قرساندو لە جەزرەبە لێکدا لێکداو بێ ئەمانەکانی مێردەکەیی پاراستو لەشیو بەدەنی خۆی کردە قەڵغانی بەلای ئەو. کچەکان هەراسانو دەسەپاچە رایانکردە سوچێکەوە، لێ داپیرە یەکسەر چووە کۆمەكو یارمەتی کوڕەکەی، جۆن کانتی. شازادە، لە باوەشی ژنەکەی جۆن کانتی دەرپەڕیو گوتی:

"خانم، تۆ نابێ لە پێناوی مندا ئەزیەت بکێشی. لاکەوە با ئەم هیچو پوچە بێ شەرەفانە، هەر بەلایەکیان دەوێ بەسەر منیا بێنن."

ئەم قسەیە بە جۆرێ ئەو هیچو پوچانەی دەهری کرد کە یەکسەر دەستیان بە کاری خۆ کرد، یانی شازادەیان گرتو حەسیر مەیدانێکی باشیان کردو پاشان بە هەنجەتی ئەوەی کە کچەکانو دایکیان دەرهەق بەو قوربانیە نەگبەتە بەزەییو دڵسۆزیان نواند بوو، کەوتنە گیانی ئەوانیشو حەسیر مەیدانێکی باشیان کردن.

ئەوسا جۆن کانتی گوتی:

"دەی ئێستا هەموو بڕۆن بخەون،! لەم گەمەیە بێزار بووم."

چرا کوژایەوەو هەموو ئەندامانی خێزانەکە چوونە ناو جێگاوە. هەرکە پرخەی خەوی سەرۆکی خێزانو دایکی بەرز بووەوەو مەعلوم بوو کە خەویان لێکەوتووە، کیژۆڵەکان بەرەو ئەو شوێنە خزین کە شازادەی لێ خەوتبوو، و بە حەسیرو شڕە پەلاسان دایانپۆشی تا سەرمای نەبێت. دایکیانیش تا سەر جێگاکەی شازادە خزیو دەستی نەوازشتی بە قژیا هێناو بە ئەسپایی بە دیاریەوە گریاو بە قسەی نەرمو خۆش دڵی دایەوە. تەنانەت کولێرەیەکیشی بۆ شازادە هەڵگرتبوو، بەڵام ئازاری ئەشکەنجەو کوتەك ئیشتیای ئەو کوڕەی تۆران بوو. یا نەیدەتوانی ئەو کولێرە رەشە ناخۆشە بخوات.

شازادە، کە داکۆکیو بەڕەڤانی بوێرانەو هەستی پڕ دلۆڤانیو دڵسۆزی ئەو ژنەی دەرهەق بە خۆی بینی، زۆری دڵ پێ سووتاو بە زمانێکی پڕ مەحبەتو لوتفی شاهانە سوپاسی کردو تکای لێکرد کە بگەڕێتەوە بۆ شوێنەکەی خۆیو بخەویو هەوڵبدات خەمو پەژارەی خۆی فەرامۆش بکات. ئەوسا لەسەری رۆییو گوتی بابی کە پاشایە، ئەم لوتفو مەحەبەتو فیداکاریە دڵسۆزانەی خانم لە بیر ناکاتو پاداشتی دەداتەوە. ژنەکەی کەساس کە وایدەزانی شێتی کوڕەکەی سەری هەڵداوەتەوە، زۆری پێ ناخۆش بوو و چەندین جار بە خۆیەوەی گوشیو بە دەم گریانەوە بۆ سەر جێگاکەی خۆی گەڕایەوە.

لەو کاتەدا کە ئەم ژنە داماوە راکشا بوو و دەگریاو لە فکران راچوو بوو، لەپڕ ئەم خەیاڵەی بە مێشکا هات کە هەندێ شت لەم کوڕەدا، ئیدی شێت بێ یان ئاقڵ، هەیە کە لە تۆم کانتی دا نەبوو. ژنەی کڵۆڵ نەیدەتوانی ئەو شتە ئاڵۆزانە بۆ خۆی لێك بداتەوەو نەیدەتوانی بە دڵنیاییو ئەرخایەنیەوە بڵێ کە ئەم جیاوازیانە چین، لێ بە حوکمی غەریزەو سروشتی دایکایەتی هەستی

بەو جیاوازیانە کرد بوو و دەی بینین. باشە ئەگەر بەڕاستی ئەو کوڕیژگەیە کوڕەکەی خۆی نەبێ چ دەبێت؟ ئاه، کە بیرێکی پوچ و بێ مانایە! ژنەی بێچارە، بە هەموو خەم و پەژارەیەکی دڵی خۆیەوە، پێکەنینی بەم بیرو خەیاڵە هات. لەگەڵ ئەوەشدا ئەم خەیاڵەی کەوتبووە سەرو هەدای نەدەداو هەمیشە ئازاری دەداو توانای ئەوەی نەبوو کە فەرامۆشی بکات، یان لە بیری خۆی بتارێنێ.

ئاقیبەت هاتە سەر ئەم بیرەی کە تا تاقی نەکاتەوەو بە تەواوەتی نەگاتە ئەو قەناعەت و باوەڕەی کە ئەم منداڵە وێڵ و وەیلانە کوڕی ئەوە یان نا، رووی ئاسوودەیی بە خۆیەوە نابینێ و ئەم گومان و دوو دڵییەی لە دڵ دەر ناچێت، و رێگەی دروست و ئاسانیش ئەمە بوو کە بکەوێتە تاقی کردنەوە، بۆیە هەموو توانای خۆی بە گەڕخست، بەڵام بە کردەوە دەرکەوت کە قسە ئاسانەو کار قورس و دژوارە. لە دڵی خۆیدا رێگە جیاوازەکانی ئەم تاقیکردنەوەیەی تاوتوێکردو کە دەهاتە سەر هەڵسەنگاندنی هەر یەکێکیان، لەبەر هۆیەك رەفزی دەکرد، چونکە هیچ یەکێك لەو رێگایانە مایەی ئەرخایەنی و دڵنیایی تەواو نەبوو، و تاقیکردنەوەی نیوەچڵیش قەناعەتی پێنەدەکرد. بەڕاستی ژنەی تاین بە خۆڕایی بیری خۆی لەمبارەیەوە ماندوو دەکرد، و هەق وابوو ئەم بابەت و کەڵکەڵەیە لە مێشك و خەیاڵی خۆی دەربکات، لێ لەو کاتەدا کە ئەو دەگەڵ ئەم بیرە پەشێوو پەرێشانانەدا دەست بە یەخە بوو، گوێی لە دەنگی هەناسەی پەیتا پەیتای کوڕیژگەکە بوو و بۆی دەرکەوت کە خەوی لێکەوتووە. ناو بە ناو بە دەم ئەو هەناسانەوە ناڵەیەکی پچڕ پچڕی دەکردو ریتمی هەناسەکەی تێك دەداو دیار بوو کە خەونێکی ناخۆش دەبینێ. ئەم پێشهاتە چاوەڕوان نەکراوە، کردیە کارێك ژنەی تاین ئەو نەخشەیە بدۆزێتەوە کە تائێستا بیری لێدەکردەوەو بۆی دەگەڕا. یەکسەر لە خەو رابوو، و بە بێدەنگی کەوتە کار، یانی شەمالکەکەی داگیرساندو لە بن لێوانەوە بە خۆی گوت: "ئەگەر لەو کاتەدا کە دەناڵێنێ دەموچاویم دیتبا، بێگومان بۆ دەردەکەوت! چونکە کە لە ئێستا منداڵتر بوو هەر کاتێ خەونی ناخۆشی دیتبا، لە جێگە هەڵدەستاو یەکسەر دەستی بە چاوی خۆیەوە دەگرت، بەڵام نەك وەکو هەموو خەڵکانێك کە ناو لە پی خۆ بە چاوەوە دەگرن، بەڵکو هەمیشە پشتی دەستی بە چاویەوە دەگرت. سەدجارم دیوە کە بەو شێوەیە دەستی بە چاویەوە گرتووەو هیچ کاتێك ئەم خوو عادەتەی نەگۆڕیوە. بۆیە هەر ئێستا پەی بە حەقیقەتی مەسەلەکە دەبەم."

لەم کاتەدا ژنەی بەلەنگاز، بەدزییەوە بەرەو منداڵە خەواڵوەکە خزی و مۆمە داگیرساوەکەی بە دەستێك گرتبوو و بە دەستەکەی تری بەر روناکییەکەی گرتبوو. بە دیار سەری کوڕیژگەکەوە دانەوییەوەو چاوی بڕییە سیمای و هێندە پەریشان بوو بەزەحمەت هەناسەی دەردەهات. ئەوسا لە پڕ روناکی مۆمەکەی لەسەرو چاوی داو لەلای کوێچکەیەوە چەند جارێك بە مست کێشای بە عاردەکەدا. کوڕیژگەی خەوتوو چاوانی هەڵێناو نیگایەکی پر سەرسامی دەوروبەری خۆی کرد، بەڵام بە دەست ئەو حەرەکە ئاساییەی جارانی نەکرد.

ژنەی کڵۆڵ لە داخ و سەرسامیدا ناڕەحەت بوو و نەیدەزانی چ بکات. لێ هەوڵیدا نیگەرانی و پەرێشانی خۆی وەشێرێ و کوڕیژگەکە بکاتەوە خەو، ئەوسا بەرەو شوێنەکەی خۆی خزی و نا

ئومێدو ناکام لەم تاقیکردنەوەیە، لە جێگاکەی خۆی ڕاکشا. هەوڵیدا قەناعەت بە خۆی بێنێ کە شێتییەکەی تۆم بووەتە بایسی بیرچوونەوەی ئەو عادەتو خووەی، لێ هەوڵدانەکەی بێسوود بوو و بە خۆی گوت:

"نا، نەخێر، خۆ دەستی شێت نیە، مەحاڵە کە لە ماوەیەکی ئەوەندە کورتا خووە دێرینەکەی خۆی لە بیر بکات. وا وەیلا کەوتوومە چ ڕۆژگارێکی تاڵەوە!"

ئێستا لە جیاتی ئەو دوو دڵیو گومانەی کە لە دڵیا بوو، سووکە هیواو ئومێدێکی پەیدا کردو سەیری کرد ناتوانێ بە یەك تاقیکردنەوە دڵی خۆی ڕازی بکاتو بەو تەسەورەی کە ئەم ناکامییە ڕێکەوتەکی بووە، لێبڕا جارێکی دی تاقی بکاتەوە. ئیدی کوڕیژگەکەی لە ماوەی جیاجیادا یەك جارو دووجاری دیکەش لە خەو بێدار کردەوەو بە هەمان شێوە کەوتە تاقیکردنەوەی، لێ هەموو جارێك ئەنجام هەمان ئەنجامی پێشوو بوو. پاشان ناچار گەڕایەوە سەر جێگاکەی خۆیو بە دنیایەك خەمو پەژارەوە ڕاکشاو لە دڵی خۆیدا گوتی: "وێڕای هەموو ئەمەش، من ناتوانم دەستبەرداری کوڕەکەی خۆم ببم، نەخێر ناتوانم، ناتوانم! هەر دەبێ کوڕەکەی خۆم بێت."

ئاقیبەت هەولو تەقەلاکانی دایکەی بەلەنگاز تەواو بوو، و ئازارو ئەشکەنجەکانی شازادەش تینو تاویان نەما. بۆیە لە هیلاکیو ماندوویەتی دا چاوی نوقاندنو خەوێکی قووڵی لێکەوت. ئەم خەوە چەندین سەعات درێژەی کێشاو خەوێکی هێندە قورس بوو کە لە مەرگ دەچوو. بەمجۆرە چوار پێنج سەعات تێپەڕیو بەرە بەرە حاڵەتی بێهۆشی بەریدا، تا لە پڕێکا کە لە حاڵەتی نیوەخەوو نیوە بێداریدا بوو، لە بن لێوانەوە گوتی:

"سێر ویلیام!"

دوای تۆزێکی دی دووبارە گوتییەوە:

"ئەرێ سێر ویلیام هربرت لە کوێی؟ وەرە بزانە چ خەونێکی غەریبم دیوە کە هەرگیز.. گوێت لێمە سێر ویلیام؟ لە خەونمدا بوو بووم بە کوڕە هەژارێکی وێڵو سەرگەردانو... ئەهای! کێ لەوێیە؟ ئەهای پاسەوان! ئەهای سێر ویلیام! چیە! ئایا هیچ یەکێك لە نۆکەرەکانم لە ژووری چاوەڕوانی دا نین؟ ئەهای، ئەهای! چ بەڵایەك بەسەرتانا..."

چپەیەك لە پەنا گوێیدا بەرز بووەوەو گوتی:

"چیت دەوێ؟ بانگی کێ دەکەی!"

"سێر ویلیام هربرت-م دەوێ، تۆ کێی؟"

"من کێم؟ دەتەوێ کێ بم؟ من (نەن)ی خوشکتم. تۆم! بەڕاستی لە بیرم چوو کە تۆ شێت بوویت.. ژارۆ تۆم! بەڕاستی هێشتا شێتی؟ کاشکێ هەرگیز بێدار نەدەبوومەوەو جارێکی دی تۆم بە شێتی نەدەبینی. تۆم تکایە زمانی خۆت بگرە، دەنگو هەرا مەنەوە ئەگینا هەر هەموومان هێندە کوتەکان دەخۆین، تا گیانمان دەردەچێت"

شازادە بە ترسەوە، نیوە ئاخێزێکی کردو دانیشت، لێ یادی تاڵی ئەو کوتەکانەی کە خواردبووی، وەهۆشیان هێنایەوەو کە حەقیقەتی حاڵەکەی بۆ دەرکەوت، بە ئاهوناڵەو داخو کەسەرەوە لەسەر شڕە حەسیرەکەی ژێری بە پشت دا کەوتو گوتی:

"ئەفسووس! کەواتە ئەم بەدبەختیەی من لە خەوا نەبوو."

لە چاوتروکانێکدا هەر هەموو ئەو خەمو پەژارەو بەدبەختیانەی کە لە ئەنجامی خەودا ڕەوی بووەوە، جارێکی دی هێرشی بۆ هێناو ئەو بەلەنگازە بۆی بەدیار کەوت کە ئیتر ئەو شازادە مەحبوبو بۆشناخە نیە کە چاوی میللەت نیگەرانی ئەو بوو، بەڵکو گەدایەکە نەگبەتو شڕپۆش کە لە شوێنێکی میناکی گەوڕدا یەخسیرەو جگە لە گەداو دزان هیچ یارو یاوەرو هاودەمێکی نیە.

لە کاتێکا کە شازادە نقومی گێژەنگی ئەم بیرە خەمناکانە بوو، لە پڕ هەستیکرد کە بانگی دادو فریاد لە خانوویەك یان دوو خانووی ئەولاترەوە دێتە گوێ. دوای تۆزێکی دی یەك دوو تەقەی توند لە دەرکەی کوختەکە درا. پرخە پرخی جۆن کانتی بڕا، لە خەو ڕاپەڕیو گوتی:

"کێیە؟ چیت دەوێ؟"

دەنگێك هات:

"دەزانی ئەو کەسەی کە تۆ دوێشەو بە گۆپاڵ کێشات بەسەریا کێ بوو؟"

"نەء ، نازانم،و ناشمەوێ بزانم"

"ئەگەر بزانی کێ بوو، لە قسەکەت ژێوان دەبیتەوە. تەنیا هەڵاتن گەردنت لە پەتی سێدارە رزگار دەکات، خێرا لەزێکە! کابرا لە حاڵی مردندایە، ئەو داماوە ئاندریوی کەشیش بوو."

جۆن کانتی هاوارێکی کردو گوتی:

"خودایا رەحم بە حاڵم بکە!" هەنگێ ماڵو منداڵەکەی خەبەر کردنەوەو گوتی: "یا رابنو دەگەڵ مندا هەڵێن، یا لێرە بمێننو بمرن!"

دوای نزیکەی پێنج دەقیقەیەك هەموو ئەندامانی خێزانەکەی جۆن کانتی لە کۆڵان بوونو لە ترسی گیانی خۆ هەڵدەهاتن. جۆن کانتی مەچەکی شازادەی گرتبوو و بە کۆڵانە تاریكو تەنگەبەرەکاندا رای دەڕفاندو بە ئەسپایی ئامۆژگاری دەکرد:

"کوڕۆ زمانی خۆت بگرە! تۆ شێتی. نەکەی ناوی من بێنی! من دەخوازم ناوێکی تر بۆ خۆ هەڵبژێرم تا سەگانی دیوانی عەدالەتو داد چەواشە بکەمو نەتوانن بمدۆزنەوە. بە هەرحاڵ ئاگادار بە، وا پێت دەڵێم زمانی خۆت بگرە ها!"

هەمان قسەی بە هەموو ئەندامانی دیکەی خێزانەکەی گوتو لەسەری رۆیی:

"ئەگەر بە ڕێکەوت لێك دابڕاین، ژوانگەمان سەر پردی لەندەن بێ. کێ زووتر گەییە دوا دوکانی کوتاڵفرۆشی کەنار پردەکە، لەوێ چاوەڕوان بکات تا هەموو ئەوانی دیکەش دەگەنو هەنگێ هەموو پێکەوە بۆ (ساوتۆرك) هەڵدێین."

لەم کاتەدا جماعەت لە پڕ لە تاریکییەوە گەییشتنە روناکییەكو ئەوێندەر نەك هەر روناك بوو، بەڵکو ئاپۆڕایەکی زۆریش لە کەنار روبارەکەدا خڕ بوو بوونەوەو خەریکی گۆرانیو رەقسین بوون. لە سەرانسەری روباری تایمزدا تا چاو هەتەری دەکرد، مەشخەڵیان داگیرساند بوو. پردی لەندەن نقومی روناکی بوو، پردی (ساوت ۆرك)ش چراخانێك بوو لەو گۆڕە. سەرانسەری روبارەکە لەبەر تیشکی چرای رەنگاو رەنگدا دەدرەوشایەوە، هەر فیشەکە شێتەو تەرەقەی رەنگاو رەنگ بووو دەچوو بە ئاسماناو لە حەوادا دەتەقیەوەو بە دەم بانگو هەرای شادی

تەماشاچیانەوە بارانێکی رەنگینی هێشووی ئاگرین دەهاتە خوارێ، شەوەکە بوو بوو بە رۆژی روناك، هەموو شوێنێ یەکپارچە بانگ‌و خرۆشی شادی‌و خۆشی بوو، لە تۆ وایە هەموو شاری لەندەن راپەڕیوە.

جۆن کانتی بە تورەیی نەفرەتی لە خۆی کردو بە ماڵ‌و منداڵەکەی گوت کە بگەڕێنەوە، لێ تازە درەنگ بوو بوو. خۆی‌و هەموو ئەندامانی خێزانەکەی خۆیان بەو قەرەباڵغییە سەیرەدا کردو لە پڕێکا هەر هەموویان لێکدی دابڕان. ئێمە شازادە بە یەکێك لە خانەوادەکەی جۆن کانتی ناژمێرین، لێ ئەو پیاوە هێشتا توند مەچەکی گرتبوو.شازادە لە خۆشیا دڵی کەوتە لێدان‌و بە ئومێدی ئەوە بوو کە شایەد بتوانێ هەڵێت. جۆن کانتی کە دەیویست دڕ بە قەرەباڵغییەکە بدات‌و رێی خۆی بکاتەوەو هەڵێت، بە توندی خۆی کێشا بە دەریاوانێکی کەتەی فول مەستدا، کابرا دەستە زەلامەکەی خستە سەر شانی جۆن کانتی‌و گوتی:

"پەلەی چیتە هاوڕێ، بۆ کوێ؟ خەڵکی هەموو خەریکی کەیف‌و سەفان‌و تۆش لە کار دەگەڕێی؟"

جۆن کانتی بە توندی بەرسڤی دایەوەو گوتی:

"کاری من پەیوەندی بە خۆمەوەیە، و هیچ پەیوەندییەکی بە بە تۆوە نیە، دەستت لەسەرشانم لابدە، دەمەوێ بڕۆم."

کابرای دەریاوان، بەردەمی گرت‌و گوتی:

"چ کابرایەکی عەبووسە! بەزاتی خوا تا پێکێك بە سەلامەتی شازادە وەلیعادی ئینگلیستان نەخۆیتەوە نایەڵم بڕۆی".

"باشە، کوا پێکێکم بدەیە! خێراکە، خێرا!"

لەم کاتەدا کۆمەڵە مەستێکی دیکەش ئاگادار بوونەوەو هەموو هاواریان کرد:

"جامێکی گەورە بێنن، جامی گەورە! کارێکی وا بکەن ئەم مێردەکە مۆنە بە جامی گەورە شەراب بخواتەوە، دەنا دەیکەین بە چەشەی ماسیان!"

یەکسەر جامێکی قەباخداری زۆر گەورەیان هێنا، کابرای دەریاوان بە دەستێك دەسکێکی جامەکەی گرت‌و پاشان وای نواند کە بە دەستەکەی تری خاولییەکەی گرتووەو دەیەوێ بە رەسمی پێشینان بۆ کانتی بگرێ. (کانتی)ش بە ڕەسمی کۆن دەستی بە گرتنی جامەکە کرد، یانی بە دەستێکی دەسکەکەی تری جامەکەی گرت‌و بە دەستەکەی تری سەری جامەکەی لابرد. هەڵبەتە لەم کاتەدا دەبوایە بۆ دەقیقەیەك دەستی شازادە بەر بدات. ئیدی ئەم دەرفەتەی بە فیڕۆ نەداو خۆی بە بەینی لاقی ئاپۆڕای خەڵکەکەدا، کە دەتگوت چڕە دارستانە، کرد، هەڵات‌و لە چاو ون بوو. دوای یەك ساتەوەخت، ئیدی دۆزینەوەی شازادە لە نێو ئەو دەریای پڕ پێل‌و شەپۆلی ئاپۆڕای خەڵکەدا، زۆر لە دۆزینەوەی دراوێکی چکۆلە لە ئۆقیانوسی ئەتڵەسدا، زەحمەت تر بوو.

شازادە زۆر زوو پەی بەو حەقیقەتە برد،و بێ ئەوەی چیتر بیر لە جۆن کانتی بکاتەوە، بیری لە کاری خۆی کردەوە، هەروەها زوو بەزوو پەی بەو حەقیقەتەش برد کە لەو ساتەدا شاری لەندەن جەژن‌و ئاهەنگیان بۆ شازادەیەکی درۆین دەگێڕا کە لە جیاتی ئەو بە وەلیعادیان دەزانی. یەکسەر ئەم تەسەورەی لەلا چێ بوو کە تۆم کانتی، ئەو گەدا وەیلان‌و سەرگەردانە لوتف‌و

**چاکەی ئەوی بەو نامەردیە داوەتەوە کە لەقەب و پایەو پلەکەی لێ داگیرکردووە. بە هەر حاڵ تاقە چاوی شازادە تەنیا ئەوە بوو بە پەلە خۆی بگەیەنێتە گیڵدهۆل و لەوێ خۆی بە دەرباریان بناسێنێ و ئەو داگیرکەرەش ریسواو کەشف بکات. هەروەها لە دڵی خۆیدا بڕیاریدا کە دەرفەت بە تۆم بدات تا لە هەوەڵەوە بەرگری لە خۆی بکات و کارێك بکات گیانی خۆی رزگار بکات، ئەوسا بەگوێرەی یاساو رێورەسمی ئەو رۆژە بە تاوانی گەورەترین خیانەت لە سێدارەی بدات، یان غەرقی بکات. یان لە چوار مێخەی بدات.**

**((١١))**

**لە گیلد هۆڵدا**

**بەلەمی پاشایەتی بە هاوڕایی کۆمەڵێك کەشتی گەورەو رازاوەی دی بە نێو روباری تایمزدا دەچووە پێشێ و بە نێو کۆمەڵێك بەلەمو قەیاخی رازاوەی پرشنگدارا تێپەڕی. شەپۆلی مۆزیك دنیای پڕ کردبوو. هەردوو بەری روبارەکە نقومی تیشك و روناکی ئاتەشبازیو چراخان بوو. شار لە دوورەوە لە نێو روناکی و پرشنگی چراخانێکی گەرمو مۆزیقای دڵنەوازدا شەپۆلی دەدا. موشەکێن ئاتەشبازی بەسەر شارا دەچوون بە ئاسماناو لە حەوادا دەتەقینەوەو میناکی جەواهێری رەخشان بەسەر شاردا دەهاتنە خوارێ.**

**کە کاروانی بەلەمێن پاشایەتی وەرێکەوت، لە سەرانسەر کەناری روبارەکەدا بانگی شادیو هەڵهەڵەی خەڵکی و هورای با بژیو شریخەی تۆپ بەرز بووەوە.**

**ئەم هەراو زەنایە، ئەم دیمەنە بەشکۆیە، بۆ تۆم کانتی کە پاڵی بە پشتییەکی ئاوریشمەوە دابوو، یەجگار سەیرو جوانو عەنتیکە بوو، لێ بۆ جووتە هاوڕێیەکەی، واتا بۆ هەردوو شازادەخانم ئەلیزابت و جین گری کە لە تەنیشت ئەوەوە دانیشتبوون شتێکی تازە نەبوو.**

**هەرکە گەییشتنە (دوکیت) بەلەمەکان بە کەناری روبارە مەنگو زوڵاڵەکەی (ڤال بروك)دا سەرکەوتن (ڤاڵ بروك کە لقێکی تایمز بوو، لەو کاتەدا پتر لە دوو سەدە بوو کە لەبەر بینای بەرز لە چاو ون بوو بوو و لە پشت کۆشك و سەراکانەوە نەدەبینرا)و گەییبنە (بوکلرسبوری)و لەوێندەرەوە بە روبارەکاندا هەوراز بوونەوەو بە ژێر چەندین پرددا کە نقومی روناکی بوونو ژمارەیەکی زۆری خەڵکیان لەسەر وەستا بوو، تێپەڕین تا ئەنجام لە دەریاچەیەکدا کە ئەمڕۆ (بارج یارد)ی پێ دەڵێنو کەوتووەتە ناوەندی شاری لەندەنی کۆنەوە، وەستا.**

**تۆم لە بەلەم هاتە خوارێ، دەگەڵ گاردە پۆشتەو پەرداخەکانی خۆیدا بە (جیپ ساید)دا تێپەڕیو ماوەیەکی کەم بە شەقامانی (ئولدجیوری)و (بیزینگهول)دا رێی کرد تا گەییە تەلاری شارەوانی، واتە گیلد هۆڵ.**

**تۆم کانتی و دوو هاوڕێ جوانەکەی لەلایەن ستانداروو دەستەی سەرەکی ئەنجوومەنی شارەوە پێشوازییەکی گەرمو بێ وێنەکران، کە هەر هەموویان زنجیری زێڕیان لە مل کردبوو، و جلی سوورو ئەرخەوانی فەرمییان لەبەر کرد بوو و هاتبوونە پێشوازی، میوانەکانیان بۆ سەر قەنەفەیەکی جوانو فاخیر کە لە پێشەوەی هۆڵێکی گەورەیان دانا بوو، رێنوێنی کردو دوای**

خوێندنەوەی وتارێك چەند سەوڵەجان و شمشێری تایبەتی شاریان پێشکەش کردن. لۆڕدانی گەورەو خانمەکانیان کە، لە خزمەتی تۆم و جووتە هاوڕێ جوانەکەیدا بوون، لە پشت قەنەفەو کورسیەکانی ئەوانەوە وەستان.

گەورە پیاوانی دەرباری و میوانانی نەجیمزادەی دیکە دەگەڵ پیاو ماقولان و ئەشرافانی شاردا، لە پشت مێزێکەوە کە لە کورسییەکەی تۆم نزمتر بوو، دانیشتبوون. خەڵکە ئاساییەکەی دیکەش، لە پشت ئەو مێزە زۆرو زەبەندانەوە دانیشتن کە لە پاینی هۆڵەکەیان دانا بوون. دوو پەیکەری زەبەلاحی (گوك و ماگوگ) کە پارێزەرانی کۆنی شارن، لە شوێنە بەرزو بالاکەی، خۆیانەوە ملیان درێژ کردبوو لەسەر سەری حەشاماتەکەوە تەمەشای ئەو دیمەنەیان دەکرد کە نەوە بە نەوە بە دیتنی ئەمجۆرە ئاهەنگ و جەژنە راهاتبوون. دەنگی شەیپورێك بەرز بووەوەو جاڕێك درا، ئەوسا خزمەکارێکی کەتەی قەڵەو لە ئاستانەی راڕەوێکی باریکی کۆتایی چەپی دیواری هۆڵەکەوە پەیدا بوو، ریزێك خولام و فەراشان بە سینییە گۆشت گای برژاوەوە کە هێشتا هالاوی لێ هەڵدەستاو بۆ برین و خواردن ئامادە بوو، بەوپەڕی شکۆوە وەژوورکەوتن.

پاش دوعاو نزا تۆم، (کە بە تەواوەتی تەعلیم درا بوو) لە جێی خۆی هەستاو ئەوانی دیکەش لەبەری ڕابوون، تۆم لە جامێکی زێڕی خالیسەی پڕ لە شەراب دەگەڵ شازادەخانم ئەلیزابت دا شەرابی خواردەوەو دوای ئەوان شازادەخانم جین گری-ش خواردیەوەو دوای ئەو جامەکە دەستاو دەست گەییە هەموو پیاو ماقولان و ئەشرافان و بەمجۆرە جەژن و ئاهەنگەکە دەستی پێکرد.

لە نێوەشەودا، هەنگامەی جەژن و ئاهەنگ گەیی بووە لوتکە گەرمی و شکۆی خۆی. لەو دەمەدا یەکێك لە گەمەو نمایشە عالەکان کە لە و رۆژگارەدا زۆرباو و مایەی سەرنج بوو هاتە سەر شانۆ.

شەرح و شرۆڤەی ئەو شانۆییە، یەکێك لە واریقاتنووسەکان کە بە چاوی خۆی دیتویەتی، بە شێوەیەکی زۆر جوان نووسیویە تیوەو بە یادگار بە جێی هێشتووە:

"کاتێ جێگە کرایەوە یەکسەر دوو پیاو ماقوڵ یەکێکیان بارۆن و ئەویتریان دۆك کە بە شێوەی ترکان جلکیان لەبەر کردبوو، وەژوورکەوتن. کەوای درێژی زێڕ دۆزی و کلاوی قوچی مەخمەلی مەلیلە دۆزیان لەبەرو لەسەر بوو، شمشێر لە قەد بە کەمەربەندی زێڕینەوە. دوای ئەوان بارۆنێك و دۆکێکی دی هاتن کە کەوای درێژی لە دیبای زەردی پەراوێز سپی و قەیتانی قرمزی -یان لەبەر بوو، و بە ڕەسمی روسیان کلاوی فەروی شینباویان لەسەر نابوو و هەر یەکەو تەورزینێکیان لە دەستدا بوو، نووکی پێڵاوەکانیان بۆ سەرەوە هەڵگەڕا بووەوە.

دوای ئەوە یەکێك لە نەجیمزادانی پاڵەوان و شاسوار هات. ئەوسا دەریاداری گەورە دەگەڵ پێنج نەجیمزادەدا کە چاکەتی مەخمەلی قرمزیان لەبەر بوو، پاڵتۆی کورتیان بە شانا دابوو، سەرو زنجیری زیویان لە مل بوو، کلاوی رازاوە بەپەڕی قرقاوڵەیان بە رەسمی سەماکاران لەسەر نابوو، وەژوورکەوتن، ئارایشی ئەم تاقمە بە شێوەو رەسمی پروسیان بوو. دوای ئەوان مەشخەڵداران کە ژمارەیان نزیکەی سەد کەس بوو، و جلکی دیبای سەوزو سوریان لەبەر بوو، و دەموچاوی خۆیان میناکی عەرەبێن بەربەری رەش کردبوو، هاتن. ئەوسا لیبۆك وەژوورکەوت، دوای ئەو

شـایەرانو سـەماکاران کـە جلکـی خۆیـان گـۆڕی بـوو هـاتنو ڕەقسـین. هـەنگیٚ لـوردانو هاوسەرەکانیان بە کەماڵی مەیلو ئارەزوو دەستیان بە رەقسین کرد، ئەلهەقی دیمەنێکی هێندە جوان بوو هەر حەزت دەکرد تەمەشای بکەیت."

لەو کاتەدا کە تۆم لەسەر کورسییە بەرزەکەی خۆیەوە بەسەرسامی دەیڕوانیە ئەم رەقسینو سووڕو چەقەنەو ئەو شێوەو هەیئەتە عەجیبو غەریبو رەنگینو رەنگاو رەنگانەو نوقمی حیرەتو تەمەشا بوو، شازادە، وەلیعادی راستەقینەی ئینگلیستان بە جلێکی شڕۆ شپرێوو کۆنەوە لەبەر دەروازە گەورەکەی هۆڵی شاردا هاواری دەکردو داوای لە خەڵکی دەکرد تا ڕێی بکەن بچێتە ژوورەوەو هەقی ئەو داگیرکەرە بناتە مستیو ریسوای بکاتو پەردەی لە روو هەڵماڵی. خەڵکەکە ئەم پێشهاتە سەیرەیان زۆر پیٚ خۆش بوو، لەزەتیان لە قسە شێتانەکانی ئەو کوڕیژگەیە دەبینیو لە هەموو لایەکەوە کەوتنە ملەقوتیٚو سەرەتاتکیٚو بەرەو پێش هوروژمیان هێنا تا ئەم ئاژاوەچیە چکۆلەیە بدینن. لە هەموو لایەکەوە کەوتنە دندەدانو هاندانی کە درێژە بە قسەکانی بداتو گاڵتەیان پێکرد تا زیاتریان توڕە کرد. رونکی حەسرەتو نامرادی لە چاوانی شازادەی چکۆلە قەتیس ما، لیٚ بە ساردو سڕیو بیٚ موبالاتی شازادان دەیڕوانیە ئاپۆڕای خەڵکەکە. خەڵکەکەش درێژەیان بە شۆخیو تەوسو تەڵفیزی خۆیان داو دندەیان دا تا شازادە دەهری بوو و هاواری کرد:

"هۆ خەڵکینە، ئەی کێویانی بیٚ تەربێتو لە گام، جارێکی دیکەش پێتان دەڵێمەوە کە من شازادەی ویڵزو وەلیعادی ئینگلیستانمو بە هەموو بیٚ کەسیو بیٚ ئاشناییەکمەوە، و وێڕای ئەوەی کە هیچ کەس ئامادە نیە گوێم لێبگریٚو دڵی بە حاڵم بسووتیٚو یارمەتیم بدات، تاقە یەك هەنگاو لێرە دوور ناکەومەوەو هەر لێرە دەمێنم."

لەم کاتەدا دەنگێك بەرز بووەوەو گوتی:

"شازادەیی یان شازادە نەبیت فەرق ناکات، تۆ مندالێکی دلێرو ئازاو دڵپاکیو بیٚ دۆستو ئاشناش نیت، من لێرەدا لە پاڵ تۆدا وەستاوم تا ئەم مەسەلەیە بسەلمێنم. ئەگەر لە هاوڕیٚ بگەڕێی لەوەیە هاوڕێیەکی خراتر لە (مایلز هندن) پەیدا بکەیت. بۆیە پێت دەڵێم ئەزیەت مەکێشەو پێی خۆت ماندوو مەکە، چەناگەی خۆت مەیەنە ژانو هاوار مەکە چونکە من زمانی ئەم خوێڕیو تۆڕیو سەرسەریو چەقۆکێشانە لە تۆ باشتر دەزانم، بە جۆرێکی دەزانم وەکو ئەوەی یەکێك بم لە خۆیان".

ئەو کەسەی قسەی دەکرد لاوێك بوو کە جلێکی بە شێوەو رەسمی (دون سیزار دوبازن– Don Caesar debazan) لە بەردا بوو، هەمان شێوەو هەیئەتو سەروسەکوتی ئەوی هەبوو. باڵا بەرزێکی تۆکمەو بتەو بوو. جلو بەرگو تەدارەکەکەی یەکجار نایب، لیٚ کۆنو بەکار هاتگو کاڵەوە بوو بوو، و داوە زێڕینەکانی رەش بوو بووەوەو تێك چوو بوو. تەقەڵی زێڕچنی چاکەتەکەی سوا بوو، پەڕی سەر کڵاوە کۆنەکەی شکا بوو، و دیمەنێکی کۆمێدیو خەمناکی هەبوو، شمشێرێکی لە کێلانێکی ژەنگاویدا بە قەد خۆیا کردبوو. بەو سەروسیمایەوە لە پیاوێکی وەیلانی ئاژاوەچیو شەڕانی دەچوو. قسەکانی ئەم دەعبا سەیرە خەڵکەکەی هێنایە

پێکەنین و تێکرا بە قاقای پێکەنین و هەراو هۆیها وەڵامیان دایەوە. هەندێك هاواریان کرد: "ئەمە شازادەیەکی ترەو خۆی گۆڕیوە. هاوڕێیان زمانی خۆ بگرن چونکە ئەم شازادەیە ترسناکە."و هەندێکی دی گوتیان: "ماشەڵلا لە قودرەتی خوا تەمەشا ئەم جووتە چەند لێکدی دەچن، ئێوە تەمەشای چاوی بکەن!"و هەندێکی دی گوتیان: "منداڵەکەی لە دەست دەربێنن و ئەو تۆڵە بابە بخەنە ئاوەکەوە".

یەکسەر یەکێك دەستی برد کە شازادەی لە دەست دەربێنێ، لێ یارۆی غەریب یەکسەر شمشێری لە کێلان دەرکێشاو بە دەمە پانەکەی کێشای بەو کابرایەداو دای بە عاردیدا. دوای تۆزێك غەڵبە غەڵب بەرز بووەوەو خەڵکی گوتیان: "بیکوژن! ئەو تۆڵە بابە بکوژن، بیکوژن!" لە پڕ هەموو هێرشیان بۆ برد. لاوەکە خۆی گەیاندە پەنای دیوارەکەو وەکو شێتان کەوتە بادانی شمشێری رووت بەسەر سەری خۆیدا. هەندێکیش بە شمشێرەکەی ئەو بریندار بوون و بە پەلە خۆیان دوورخستەوە، لێ ئەوانی دی زۆر بە توڕەیی هێرشیان بۆ ئەو ئاژاوەچیە برد. بێگومان زۆری نەدەبرد کەلاوەیان دەکوشت و مردنی مسۆگەر بوو، لێ لە پڕ دەنگی شەیپورێك بەرز بووەوەو دەنگێکی ئامیرانە فەرمانی دا: "رێگە چۆڵ کەن، رێگە بۆ قاسیدی شا چۆڵ بکەن!"و یەکسەر پۆلێك سوارە بە چوار ناڵە بە نێو حەشاماتەکەدا تێ پەڕین و خەڵکی لە ترسی ئەوەی نەکەونە ژێر پێوە بە غاردان خۆیان لادا. کابرای غەریبی ئازاو بوێر شازادەی لە بن هەنگڵی خۆی ناو بە پەلەو بەغار خۆی لە جێی مەترسی و لە قەرەباڵغی خەڵکەکە دەرباز کردو ڕەڤی.

جا ئێستا با بگەڕێینەوە بۆ هۆڵی (گیلد هول). لە پڕ لە نێو ئەو هەراو هەنگامەی شادی و خۆشییەوە دەنگی شەیپورێك بەرز بووەوە. بێدەنگییەکی کوت و پڕو قووڵ و باڵی بەسەر هەموو ئامادەبوواندا کێشا. دیسان دەنگێك بەرز بووەوە کە دەنگی قاسیدەکەی شا بوو. کەوتە وتاردان، هەموو ئامادەبووان کڕوکپ گوێیان گرت.

ئەم پەیام و گوتارەی کە زۆر بە وردی و هێواشی خوێنرایەوە ئەمە بوو:

"خاوەنشکۆ شا ماڵاوایی لە ژیان کرد."

ئامادەبووان لە پڕ سەریان دانەواندو بۆ ساتێك کڕوکپ بەو حاڵەوە مانەوە. ئەوسا هاتنە سەرچۆکان و باوەشیان بەرەو تۆم کردەوەو تێکڕاو بە یەك دەنگ کە هۆڵەکەی هێنایە لەرزە، هاواریان کرد:

"بژی شا."

نیگای حەیران و حەپەساوی تۆمی بەلەنگاز، بەسەر سەری ئەو جەماوەرە حەپەساوو سەراسیمەیەدا خزی و لەسەر سیمای جووتە شازادە خانم کە لە هەردوولایەوە هاتبوونە سەرچۆکان گیرسایەوەو ئەوجا روانییە لۆرد هرتفورد. ئەوەی لە بیریا بوو لە سیمای خەمباریا رەنگی دایەوە، و بە ئەسپایی سەری وەپەنا گوێی لۆرد هرتفوردەوە ناو گوتی:

"تو شەرەفت قسەیەکت پێ دەڵێم بەڕاستی جوابم بدەوە، ئەگەر من ئێستاکێ فەرمانێکی شاهانە بدەم، جێبەجێ دەکرێ، کەس فەرمانەکەم لە عاردی نادات؟"

"نەخێر قوربان، هیچکەسێك ماڤ سەرپێچی نیە. سەڵتەنەتی ئینگلیستان ئێستا دراوە بە تۆو تۆ پاشای ئەم وڵاتەیتو قسەو فەرمانی تۆ لە جیاتی یاسایە."

تۆم بە ورەو باوەڕو ویقارو متمانەو جۆشو خرۆشێکی پترەوە درێژەی بە قسەکەی دا:

"کەواتە لە ئێستا بە دواوە یاسای شا لەسەر بنەمای هەق و دادپەروەریو دلۆڤانیو مروەتو مرۆڤانی بەرێوە دەچێتو یاسای خوێنو ستەم نامێنێ. دەی خێرا بڕۆ بۆ بورجی لەندەنو لە زمانی شاوە بە بەرپرسانی ئەو زیندانە بڵێ کە نابێ دۆك نورفولك بکوژرێت!".

قسەکانی شا دەماو دەم گەییە گوێی هەموو ئەوانەی کە لە هۆڵە گەورەکەدا ئامادە بوون. لەو کاتەودا کە هرتفورد بە هەشتاو بەرەو زیندانی بورجی لەندەن دەیکوتا، هاوارێکی دی لە ئامادەبووانەوە بەرز بووەوە کە دەیانگوت:

"سەردەمی ستەمو خوێن بەسەر چوو! با بژی شا ئیدوارد، پاشای ئینگلیستان!".

((١٢))

## شازادەو فریا رەسەکەی

هەر کە مایلز هندنو شازادەی چکۆلە لە دەستی خەڵکەکە رزگار بوون، بە کوچەو کۆڵانە تەنگە بەرو بێدەنگەکاندا تێپەڕینو بەرەو روبارەکە رۆییشتن. رێگەکەیان تا نزیکی پردی لەندەن ئەمین بوو، و هیچ کۆسپو تەگەرەیەکیان نەهاتە پێش. لێ لەوێندەر دیسان کەوتنە نێو ئاپۆڕاو قەرەباڵغی خەڵکییەوە. هندن توند دەستی شازادە (نەك شا)ی گرتبوو. هەواڵی خەمناکی مەرگی شا بڵاو بوو بووەوە، و ئەو بستە منداڵە خەبەرەکەی لە زاری هەزاران کەسەوە بیست. ئەم هەواڵە (شا مردووە) دڵی منداڵەی بەلەنگازی وەکو بەفر تەزاندو وەکو بی نێو ئاو لەرزی. هەستی بە گەورەیی ئەو خەسارەتە کرد کە لەو کەوتبوو، و خەمو پەژارەیەکی قورسی لە گیانو روح نیشت، چونکە ئەو پاشا بە زەبرە ئەگەرچی دەگەڵ هەمووواندا بە رەقیو زبری رەفتاری کردبوو، لێ دەرهەق بەو هەمیشە بە بەزەییو دلۆڤان بوو. روندك لە چاوانی شازادە قەتیس مانو دنیای لەبەرچاو تەنگو تاریك بوو. بۆ دەمێکی تیژ تێپەڕ هەستیکرد کە کلۆڵترینو هەژارترینو بێچارەترینو زەبوونترین خەڵقەندەی خودایە، لێ دوای ئەوە دەنگێك وەکو هەورە تریشقە لە گوێی دا دەنگی دایەوەو دڕی بە تاریکی شەودا. دەنگەکە دەیگوت: "بژی خاوەنشکۆ ئیدواردی شەشەم!" ئەم دەنگە رۆشناییەکی تازەی بە چاوانی ئەو بەخشی، چاوانی کردەوەو ورەی بەرز بووەوەو ئۆخژنێکی ئەوتۆی لە دڵو دەروون گەڕا کە تەنانەت قامکەکانیشی کەوتنە جوڵەو لە دڵی خۆیدا گوتی:

"ئاه، کە شتێکی باشە، سەیرە– من شام!"

خۆلاسە جووتە هاوڕێ هێواش هێواش بە نێو خەڵکەکەداو بەسەر پردەکەدا پەڕینەوە. تەمەنی ئەم پردە شەش سەد ساڵ بوو، دایمە قەرەباڵغ بوو، لە خەڵكو خوادا جمەی دەهات، بەراستی شوێنێکی سەیر بوو، ئەم بەرو ئەو بەری ریزە دوکانو موغازە بوو، سەر دوکانو موغازەکان

لەمسەری روبارەکەوە تا ئەوسەر ماڵی خەڵکی بوو. پردی لەندەن بە تەنیا بۆ خۆی شارێك بوو لەو گۆڕە، ئوتێل و مەیخانەو نانەواخانەو دوکانی وردەفرۆشی و تەنانەت کڵێسای تایبەت بە خۆی هەبوو. عەزەمەتی ئەم پردە وا بوو کە بە چاوی حەقارەتەوە دەیڕوانیە دوو ئاوەدانی نزیکی خۆی، واتا لەندەن و ساوتۆرك و هەرچەند بە یەکەوەی دەبەستن، لێ بە دوو گەڕەکی بێ بایەخی دەژماردن. ئەم پردە لە راستیا مەڵبەندێکی سنوردار بوو، یان شارێکی بچووك بوو کە یەك شەقامی تایبەتی خۆی هەبوو، درێژی شەقامەکەی هەر پێنج یەکی میلێك دەبوو. ژمارەی دانیشتوانەکەی هەر بە ئەندازەی دانیشتوانی گوندێك دەبوو. خەڵکی ئێرە زۆر بە چاکی هاوشاریانی خۆیان دەناسی و هەموو ئاشناو دۆست و هاوڕێی دڵسۆزی یەکتر بوون، و تەنانەت دایك و باوکی یەکتریشیان دەناسی و لە وەزع و حاڵی خانەوادەیی یەکتریش ئاگادار بوون. ئەم باژێڕۆکە چینی ئەشراف و دەوڵەمەندیشی هەبوو، و قەساب و نانەواو عەتاری بە ئیحتوباریشیان تێدا بوو کە لە پێنج سەد شەش سەد ساڵ لەوە پێشەوە نەوە دوای نەوەو پشتاو پشت لەو شوێنەدا کارو کاسبیان کردبوو، و سەنگ و ئیحتوبارێکیان پەیدا کرد بوو و مێژووی بەشکۆی گەڕەکی پردەکەیان لە کۆنی کۆنەوە تا ئێستا دەزانی و ئاگاداری نهێنی و ئەفسانە عەجیب و غەریبەکانی بوون. ئەم خەڵکە بەزوبانی تایبەتی گەڕەکی پردەکە داخاوتن و جۆری بیرو هزرینیان، هی هەمان گەڕەك بوو، و شێوەی ژیان و گوزەرانی تایبەت بە خۆیان هەبوو.

قەدەری ئەم خەڵکە وا بوو کە هەموویان بێ ئاوەزو جاهیل و لە خۆڕازی و بە فیزو دەعیە بن. منداڵەکانیان لە هەمان گەڕەك لە دایك دەبوون و لە هەمان شوێن پەروەردە دەکران و تەربێت دەدران و گەورە دەبوون و پیر دەبوون و لە ئەنجامدا دەمردن، بێئەوەی هەرگیز تاقە هەنگاوێك هێوەی پردی لەندەن چووبن. هەڵبەتە ئاساییە کە ئەم جۆرە خەڵکە، قەرەباڵغی و جەنجاڵی بەردەوامی خەڵکی، کە رۆژو شەو بەو تاقە شەقامەدا تێدەپەڕین و یەکپارچە هەراو زەناو ژاوەژاو بوو، بە گرنگترین شتی دنیا بزانن و ئەوەیان بە تایبەتمەندی گەڕەکەکەی خۆیان دەزانی، و بە ڕاستیش وابوو، چونکە خەڵکی ئەو گەڕەکە هەر شتێك لەو دەوروبەرەدا رووی دابا، دەیانتوانی لە پەنجەرەکانی خۆیانەوە تەمەشای بکەن. بۆ نموونە کاتێ پاشایەك یان پاڵەوان و قارەمانێك بۆ شوێنێ دەڕۆیی، یان لە شوێنی دەگەڕایەوە، لە هەردوو سەرەوە دەبوایە بەسەر ئەو پردەداو بە نێو حەشاماتی خەڵکەکەدا بڕوات و شوێنی لەوێ باشتر نەبوو بۆ تەمەشای شان و شەوکەوت و شکۆو کەبکەبەو دەبدەی ئەو.

ئەو پیاوانەی کە لە گەڕەکی پردی لەندەن هاتبوونە دنیاوەو گەورە بوو بوون، ژیانی شوێنانی دیکەیان بە خەمناك و ناخۆش و تاقەتبەر دەزانی. دەڵێن جارێ پیاوێکی هەفتاو یەك ساڵە لە گەڕەکی پردێ باری کردووەو چووە بۆ لادێ. ئەو بەلەنگازە لەو رۆژە بە دواوە هەموو شەوێ تا بەیانی لە نێو جێگاکەیدا گینگڵی دەداو تلی دەداو خەوی لێنەدەکەوت. چونکە کپی و بێدەنگی گوندەکە بە جۆرێ کاری لە ئەعسابی دەکرد کە نەیدەتوانی بخەوێ. ئاخری بێزار بوو و بۆ گەڕەکەکەی خۆی زڤڕییەوە، هەمان پیاو کە لە گوندی دا لەڕو لاواز بوو بوو، لە سایەی هەراو

زەناو غەڵبە غەڵبو هاواری خەڵکیو قەرەباڵغی سەر پردەکەدا بۆ خۆی بوژایەوەو مێشکی ئیسراحەتی کردو هەموو شەوێ تێر دەخەوت.

لەو سەردەمو رۆژگارەدا کە ئێمە باسی دەکەین، پردی لەندەن پێگەیەکی گرینگی لە مێژووی ئینگلیستاندا پەیدا کردبوو، چونکە سەری گەلێك لە پیاوانی نێوداری وڵات کە دەبڕاو فڕێیان دەدایە ئاوەوە، لە کەتیبەی پەنجەرە ئاسنەکان گیر دەبوو و لەوێدا بۆ گەنی دەکرد. بە هەر حاڵ لە بابەتەکەی خۆمان دوور کەوتینەوە.

ماڵەکەی (مایلز هندن) لە ئوتێلێکی بچووکی سەر پردی لەندەندا بوو. کاتێ کە دەگەڵ هاوڕێ چکۆلەکەیدا گەیینە بەر ماڵەوە، لە پڕ دەنگێکی ناساز بەرز بووەوەو گوتی: "ئۆیف! ئاخری بە پێی خۆت هاتییەوە! ئیتر ناتوانی لە دەستم هەڵێی! هەر بجوڵێیتەوە ئێسكو پروسکت وردو خاش دەکەم، تا نەخەڵەتابی جارێکی دی بەدەم چاوەڕوانی خۆتمەوە بدەی."

جۆن کانتی، بەدەم ئەو قسەیەوە دەستی برد تا مەچەکی شازادە بگرێت. مایلز هندن لێی هاتە پێشیێو گوتی:

"پەلە مەکە برادەر، لەوە دەچێ پیاوێکی توڕەو جینگز بیت. ئەم کوڕیژگەیە چی تۆیە؟"

"ئەگەر کاری تۆ، ئەمەیە خۆ لە کاری خەڵکی هەڵقورتێنی، ئەوا پێت دەڵێم کە ئەم منداڵە کوڕی منە."

شازادە زۆر بە جدی هاواریکرد:

"درۆ دەکات."

هندن گوتی:

"ئافەرین، دەم خۆش، قسەی تۆیە، جا ئێستا تۆ شێت بی یان ئاقڵ، ئەم بۆرە زەلامە باوکت بێ یان باوکت نەبێ، ئیدی هەقی نیە دەستت بۆ بێنێ، یان لێت بدات، ئەگەر تۆ بە خۆت حەزت لێ بێ دەتوانی لەگەڵ مندا وەمێنی."

شازادە گوتی:

"لەگەڵ تۆدا دەمێنمەوە، من ئەم بۆرەپیاوە ناناسمو زۆری لێ بێزارم، مردنم پێ خۆشترە لەوەی لای ئەوبم."

"ئێ، زۆر باشە، تەواو. ئیدی هیچ قسەیەکمان نیە، بڕایەوە."

جۆن کانتی، دەیویست هندن بداتە دواوەو کوڕیژگەکە بگرێت. و بە دەم ئەو حاڵەوە گوتی:

"ئێ، پیشانتی دەدەم کە هەق بە کێیە. ئەگەر بە خورتیش بووە..."

هندن گوتی:

"نامەردی نا پیاو، ئەگەر ئازای دەست بکەوە بزانە چۆن میناکی قاز لە شیشت دەدەم."

هەنگێ دەستی بۆ شمشێرەکەی بردو لەسەری رۆیی:

"چاك بزانە کە کاتێ کۆمەڵێك خەڵکی ناجسنو نارەسەنی وەکو تۆ بەسەریا رژا بوونو لێیان دەداو تەنانەت دەیانویست بیکوژن، من فریای کەوتمو خستمە ژێر باڵی خۆم، ئێستا بە تەمای بەو ئاسانییە دەستبەرداری بم؟ بۆ کێش؟! بۆ یەکێکی وەکو تۆ کە هیچ مەعلوم نیە بابیت یان نا؟

به هەرحاڵ تۆ ڕاست ناکەیت‌و ئەم منداڵە مردنی زۆر باشترە لەوەی کە لە ژێر دەستی مێردەك‌و بۆرە زەلامێکی هۆڤی‌و زبری میناکی تۆدا بژی. بۆیە ڕێی خۆت بگرەو بڕۆ، من تاقەتی قسەو چەنەبازیم نیەو زۆریش کەم سەبرو بێ حەوسەڵەم".

جۆن کانتی بە دەم پرتەو بۆڵەو جنێودانەوە لەوێندەر دوور کەوتەوەو لە نێو ئاپۆڕای خەڵکەکەدا لە چاو ون بوو.

(مایلز هندن) پاش ئەوەی خواردنی بە ڕاسپاردن دا، دەگەڵ هاوڕێ چکۆلەکەیدا بۆ قاتی سەرەوە سەرکەوت. ژوورەکەی ماڵێکی پەرپوت‌و هەژارانە بوو. تەختە خەوێکی کۆنەو چەند پارچە ناو ماڵ‌و کەلوپەلی شڕو کۆنەی تێدا بوو، و جووتێ مۆمی کافوری، روناکییەکی لێڵیان بە ژوورەکەدا بڵاودەکردەوە. شازادەی چکۆلە، هێندە شەکەت‌و برسی بوو کە بە پەلە خۆی گەیاندە تەختە خەوەکەو بە حاڵی نیوە گیان لەسەری ڕاکشا، بەلەنگازە بەشی هەرە زۆری ڕۆژەکەو هەموو شەوەکە هەر بە پێوە بوو و ئێستا سەعات سێی پاش نیوە شەو بوو و بە درێژایی ئەم ماوەیە زەوادی نەچوو بووە سەر زار، لە بن لێوانەوە گوتی:

"تکایە کە خواردنەکە هات، بانگم بکە." دوای ئەو قسەیە یەکسەر خەوێکی قووڵ بردییەوە.

ماکی بزەیەکی بەزەیی ئامێز لە گۆشەی چاوی (مایلز هندن)ەوە دەرکەوت‌و لە دڵی خۆیدا گوتی:

"ئەم کوریژگە گەدایە، تەختە خەوەکەم‌و ژوورەکەمی، وەکو ئەوەی هی خۆی بێ، بێئەوەی پرسێکم پێ بکات، داگیر کرد. کاتێ کە زۆر تۆڕە بوو، خۆی بە وەلیعادی ئینگلیستان لە قەڵەم داو مەردانە لەسەر قسەکەی خۆی سوور بوو. داماوە، بێگومان لە بێکەسی‌و بەد بەختی خۆی‌و لەبەد ڕەفتاری خەڵکیدا ئەقڵی تێك چووە، باشە، من دەبم بە یارو یاوەری. لە تالوکەو مەترسیانم ڕزگار کرد، لە خۆوە مەحەبەتم چووە سەری. بەهەرحاڵ من زمانی بێ پەرواو بێباکی ئەوم لا پەسندەو زۆرم خۆش دەوێ. ئەلهەقی وەکو سەربازێکی ڕەشید لە بەرانبەر ئەو هەموو خەڵکەدا وەستاو بێزاری‌و نەفرەتی خۆی لە ئەتوارو ڕەفتاریان بە ڕاشکاوی دەربڕی، ئێستا کە خەوی ئارام خەم‌و پەژارەو پەرۆشی لێ دوور خستوەتەوە، چەند سیمایەکی هێمن‌و جوان‌و دڵگیری هەیە، من فێری خوێندەواری دەکەم، تەربێتی دەدەم، پەروەردەی دەکەم‌و نەخۆشیەکەی چاك دەکەمەوە. بۆی دەبم بە برایەکی گەورەو چاودێری‌و ئاگاداریی دەکەم‌و هەر کەسێك دەستی بۆ درێژ بکات یان قەستی خۆینی بکات، چاوی دەردێنم."

مایلز، بەسەر کوریژگەکەدا دانەوییەوە، بە سۆزو بەزەیی‌و دلۆڤانیەوە ڕوانییە سیمای‌و گۆنا تەڕو بڕەکانی نەوازشت کردو بە دەستە زبرو درشت‌و تاوە سوتەکانی قژە نەرم‌و ناسکەکەی دایە داوە، موچوڕکەیەکی سووك بە لەشی کوڕەکەدا هات. مایلز هندن لە بن لێوانەوە گوتی:

"تۆ سەیری من، باشە بۆ هێشتم بەبێ سەر ئەنداز لەسەر لێفەکە بخەوێ‌و بەدەنی نازدارو ناسکی سەرمای بێت؟ ئێستا چ بکەم؟

ئەگەر لەسەر تەختەکەی هەڵگرم‌و لێفەکەی پێدا بدەم خەبەری دەبێتەوە، داماوە زۆر شەکەتەو پێویستیشی بە خەوێکی باشە."

مایلز، زۆری چاوگێڕا کە لیفەیەکی زیادە بدۆزێتەوە، لیٚ چونکە هیچی نەدۆزیەوە. چاکەتەکەی خۆی داکەندو دای بەسەر کورپژگەکەداو لەبەر خۆیەوە گوتی:

"من دەگەڵ سەرماو سۆڵە دا راهاتوومو سەرمام نابێت، بەلاّم ئەو منداڵەو بەرگەی سەرما ناگرێت." ئەوسا بە ژوورەکەدا کەوتە هاتوچۆ تا خوێنی بجولێت‌و سەرما کاری تێنەکات‌و لەبن لێوانەوە بە خۆی گوت:

"بیری پەشێوو پەریشانی ئەم منداڵە وای لێکردووە کە خۆی بە شازادەی ویلزو وەلیعادی ئینگلیستان لە قەڵەم بدات. چۆن دەبیٚ، وەلیعادی ئینگلیستان لە نێو ئێمەدا بیٚو لە کاتێکا وەلیعاد چیتر وەلیعاد نیە، بەڵکو بووە بە شا. باشە گوتنی ئەم قسەیە بەم منداڵە شێتە چ فایدەیەکی هەیە، چۆن دەکریٚ حاڵی بکەم کە نابیٚ چیتر ئیدیعای وەلیعادی بکات، بەڵکو دەبیٚ داوای سەڵتەنەت بکات‌و خۆی بە پاشا بزانێت؟... ئەگەر بابم دوای ئەم حەوت ساڵەی کە من هیچ هەواڵێکم لە ماڵو حاڵی خۆم نەبووە، مابێت، ئەوا باوەش بۆ ئەم منداڵە هەژارە دەکاتەوەو لەبەر خاتری من دەیخاتە ژێر باڵی خۆی‌و پەنای دەدات. (ئارتەر)ی برا گەورەشم ئەمە دەکات، بەلاّم برا چکۆلەکەم، یانی (هیو) چیت عەرزبکەم.

ئەگەر ئەو حەیوانە دڵرەق‌و بیٚ بەزەییە بیەویٚ خۆی لەم کارە هەڵقورتێنیٚ، کەللەی دەهاڕم. بەڵیٚ پێویستە یەکسەر ملی ڕێگا بگرین‌و بۆ ئەوێندەر بڕۆین."

گارسۆنێك لە دەرگاوە وە ژوورکەوت، ئەو خۆراکەی کە هالاّوی لیٚ هەڵدەستا، لەسەر مێزێکی چکۆلەدا نا،کورسیەکانی ڕێك خست‌و ئەوسا وەك ئەوەی بڵیٚ ئەو میوانە بیٚ پارەو هەژارانە شایستەی خزمەتکردن نین، لە ژوورەکە وەدەرکەوت،و بەجێی هێشتن کە خۆ یان مشوری خۆیان بخۆن‌و خەریکی خواردنەکەیان بن. دەرگاکەی لە دوای خۆیەوە راکێشا، سەدای داخرانی دەرگاکە کوڕەی لە خەو راپەڕاند. بەستەزمانە لەسەر تەختە خەوەکە دانیشت‌و روانییە دەوروبەری خۆی، لیٚ لە پڕ ماکی خەم‌و پەژارە کەوتە سەر رووی‌و لە ناخی دڵەوە ئاهێکی قووڵی هەڵکێشاو لە بن لێوانەوە گوتی:

"ئەفسوس، خەون بوو." هەنگیٚ چاوی بە چاکەتەکەی مایلز هندن کەوت‌و نیگایەکی سوپاس ئامێزی کردو پەی بەو چاکەیە برد کە دەرهەق بەو کردبووی‌و بە لوتف‌و میهرەبانیەوە گوتی:

"بەڕاستی پیاوێکی دلۆڤانی، چەند میهرەبانی، وەرە چاکەتەکەت لەبەر بکەوە، تەواو پێویستم پێی نیە."

ئەوسا هەستاو بەرەو دەستشۆرەکە کە لە گۆشەیەکی ژوورەکەدا بوو، رۆیی‌و لەوێندەر بەدەم چاوەڕوانیەوە وەستا. هندن بە ڕوویەکی خۆشەوە پێی گوت:

"ئێستا خواردنێکی گەرم‌و خۆش دەخۆین. خواردنی گەرم هەر چیەك بیٚ بەلەزەتە. ئەم خواردنە گەرم‌و بەلەزەتەو ئەو خەوەی کە کردت، گوڕو تینێکی تازەت پێدە بەخشێت‌و دەبوژ-ێیتەوە. ئیدی لە هیچ شتێك مەترسە."

کوڕیژگەکـە وەڵامـی نەدایـەوەو تـەنیا نیگایـەکی (هنـدن)ی کـرد کـە سەرسـامی و تەنانـەت بـێ سەبری لێدەباری، و ئەم نیگایە بە جۆرێ کاری لە پاڵەوانە رەشیدو شمشێرکێشـەکەمان کـرد، کـە شپرزەو دەسەپاچە بووو پرسی:

"ها، چیتە؟"

"هیچ، دەمویست دەستو چاوم بشۆم."

"پەح! هەر ئەمە؟ لێرەدا پێویست ناکات بۆ هیچ کارێك داوای مۆڵەت لە مایلز هندن بکەی. لێرەدا ئازادی ئازادیتو چۆنت حەز لێیە، بە کەیفی دڵی خۆت بکە، چونکە ماڵی خۆتە."

کوڕیژگەکـە هـەر وەستابوو، یـەك دوو جـاران بـەبێ حـەواسو بـێ سـەبری پێیـە چکۆلەکانی بـە عاردیدا کوتا. هندن زۆر نیگەران بووو گوتی:

"ها، ئەمجارەیان چیتە؟"

"تکایە وەرە ئاوم بە دەستیدا بکەو ئەوەندە قسە مەکە."

(هندن) لەزگ بوو لە قاقای پێکەنین بدات، لێ خۆی گرتو لە دڵی خۆیدا گوتی:

"سوبحانەڵلا! نۆبەتی ئەو قەوانەیە!" وێڕای ئەوەش چەند هەنگاوێك چووە پێشێ و داواکەی ئـەو منداڵـە بـێ چاوو رووەی ئـەنجام دا. ئـەوجا لەلایەکـەوە وەستاو بـەو پـەڕی سەرسـامی لـە فکـران ڕاچوو، لە پڕ گوێی لـە فرمـانێکی تـر بـوو. کوڕیژگەکە گوتی: "وەرە ئەو خاولییەم بدەیە." ئـەم فرمانـە زنجـیرەی بـیری بچـڕیو وەخـۆی هێنـایـەوە. یەکسـەر خاولییەکـەی، کـە لەبـەر دەسـتی کوڕیژگەکە بوو، هەڵگرتو بێ هـیچ قسـەیەك دایـە دەسـتی. ئەوسا کەوتـە شـتنی دەستو چاوی خۆیو کە لەوکارە بووەوە، کوڕیژگەکە لە پشت مێزەکە دانیشتو خەریك بوو کە بکەوێتـە گیـانی خواردنەکـە. هنـدن بەپەلـە دەسـتو چـاوی خـۆی وشـك کـردەوەو ئەوسـا کورسـییەکی دیکـەی ڕاکێشایە بەرەوەو ویستی لە سەری دانیشێت کە لە پڕ کوڕیژەگەکە بەوپەڕی گازەندەوە گوتی:

"ئەمە چیە! دەتەوێ لە حوزوری پاشادا دانیشیت؟"

ئەمە جەزرەبەیەك بوو کە زۆر کاری لە هندن کردو لە ناخی دڵەوە ڕنجاندی.

لـەبن لێوانـەوە بەخۆی گـوت: "داماوە رۆژ بـە رۆژ خراتـر دەبـێ، شێتایەتیەکەی لـە زیـادی دەدا. ئەویش گوێ بە گوێی ئەو گۆڕانە گەورەیـەی کـە رووی داوە، گـۆڕاوەو ئـەوەتا بـە خـەیاڵ بـووە بـە پاشا. چار نیە، دەبێ دان بە خۆدا بگرمو سەبرم هەبێ، دەنا فـەرمان دەدات لـە بـورجی لەنـدەن دا زندانیم بکەن."

دڵـی بـەم نوکتەیـە خـۆش بـوو، کورسـییەکەی بـردەوە جێگـای خـۆیو لـە پشـت پاشـاوە رەق ڕاوەستاو بەو پەڕی رێزو نەزاکەتەوە ئامادەی خزمەتی بوو.

شـا بـەدەم نـان خواردنـەوە وردە وردە هێـورتر بـووەوەو پشـمو غـەزەبی شـاهانەی کـەمێك نیشتەوەو بەرە بەرە هەوەسو گێوڵی قسە کردنی بزواو گوتی:

"وابزانم، ئەگەر بە هەڵە نەچووبم تۆ گوتت کە ناوت مایلز هندن-ە."

"بەڵێ خاوەنشکۆ". ئەوسا لـە دڵـی خۆیـدا بیری کـردەوە: "ئەگـەر بمـەوێ دڵـی ئـەم منداڵـە شـێتە ڕابگرمو نـەیڕەنجێنم دەبـێ بـە زاراوەی (ئەزبـەنی)و (خاوەنشـکۆ) وەڵامـی بدەمـەوەو بـە دڵـی ئـەو

بکەم. من نابی سارد ببمەوەو ئەم شانۆگەرییە بەنیوەچڵی بەجێ بێڵم. دەبێ تا کۆتایی شانۆ گەرییەکە بەو پەڕی دڵگەرمی بڕۆم، دەنا ئەم کارە بێ ئاکام دەبێو هیچ بەرێك نادات.

شا، پیاڵەیەك شەرابی دیکەی خواردەوەو هەنگێ گوتی:

"من دەمەوێ تۆ بناسم. سەر بهوردی خۆتم بۆ بگێڕەوە. تۆ زۆر جوامێرانە رەفتارم دەگەڵ دەکەیت، یانی تۆ لە بنەماڵەی خانەدانانی؟"

"خاوەنشکۆ، ئێمە لە بنەماڵەیەکی بەرێزی نەجیبین. بابم یەکێکە لە لۆردە بچووکەکانو بە یەکێك لە نەجیبانی دەربار دەژمێردرێ. ناوی سێر ریچارد هندنەو خاوەنی (هندن هول) ە کە گوندێکی نزیکی منکس هولمەو کەوتوەتە ویلایەتی (کنت)ەوە.

"ئەم ناوەم لەبیر چووەتەوە. ئێ بەردەوام بە، چیتر."

"ئەزبەنی، بەسەرهاتی من دوورو درێژ نیەو ئەگەر بمەوێ هەمووی بگێڕمەوە، نیو سەعات پتر نابات. بابم، سێر ریچارد هندن زۆر دەوڵەمەندو فرە دەستو دڵ کراوەیە. دایکم کە مرد من هێشتا منداڵ بووم. دوو برام هەن. برا گەورەکەم (ئارتەر) هەمان خوو رەوشتی بابمی هەیەو پیاوێکی دڵاواو جوامێرو پیاوانەیە. برا چکۆلەکەم (هیو) پیاوێکە مەیخۆرو بەغیلو دڵڕەقو دەغەڵبازو نەکلۆكو ناسازو وەلحاڵ مارێکی بە وەزەنە، هەر لە منداڵییەوە وابووەو دەساڵ لە مەپێش کەمن بۆ دواجار دیتم هەر وابوو. لەو سەرو بەندەدا ئەو نۆزدە ساڵانو من بیست ساڵانو ئارتەر بیستو دوو ساڵان بوو. ئیدی هیچ کەسێك لە خانەوادەی ئێمە نەماوە کە عەرزم نەکرد بیت، تەنیا (ئەدیت)ی دۆتمام نەبێت کە ئەوسا شازدە ساڵان بوو. کچۆڵەیەکی خشیكو سەلارو سەنگینو نەجیب. بابی یەکێك بوو لە نەجیبە بەرێزەکان کە لە ماڵباتی وان تەنیا ئەو کیژە مابووەوە،و میراتگری سەروەتێکی زۆرو عینوانو لە قەبێکی گەورە بوو. بابم سایە دارو سەر پەرشتیاری بوو. منو ئەو کیژە یەکترمان خۆشدەویست، لێ لە منداڵیەوە بۆ برا گەورەکەم، (ئارتەر) یان دانابوو، بابم، سێر ریچارد نەیدەویست ئەم قەولو قەرارە تێك بچێت. ئارتەر کیژێکی دیکەی خۆش گەرەك بوو،و ئیدی وازی لە ئێمە هێنا کە بۆ خۆ بە خۆشی بژینو هەمیشە دڵخۆشی دەداینەوەو دەیگوت خەفەت مەخۆنو بەیەك دەگەنو پێکەوە شادو بەختەوەر دەبنو کاری هەموومان بە دڵی دۆست دەبێت. هیو هەر چەندە تەماحی کردبووە سەروەتو سامانەکەی، بەڵام بە رواڵەت ئیدیعای ئەوەی دەکرد کە کیژێی خۆشدەوێ، ئیدی ئەمە خوو رەوشتی بوو کە هیچ کاتێك دڵو زمانی یەك نەبن. لێ هەرچی دەکردو دەکۆ شا دڵی کیژێی بۆ ڕاو نەدەکراو هەوڵو تەقەلاکانی بە هەدەر دەرۆییو لەم رووەوە تەنیا بابمی بەلای خۆیدا ڕاکێشا. بابم لە هەموومانی خۆشتر دەویستو تاقە ئومێدو متمانەی هەر ئەو بوو،و تەنیا بە قسەی ئەو باوەڕی دەکرد. چونکە ئەو لە هەموومان بچووکتر بووو بە بۆچوونی بابم منداڵەکانی دیکەی حەزیان لە هیو نەدەکرد. ئەمە جگە لەوەی کە هیو زمانێکی زۆر لوسو نەرمی پێوە بوو، لە درۆو لافو گەزاف دا یەجگار کارامەو وەستا بوو، بەو خەسڵەتانە دەکرێ مەحەبەتی کوێرانە بە قازانجی خۆت بە دەست بێنی. من گەنجێکی زبرو توڕەو سەرکێش بووم، بەڵام ئەم توڕەییەم

زەرەری بۆ کەس نەبوو، زەرەری تەنیا بۆ خۆم هەبوو. کەسم ئەزیەت نەدەدا، هەڵەو تاوانێکم نەدەکرد کە عەیبە بێتە سەر پایەو نێو بانگی خانەوادەییمان و خانەدانیمی پێ لەکەدار بێت.

بە کورتیەکەی (هیو)ی برام ئەم لایەنە ئەخلاقیەی منی بە قازانجی خۆی قۆستەوەو کە بینی وەزع و حاڵ و تەندروستی ئارتەری برا گەورەم باش نیە، بیری لەوە کردەوە کە ئەگەر من لەسەر رێگەی خۆی لا بەرێت، رەنگە رۆژێ لە رۆژان سوود لەم کارەی وەربگرێت بۆیە.... ئاه حیکایەتەکەم درێژەی کێشاو من دەزانم هیچ نیەو ئەوە نایەنێ بگێردرێتەوە... بەڵێ ئەم برایە توانی زۆر وەستایانە هەڵەکانم لەبەر چاوان گەورە بکات، لێمی بکات بە تاوان. هەستا پەیژەیەکی گوریسی خستە ناو ژوورەکەم، و قەناعەتی بە بابم کرد و هەموو نۆکەران و خولامانی درۆزنی ماڵەکەی لێ بە شایەت گرتم، کە گوایە من لێبڕاوم دۆتمامەکەم، (ئەدیت) بڕفێنم و بۆ شوێنێکی دیکەی هەڵگرم و بەبێ پرس و رەزامەندی بابم زەماوەندی دەگەڵ بکەم.

ئەوەبوو بابم لە سزای ئەو کارەدا کە نەم کردبوو، بۆ سەربازی ناردم، بابم گوتی لەوەیە لە ماوەی ئەو سێ ساڵە سەربازییەدا، کە لە ماڵ و لە ئینگلیستان دوور دەکەمەوە، ببم بەسەربازێکی رەشیدو پیاوێکی باش و ئاقڵ، بۆیە سێ دانە ساڵ دووری خستمەوە. رۆژانی تاراوگەو نەفیم لە جەنگی نێوان وڵاتاندا بەسەر برد، دژواریانم بینی، تاڵی زۆرم چەشت، دەستکورتی و هەژاریم جەڕباند، و زۆر بویەرو واریقاتم بە سەرهات. لێ لە دوا شەڕدا بەدیلی گیرام و دەستبەسەرو دەربەدەر بردیانم و حەوت دانە ساڵی خشت لە زیندان و حەپسخانەی بێگاناندا، مامەوە. ئاقیبەت بەزەبری هۆش و زیرەکی و بێباکی و ئازایەتی خۆم لە زیندان ئازاد بووم و یەکسەر بۆ ئەم شارە هاتم. من تازە لە رێوە هاتووم، هەژارو دەستکورت و رووت و قووتم و تەنانەت نازانم لە ماوەی ئەم حەوت ساڵەدا چی بەسەر موڵکی هندن هۆڵ و دانیشتوانەکەی و دارو نەدارماندا هاتووە. بەڵێ خاوەنشکۆ ئەمە بوو حاڵ و حیکایەتە ناچیزەکەی من."

شای چکۆڵە لە حاڵێکا کە گڕی غەزەب و تورەیی لە چاوانی دەبووەوە گوتی:

"ئەلهەقەی کە غەدرێکی زۆریان لێکردوویت. بەڵام خەمت نەبێ من هەقت دەستێنم. قەسەم بە چەلیپا تۆڵەت دەکەمەوە. من پاشام و بەڵێنی شاهانەت دەدەمێ".

کە گوێی لە بەسەرهاتی مایلز بوو، ئەویش کەوتە سەر کەڵکەڵەو بەسەرهاتی نەگبەتیەکەی خۆی بۆ هاورێکەی گێڕایەوە. کاتێ چیرۆک و سەربهوردەکەی شا تەواو بوو، مایلز کە بێ ئەندازە سەرسام بوو بوو، لە دڵی خۆدا گوتی:

"تەماشا! بەڕاستی خەیاڵێکی سەیری هەیە! بەڕاستی ئەقڵ و خەیاڵی ئەم کوڕە ئاسایی نیە. بە هەرحاڵ شێت بێ یان ئاقڵ، ئەم منداڵە ناتوانێ ئەم چیرۆکە خەیاڵئەنگێزە لە خۆیەوەو لە هیچەوە دروست بکات و ئەم بەسەرهاتە دڵگیرە، بە بێ بنج و بنەوان دروست بکات. داماو خۆت پاشا، ژارۆ... نا، نەخێر هەرگیز نایەڵم ئەم منداڵە خەیاڵپەروەرە بێ دۆست و یارو یاوەر، بێ جێگەو رێگەو بێ داڵدەو سایە بێ، هەرگیز لە خۆمی دوور ناخەمەوەو نایەڵم بە بست لێم دوور بکەوێتەوەو دابڕێت، دەیگرمە ژێر باڵی خۆم و دەیکەم بە دۆستی چکۆلەی خۆم. من دڵنیام کە چاك دەبێتەوەو ئەم نەخۆشییەی چارەسەر دەبێت. من لەم رووەوە تەخسیری بۆ ناکەم. هەنگێ

بۆ خۆی ناوو نێوبانگێك پەیدا دەكاتو منیش شانازی پێوە دەكەمو بەسەربەرزییەوە دەڵێم: "برادەری منە، منداڵێكی وەیلانی بێ جێگەو رێگەو شڕپۆش بوو، لە سەرە رێگایان هەڵمگرتەوە، لێ كە سەیرم كرد چ گەوهەرێكی لە ناخدا پەنهانە، لە دڵی خۆدا گوتم كە رۆژێ دێ ناوو ناوبانگی دەكەوێتە سەرزاران. ئیدی بایەخم پێدا، سەرپەرشتیو چاودێرم كرد تا ئەم پیاوەی لێ دەرچوو، باشم كرد ئەم كارەم كرد؟"

لەم كاتەدا شا بە دەنگێكی خەمناك و سوپاس ئامێزو پێ زانییەوە گوتی:

"تۆ منت لە زوڵمو جوێنی خەڵكی رزگار كردو خۆشبەختانە گیانی منت كڕییەوەو بگرە تەختو تاجەكەشت رزگاركردم. ئەم خزمەتەی تۆ شایستەی پاداشتێكی گەورەیە. جا هەرچییەكت ئارەزوو لێیە داوا بكە تا من لە سنووری دەسەڵاتو توانای پاشایەتی خۆمدا بۆتی جێبەجێ بكەم."

ئەم پێشنیازە سەیرو عەنتیكەیە (مایلز هندن)ی لە دنیای خەونو خەیاڵان هێنایە دەرێ. هەوەڵجار ویستی سوپاسی لوتفو میهری شا بكاتو پێی بڵێ ئەوەی كردوویەتی بە حوكمی وەزیفەو ئەرك كردویەتیو چاوی لە هیچ پاداشتو خەڵاتێك نەبووە، و كۆتایی بەو سوعبەتو شۆخییە بێنێ، لێ بیرێكی ئاقڵانەتری بە مێشكدا هاتو مۆڵەتی خواست كە چەند دەقیقەیەك لەمەڕ ئەم لوتفو مەرحەمەتە شاهانەیە بیربكاتەوە. شا، لەو روانگەیەوە كە پەلە كردن دەربارەی مەسەلەیەكی وەها گرینگ كارێكی ئاقڵانەو دروست نیە، داواكەی لێ قەبووڵ كرد.

مایلز بۆ چەند ساتێك لەفكران راچوو و پاشان بە خۆی گوت: "بەڵێ، پیاو دەبێ ئەم دەرفەتە لە كیس نەدات، چونكە مەحاڵ بوو دەرفەتی وا لەبار بڕەخسێتەوە. هەڵبەتە ئەزموونی ئەم یەك سەعات وەستانە لە حوزوری ئەودا فێری كردم كە بەردەوامانەدنی ئەم تەرزە تێكەڵاویو پەیوەندییە هەمیشە زەحمەتو تاقەتبەرە. بەڵێ ئەوەی بەبیرمدا هاتووە دەیخەمە روو. ئەمە دەرفەتێكی یەجگار لە بارەو نابێ لە كیسی خۆمی بدەم." مایلز دوای ئەم مەنەلۆگە، هاتە سەرچۆكانو گوتی:

"خزمەتی ناچیزی بەندەی گیان فیدا لە سنووری ئەركی سادەی یەك رەعیەتی ئاسایی تێ نەپەڕیوە، بۆیە شایستەی ئەوە نیە كە هیچ پاداشتێكی لەسەر مەرحەمەت بكەن، بەڵام كە ویستی خاوەنشكۆ هاتووەتە سەر ئەوەی لە بری ئەو كارە پاداشتێك پێشكەش بكرێ. من رێگە بە خۆم دەدەم كە سەری جەنابی شا بیەشێنمو لەم بارەیەوە عەرزی جەنابی با سەعادەتیان بكەم كە: نزیكەی چوار سەد ساڵێك بەر لە ئێستا، وەكو لەلای خاوەنشكۆتان دیارە، دژمنایەتیەكی خوێناوی كەوتە نێوان جون، پاشای ئینگلیستانو پاشای فەڕەنساوە. قەراردرا كە دوو پاڵەوان لە هەردوو لاوە بێنو لە مەیدانی شەڕدا بكەونە دوئێلو بەمجۆرەو بە ویستی خواوەندی عالەم كۆتایی بەم دژمنایەتیە بێنن. ئەم دوو پاشایەو پاشای ئەسپانیا لە مەیدانی شەڕەكەدا ئامادە بوون، بوون بە داوەری دوئێلەكە، پاڵەوانەكەی فەرەنسا هاتە مەیدان، لێ هێندە زەلامو بەهێزو بە سامو ترسناك بوو كە پاڵەوانانی ئینگلیزی ئێمە ئامادە نەبوون رووبەڕووی ببنەوە. بەمجۆرە ئەو مەسەلە هەرە گرینگە، لەزگ بوو، بە هۆی ئامادە نەبوونی حەریفێكی دلێرەوە، بە زبانی پاشای

ئینگلیسـتان بشـکێتەوە. لـەو سـەروبەندەدا لـۆرد کورسـی، گـەورەترینو بـەهێزترین پاڵـەوانی ئینگیستان چەند ساڵێك بوو لە زیندانی بورجی لەندەندا بوو، و لە هەموو ئیمتیازو سەروەتو داراییەکی خۆی بێ بەش کرا بوو،و یەکسەر داوایان لێکرد بێتە مەیدان. رازی بوو و ئامادەی شەڕەکە بوو، لـێ پاڵـەوانی فەرەنسا هـەر کـە چاوی بـە هەیکـەلی رەشـیدی ئـەو کـەوتو نـاوو ناوبانگی بیست، هەڵاتو پاشای فەرەنسا لەم دادگاییەدا مەحکوم کرا. شای ئینگلیستان، ئیمتیازاتو لەقەبو سەروەتو داراییەکانی لۆرد کۆرسی گەڕاندەوەو گوتی: نیازو مرازی خۆت بڵێو دڵنیابە هەر شتێکت بوێ، جێبەجێ دەکرێت، ئەگەر بە بەهای نیوەی وڵاتەکەشم تەواو بێت. هەنگێ لۆرد کۆرسی، وەکو چۆن من ئێستا بە چۆکا هاتووم، بە چۆکا هاتو عەرزی کرد: "شاها داوای من ئەمەیە، دەمەوێ خۆمو نەوەکانی دوای خۆم تا ئینگلیستانو سەڵتەنەتی ئینگلیستان بەرقەرار بێ، ئەم هەقەمان هەبێ کە لە حوزوری شادا، کڵاو لەسەر دانەگرین. بەڵێ وەکو خاوەنشکۆ تانش دەزانن ئەم داوایەی لۆرد کۆرسی قەبووڵ کرا. لەو ساوە تا ئێستا چوار سەد ساڵ تێ پەڕێوەو وەجاخی ئەو ماڵباتە کۆنە کوێر نەبووەتەوەو ئێستاشی لەگەڵ بێ نەوەی ئەوان ئەو هەقەیان هەیە کە لە حوزوری خاوەنشکۆ، پاشای ئینگلیستاندا کڵاویان لەسەر بێ، جگە لەوان هیچ کەسێکی دی ئەو هەقەی نیە. جا من بۆیە ئەم چیرۆکەم گێڕایەوە دەمەوێ داوا لە خاوەنشکۆ، پاشا بکەم کە بە منو بە نەوەکانی من ئەم هەقە بدرێ –هەقێکە کە لە هەر پاداشتێك باڵاترەو جگە لەوە هیچی ترم نەگەرەکە– کە هەمیشە هەقی ئەوەمان هەبێت لە حوزوری پاشای ئینگلیستاندا دابنیشین."

شا بەوپەڕی ویقارەوەو هەر بە شمشێرەکەی خودی هندن، پایەی شاسواری دایەو گوتی: "رابە ئەی نەجیمزادەی دەرباری من، سێر مایلز هندن رابەو لە حوزوری مندا دانیشە، داواکەت پەسندکرا. تا ئەو رۆژەی ئینگلیستانو تەختو تاجی ئینگلیستان بەرقەراربێ ئەم هەقە لە تۆو لە نەوەکانی دوای خۆت ناسەنرێتەوە."

شا، بەدەم هزرینەوە بە ژوورەکەدا کەوتە هاتوچۆ، هندن خۆی دا بە کۆڵی کورسییەك داو لە پشت مێزەکەوە دانیشتو لە دڵی خۆیدا گوتی: "کە بیرێکی باشم کردەوەو چاك خۆم لەم عەزابە رزگار کرد! بەڕاستی لاقەکانم ماندوو بوو بوون، خۆ ئەگەر ئەم بیرەم نەکردبوایەوە، دەبوایە لایەنی کەم چەند هەفتەیەك بەسەر پێیانەوە بوەستم تا ئەم کوڕیژگە داماوە چاك ببێتەوە." مایلز قەدەرێك راماو دیسان لە دڵی خۆیدا گوتی: "ئێ، ئێستا بەم حیسابە من بووم بە نەجیبزادەی دەرباری مەملەکەتی خەونو خەیاڵ! ئەلهەقی کە ئەم کارە بۆ بێ سەروبەرو رووتەیەکی وەکو من عەجیبە، لێ من نابێ پێبکەنمو خودا نەکا کە پێ بکەنم. چونکە ئەوەی کە لە لای من بێهودەو بێ مانایە، لەلای ئەو حەقیقەتو راستییە، لێ بەلای منیشەوە لە روویەکەوە درۆو ئەفسانە نیە، چونکە هەر هەموو ئەمە نیشانەو رەنگدانەوەی روحی پاكو میهرەبانو بێگەردی ئەوە." هەمدیس مایلز قەیەرێ لە فکران ڕاچوو و بە خۆی گوت: "بەڕاست ئەگەر لەبەردەم خەڵکیدا بەم لەقەبو عینوانە کۆمیدیو غەریبە بانگم بکات چ بکەم. ئەوسا چ هەڤدژیەکی سەیر لە نێوان

ڕواڵەتی پەرپوتو هەژارانەی منو ئەو عینوانو لەقەبە قەبەو بە بریقو باقە بەرچاو دەکەوێ. لێ قەیدی نیە. با بە هەر ناوێك کە خۆی حەزی لێدەکات بانگم بکات: ڕازیم بە ڕەزای ئەو."

((١٣))

## دیار نەمانی شازادە

جووتە هاوڕێ زۆریان خەو دەهات. پاشا گوتی:

"ئەم شڕوشیتاڵە داکەنە!" مەبەستی لە شڕوشیتاڵ جلکەکەی خۆی بوو.

هندن، بێ چەندوچوون، جلەکانی لەبەر کوریژگەکە داکەندو لەسەر تەختەخەوەکەی خەواند. ئەوسا چاوێکی بە کونو کەلەبەرێن ژوورەکەدا گێڕاو، بەداخو کەسەرەوە بە خۆی گوت:

"ئەمجارەش تەختەخەوەکەی گرتم، خوایە چ بکەم؟" شازادە هەستی بە شپرزەیی هندن کردو بە یەك قسە ئیشێکی پێ سپارد، بە چاوی خەواڵووەوە گوتی:

"تۆ لە دەرێی دەرگاکە بخەوەو پاسداری بکە."

ئەو قسەیەی کردو دوای تۆزێك خەوێکی قووڵی لێکەوت.

هندن لە بن لێوانەوە گوتی:

"ئەم کوڕە نازدارە، دەڵێی بەڕاستی بەشازادەیی هاتووەتە دنیاوە! تۆ تەمەشا چەند جوان دەوری خۆی دەگێڕێ."

پاشان لەو دیو دەرگاکەوە، لە عاردی ڕاکشاو بە ئارامیو ئاسودەیی بە خۆی گوت:

"من حەوت ساڵ لەوەپێش وەزعم لە ئێستای ئەم کوڕە خراپتر بوو. ئەگەر لەم وەزعەی ئێستا بە گلەیی بم، مانای وایە لە دەرگای خودادا ناشوکریم کردووە."

بەڵێ، دەمەوبەیانی هندن خەوی لێکەوت.. نزیکی نیوەڕۆ لە خەو ڕابوو، و لێفەکەی لەسەر هاوڕێکەی لابردو بە داوێك ئەندازەی بەدەنی گرت. پاشا، ڕێك لەو دەمەدا کە هندن کارەکەی خۆی تەواو کردبوو، لە سەرما لە خەو ڕاپەڕیو لێی پرسی مژولی چی بووی.

هندن گوتی:

"ئەزبەنی، کارەکەم تەواو بوو، جا من تۆزێ کارم هەیەو دەچمە دەرێ، لێ زوو دەگەڕێمەوە، تۆ بخەوە، چونکە ماندوویتو پێویستت بەخەوە. با سەریشت داپۆشم تا زووتر گەرمت ببێتەوە."

هێشتا هندن لە قسەکەی نەبوو بووەوە کە پاشا دیسان خەوی لێکەوتەوە. مایلز بە ئەسپایی لە ژوورەکە وەدەرکەوتو دوای ٣٠-٤٠ دەقیقەیەك گەڕایەوەو بە ئەسپایی خۆی وەژووردا کرد. دەستێك جلکی کوڕانەی نیوداشتی هەرزان بەهای دەگەڵ خۆدا هێنابوو کە هێشتا بەشی چەند مانگێك بەکارهێنانی پێوە مابوو، دانیشتو کەوتە هەڵگێڕو داگێڕی ئەو جلەی کە کڕی بوویو لە بن لێوانەوە گوتی:

"ئەگەر پارەم هەبوایە شتێکی باشترم بۆ دەکڕی، بەڵام کە پیاو نەی بوو، دەبێ بە کەم ڕازی بێ".

ئەوسا لەبەر خۆیەوە کەوتە چرینی ئەم گۆرانیە:

"لە شاری ئێمەدا ژنێك هەبوو...

که ماڵی له شاری ئێمه بوو...."

لێ له پڕ گۆرانیەکەی بڕیو گوتی:

"ئا، دەبێ هێواشتر گۆرانی بڵێم.نابێ خەوی بزڕێنم. سەفەرێکی دوورو درێژی لەبەرەو بەلەنگازە زۆریش ماندووە. ئەم جلەش بۆ ئەو باشە، تەنیا یەك دوو تەقەڵی لێرەو لەوێ دەوێو ئیدی عەیبی نامێنێ. ئەمەیان باشترەو یەك دوو کۆك وباقیە زیاتری ناوێ... ئەم پێڵاوەش زۆر چاکەو پێیە ناسکەکانی گەرم دەکاتەوەو لە تەڕیو رتوبەتی دەپارێزێ. ئەم پێڵاوە بۆ ئەو شتێکی تەواو تازەیە، چونکە بێگومان تا ئێستا بەوە راهاتووە کە زستانو هاوین بە پێ خاوسی بسوڕێتەوە... دەی با دەرزییەك بێنمو دەزوویەکی پێوە بکەم، لێ دەزوو بە دەرزی کردنەوە کاری شەیتانە، نازانم بۆم دەکرێت یان نا."

دەرزیو دەزووی هەڵگرتو کەوتە کار، لێ کارەکەی پیاوانە بوو، یانی بەو جۆرە بوو کە پیاوان دەزوو بە دەرزییەوە دەکەن. دەرزییەکەی راست گرتو سەری دەزووەکەی بۆ لای کونی دەرزییەکە دەبرد. دەزووەکە یان لەملاو لەولای دەرزییەکەوە تێپەڕی یان بەر دەرزییەکە دەکەوتو خوار دەبووەوە. چەندین جار خۆی تاقیکردەوەو دەزووەکەی بۆ پێوەنەکرا. لێ ئەو کابرایەکی بە سەبرو حەوسەڵە بوو، و لە رۆژانی سەربازیدا زۆری لەم کارانە کردبوو. ئاقیبەت دەزووەکەی بە دەرزییەکەوە کرد، جلەکانی بەردەم خۆی هەڵگرتو دەست بەکار بوو. لە دڵی خۆیدا دەیگوت:

"کرێی ژوورەکەم داوە. خواردنی بەیانیش کە ئێستا دەی هێنن، لەسەر کرێی ژوورەکە حیسابە. ئەوەندەشم پارە پێ ماوە کە جووتێ کەر بکڕمو ئازووقەو توێشوی دوو سێ رۆژی پێ دابین بکەم، و هندن هول خۆت بگرە واهاتین، هەر بگەینە ئەوێ ئیدی دەکەوین بەسەر خێر و خۆشی دا."

ئەوسا هاتەوە سەر گۆرانیەکەیو گوتی:

"ئەو ژنە مێردەکەی..."

ئاخ دەرزییەکە چوو بە نینۆکم دا... ئاخ! دەی گوێ مەدەیە. من بەم نێشو ئێشانە راهاتووم، هەر هیچ نیە... بەڵێ چکۆلەکەم، بێگومان لەوێ بەختەوەرو شاد دەبین. هیچ گومانێکت لەوە نەبێ! لەوێ مەینەتیو بەدبەختی تۆ کۆتایی دێتو نەخۆشیەکەت دەڕواتو دەپەڕێ...

ئەو ژنە، مێردەکەی خۆی بە دڵو بە گیانی خۆش دەویست... بەڵام پیاوێکی دی هەبوو کە...".

دوای ئەوەی جلەکانی دورینەوە، بە خۆشیەوە سەیرێکی کردنو لە دڵی خۆیدا گوتی: "بەه بەه! تەماشا چ دەستو تەقەڵێکم هەیە! باوەڕ بکە کاری خەیاتیش بەم کارەی مندا ناگات."

"ئەو مێردەکەی خۆی بە دڵو بە گیان خۆشدەویست،

لێ پیاوێکی دی هەبوو کە حەزی لەو ژنە دەکرد..."

"ئۆیف! کارەکەم تەواو بوو! چەند زۆر بوو! جا با ئێستا بێداری بکەمەوە، جلەکانی لەبەر بکەم، ئاو بە دەستیا بکەمو خواردنی بدەمێو هەنگێ پێکەوە بڕۆین بۆ گەڕەکی ساوتۆرك- ئەزبەنی

تكايه هەلو، ڕابە —چیه بۆ وەڵام نادەیەوە! ئەزبەنی ڕابە، هەستە... نەخێر وەڵام ناداتەوە، چار نییه دەبێ دەست بە بەدەنی شەریف و موبارەکیدا بێنم تا هەستێ، خەوەکەی قورسەو گوێی لە قسەکانم نیه. یانی چی!"

هندن، لێفەکەی هەڵدایەوە، لێ کوڕیژگەکە ڕۆیی بوو! بۆ چەند ساتێك بێ ئەوەی هیچ بڵێ، ڕوانیە دەوروبەری خۆی و سەیری کرد نەك هەر کوڕیژگەکە، بەڵکو جلە شڕەکانیشی دیار نیە.

بەرە بەرە نیگەران بوو، دەستی بە هات و هاوارکردو خاوەن ئوتێلەکەی گاز کرد. لەم کاتەدا بۆ یەك بە سینییەکەوە کە تاشتی لەسەر بوو، وەژوورکەوت.

کابرای دەهری بە دەم بۆڵە بۆڵەوە گوتی:

"ئەی توخمی شەیتان، ڕاستم پێ بڵێ، کوڕەکە چی لێهات، دەنا کارت کراوە."

هێندە دڕندانە بەرەو کابرای بۆی تاوی دا، کە زمانی بەستراو لە ترس و سەرسامیدا لە جێی خۆی وشك بوو.

"بڵێ بزانم، کوڕەکە کێوە چوو!"

بۆیەکە، بە پچڕپچڕی و بە دەنگێکی لەرزۆك کەوتە وەڵامدانەوەی و گوتی:

"جەنابت تازە تەشریفت بردبووە دەرەوە کە کوڕێکی لاو بە پەلە پەل هات و گوتی کە جەنابت فەرمووتە کوڕیژگەکەی لەمەڕ خۆت، بێ بۆ سەر پردی ساوتۆرك: من ژوورەکەی تۆم بەولاوە نیشان دا، کە کوڕیژگەکەی لە خەو هەستان، ئەو بەستەزمانە تۆزێکی پڕ تاندوبۆڵاند کە بۆچی بەو بەیانی زووە بێداریان کردووەتەوە، ئەوسا جلە شڕەکانی خۆی لەبەر کردو دەگەڵ ئەو لاوەدا ڕۆیی و تەنیا ئەوەندەی گوت کە بریا تۆ خۆت تەشریفت دێناو ئەم لاوە بێگانەیەت بە دوویدا نەدەنارد".

"بەڕاستی تۆ کابرایەکی کەودەنی، زوو دەخەڵەتێی! بڕۆ گوم بە لەبەر چاوم کەرپیاو! هەر خودا بکات شتێکی بەسەر نەهاتبێ، هەر ئێستا دەڕۆم بە دوایدا، تۆ مێزو خوانەکە ئامادە بکە!! ڕاوەستە. بزانم، بۆچی لێفەکەیان بە جۆرێ دانابوو، پیاو وابزانێ کەسێکی لە ژێردا خەوتووە؟ ئایا ئەمە بە ڕێکەوت بووە یان ئەم ماستە موویەکی تێدایە؟"

"قوربان، من ئاگام لێی نیە. تەنیا ئەوەندەم بینی کە کورە لاوەکە خەریکی لێفەکە بوو، ئەو لاوەی عەرزم کردی کە بە دووی کوڕیژگەکەدا هاتبوو."

"شەکڵت مریێ! ئەو کارەی بۆ تەفرەدان و چەواشەکردنی من کردووە، بۆ ئەوەی دەرفەتی هەبێت. باشە ئەولاوە هەر بە تەنێ بوو؟

"بەڵێ ئەزبەنی بە تاقی تەنیا بوو."

"دڵنیایت؟"

"بەڵێ، ئەزبەنی زۆر دڵنیام."

"باش بیر بکەوە."

دوای چەند ساتێك تێفکرین و ڕامان کابرای بۆی گوتی:

"کاتیٚ لاوەکە هات هیچکەسێکی دەگەڵ نەبوو، بەلاّم ئێستا بیرم دێتەوە کاتیٚ کە دەگەڵ کوڕیژگەکەدا بەرەو پردەکە دەڕۆییشتن، کابرایەکی وەیلانی روتەڵەی ناشیرین لە پەنایەکەوە هاتە دەریٚو لەو دەمەدا کە دەیویست بەگەڵ وان بکەویٚ...

هندن، سەبری سوا، قسەکەی پیٚ بڕیو گوتی:

"چیتر، دەبلّیٚ دەی، قسە بکە، چیتر؟!"

"ئیدی شەپۆلی ئاپۆڕای خەڵکەکە رایماڵین‌و لەبەر چاوم ون بوون. چونکە لەو کاتەدا ئاغام بانگی کردم‌و لەوە تورە بوو کە ئەنجامدانی ئەمرێکی ئەوم بیر چوو بوو. قەسەم بە هەموو مقەدەساتی عالەم، بەندە بیٚ تاوانم‌و بە ئەندازەی منداڵێکی ساوای شیرەخۆرەش گوناحم نیە."

"هەیدیٚ، لەبەر چاوم گوم بە، هەی کەودەن! ئەم وڕێنانەی تۆ شێتی کردم. بوەستە، کێوە دەچیت؟ ناتوانیٚ دەقیقەیەك سەبر بگری؟ ئەو کەسانە بەرەو پردی ساوتۆرك رۆییشتن"

"بەلّیٚ قوربان، وەکو پێشتریش عەرزم کردیت من بە ئەندازەی منداڵێکی شیرە خۆرەش گوناحم نیەو هیچ تەخسیرێکم نیە."

"ئەوە تۆ هێشتا لێرەیت‌و هەر چەنەبازی دەکەی؟ بڕۆ تا حەسیرمەیدانم نەکردوویت." کابرای بۆی رۆیی، هندن-ش لە دوای ئەوەوە رۆیی، لیٚ پێشی کەوت‌و هەردوو پلەی بە یەك جار دەبڕیو لە بن لێوانەوە بە خۆی دەگوت:

"ئەمە کاری ئەو بۆرەپیاو هیچ‌و پوچە بیٚ شەرەفەیە کە دەیگوت بابی ئەوە. حەیفیٚ ئاغا چکۆلە بەلەنگازەکەی خۆم لە دەست دا. بەڕاستی چیرۆکێکی خەمناکە. ئەی ئەرباب‌و ئاغای ئازیز، تازە خۆشەویستی‌و مەحەبەتی تۆم لە دلّ چەسپی بوو. نا، نەخێر، قەسەم بە خواو بە ئاسمانان لە دەستم ناچیت، چونکە هەموو دنیات بۆ دەدەمە ژێر پێیان‌و تا نەتدۆزمەوە وازناهێنم. داماو خۆت، تێشتەکەمان سارد بووەوە، قیروسیا، من ئیشتیام نەما، دلّم تۆرا، با مشکان بیخۆن. خێراکە، خێرا! ماتەلّ مەبە!"

کە بە نێو ئاپۆڕای پڕ سەروسەدای سەر پردی لەندەندا تێدەپەڕی‌و بە دووی کوڕیژگەی ناڤبریدا دەگەڕا، لە ناخەوە خۆی دەدواند‌و بەوە دلّ خۆش بوو کە کوڕیژگەکە، لەسەر قسەی ئەو رۆییشتووە.و لە بن لێوانەوە دەیگوت:

"راستە بە پرتەو بۆڵە بوو، بەلاّم رۆیی، بۆیە رۆییوە چونکە وای وێنا کردووە کە مایلز هندن ناردویەتی بە شوێنیا."

"ژارۆ، چەند منداڵێکی باش بوو، من دەماری دەناسم، و دلّنیام ئەگەر هەر کەسێکی دی جگە لە من، بە شوێنیا ناردبا، بە گوێی نەدەکرد‌و بە دەنگییەوە نە دەچوو."

((١٤))

## پاشا مرد- بژی شا

تۆم کانتی دەگەڵ گەردی بەیانیدا لە خەوێکی قووڵ رابوو، و لە تاریکییەکەدا چاوی هەڵێنا، و بۆ چەند ساتێك لە فکران راچوو تا بە بیرە پەشێوو پەرێشانەکانی خۆی دا بچێتەوەو لەو بەینەدا شتێك حاڵی بێت، لە پڕ بەوپەڕی شادیو خۆشی لە دڵی خۆیدا گوتی:

"ئێستا ئیدی هەموو شتێ دەزانمو لە هەموو شتێ تێدەگەم! سوپاس بۆ خودا کە ئاقیبەت بێدار بوومەوە. ئەی شادی لە کوێی! تۆ وەرە! ئەی خەم تۆ بڕۆ! دەی نەن، دەی بت، دەی ڕابن، وەرن بۆلای من، با سەیرترین خەونتان بۆ بگێڕمەوە، خەونێك کە کەس نەیدیوە، ئاە نەن، بت!".

تاپۆیەکی کاڵ لەلاوە پەیدا بوو، دەنگێکی لێوە هاتو گوتی:

"قوربان، ئەمرێکتان هەبوو؟... فەرمووو!"

"ئەمر؟... ئەمری چی! چما من کێم؟ من دەنگی تۆ ناناسم. بڵێ بزانم من کێم؟"

"قوربان، تۆ دوێ شەو وەلیعادی ئینگلیستان بووی، لێ ئەمڕۆ خاوەنشکۆ ئیدوارد پاشای وڵاتی!"

تۆم سەری بردە ژێر نوێنە نەرمو ناسکەکەیو بە دڵێکی پڕ لە خەمو کەسەرەوە، لە بن لێوانەوە گوتی:

"بەداخەوە ئەوەی دەمبینی خەو نەبوو! ئاغا بڕۆ، بنووە، بە دەردی خۆمەوە لێمگەڕێ."

تۆم جارێکی دی خەوتەوەو خەونێکی خۆشی بینی، لە خەویا هاوین بوو، و بە تاقی تەنیا لە سەوزەزارو چیمەنێك دا بە نێوی میرگوزاری (گولدمنس فیلدن) یاری دەکرد. پیاوێکی کورتە باڵای لێ پەیدا بوو، کە باڵای هەر دوو بست دەبوو، ردێنێکی سووری درێژی هەبوو، لێی هاتە پێشەوەو گوتی:

"کوڕۆ ئێرە هەڵکەنە!"

هەمان شوێنی هەڵکەندو دوانزە دراوی یەك (پنی) نوێو بریقەداری دۆزییەوە. دوانزەپنی پارەیە نەگاڵتە! بەڵام خەوەکە لێرەدا نەبڕایەوە. ئەو کابرایە هەمدیس گوتی: "من تۆ دەناسم. تۆ کوڕێکی باشو بەختەوەری، با مژدەت بدەمێ کە رۆژانی بەدبەختیو نەگبەتیت بەسەر چووو رۆژانی خۆشیو شادیت هاتووە. تۆ هەموو هەفتەیەك وەرەو ئێرە هەڵکەنەو دوانزە پنی نفتو نوێ بخە تەنکەی باخەڵت، لێ ئەم رازە لە دڵی خۆتا هەڵگرەو بە کەسی مەڵێ.

هەنگێ کابرای کورتە باڵا دیارنەما، تۆم بە هەشتاو بەرەو گەڕەکی ئۆفال کورت وەرێکەوت، لەبەر خۆیەوە دەیگوت:

"ئیدی هەموو شەوێك (پنی)یەك دەدەم بە بابمو وا دەزانێت کە بە سواڵ پەیدام کردووە. ئیدی دڵی پێ خۆش دەبێتو چیتر لێم نادات. (پنی)یەکیش دەدەم بەو کەشیشە دلۆڤانەی کە دەرسم پێدەڵێتو ئەویتری کە چوار پنییە بەسەر دایکمو جووتە خوشکەکەمدا دابەش دەکەم. ئیدی بۆ خۆ لە هەژاریو برسێتی رزگار دەبینو لە ترسو لەرزی سزاو تەمبێو لە کارێن سووك دەخەلەسین."

تۆم بە دەم خەونەکەیەوە گەیشتەوە ماڵی خۆیان، لە حاڵێکا کە چاوانی پرشنگی شادییان لێ دەبووەوە، چوار پنی خستە دەستی دایکییەوەو گوتی:

"بگرە دایکە گیان، ئەم پارەیە بۆ تۆو بۆ (نەن و بت)ی خوشکم. ئەوەش بزانە کە ئەم پارەیەم لە ڕێگەیەکی دروست و ئابڕومەندانەوە پەیدا کردووە، نەك لە ڕێگەی دزی و دەرۆزەوە."

دایکی زۆر شاد بوو و توند بە سینگ و بەرۆکیەوەی گوشی و گوتی:

"درەنگە، ئایا خاوەنشکۆ بە تەما نیە لە خەو ڕابێ؟"

تۆمی بەلەنگاز چاوەڕوانی ئەو وەڵامە نەبوو. خەونەکەی ڕەوییەوەو چاوی کردەوە. سەیری کرد کە لۆردی یەکەمی مەملکەت، کە پاسەوانی ژووری نووستنەکەی ئەوی لەسەر بوو، بە دیار جێگەکەیەوە چۆکی داداوە. خۆشی و شادی خەونە خۆشەکەی ڕەوییەوە. ئیدی بەلەنگازە بۆی دەرکەوت کە هێشتا پاشایەو لەم کۆشکەدا دیلە. ژوورەکە پڕ بوو لە دەست و پێوەند کە هەموو جل و بەرگی سوورو ئەرخەوانیان لەبەر بوو —ئەم ڕەنگە ڕەنگی تازیەباری بوو— تۆم لەسەر جێگەکەی خۆی دانیشت و لە پشت پەدەێن حەریرەوە ڕوانیە ئەوانەی دەوروبەری خۆی.

ئەوسا جل لەبەرکردنی شا دەستی پێکرد. دەستوپێوەندی دەرباری یەك لە دوای یەك لەو کاتەدا کە شا سەر قاڵی جل لەبەر کردن بوو، کڕنۆشیان دێناو دەهاتنە سەرچۆکان و بە بۆنەی ئەو خەسارەتە گەورەیەوە سەرخۆشیان لێدەکرد. تەشریفات و ڕێوڕەسمی جل لەبەر کردنی شا بەمجۆرە بوو کە سەرەتا لۆرد میرئاخور کراسەکەی شای هەڵگرت و دایە دەستی میرشکاری مەزن، میرشکار دایە دەستی بەرپرسی جل و بەرگی کوشك، و ئەویش دایە دەستی جەنگەڵوانانی بێشەی ویندزور، ئەویش کراسەکەی دایە فەڕاشباشی ستول و ئەویش دایە سەرۆکی دۆکنشینی لانگستر. ئەویش دایە بەپرسی جاڕچیان و سەرۆکی جاڕچیان دای بە ئەفسەری پارێزەری بورجی لەندەن. ئەفسەری پارێزەر دایە سەرۆکی پاسەوانانی دەربارو ئەویش دایە سەرۆکی جل و بەرگان کە ئەو لەقب و عینوانەی پشتاو پشت بۆ مابووەوە. سەرۆکی جل و بەرگان دای بە ئەمیراڵی ئینگلیستان ئەویش دایە دەست سەرۆکی کەشیشانی کانتربوری و سەرەنجام لۆردی گەورەی دەربار کە پاسەوانی ژووری نووستنی شا بوو، وەریگرت و لەبەری شای کرد. کوڕێژگەی داماو بەمەدا ئەوەی بیرکەوتەوە کە چۆن لە کاتی ئاگر کەوتنەوەداو بۆ کوژاندنەوەی ئاگرەکە سەتڵە ئاو دەستاو دەست دەگێڕن.

هەر پارچەیەك لە جلەکانی شا دەبوایە بەوپەڕی ویقارو شکۆوە دەستاو دەست بکات. تۆم لەم تەشریفاتە وەڕەز بوو بوو، کە بینی خەریکە گۆرەوییە ئاوریشمینەکانی دێنن لەدڵی خۆیدا سوپاسی خوای کرد کە تەشریفاتەکە لە تەواو بووندایە، بەڵام ئەو خەیاڵ پڵاوەی زوو کەڕوی هەڵێنا بوو، چونکە لۆردی گەورە، پاسداری ژووری شا، لەو دەمەدا کە گۆرەوییەکەی گرتبوو، و دەیویست لە پێی تۆمی بکات، لە پڕ ڕەنگی سوور هەڵگەڕاو یەکسەر گۆرەوییەکەی بۆ گەورە بەرپرسی کەشیشانی کلێسای کانتربوری گەڕاندەوەو بەنیگایەکی پڕ لە سەرسامی گوتی: "جەناب سەیری بکە" ئەویش گۆرەویەکەی دا بە ئەمیراڵ (دەریا سالار)ی ئینگلستان و ئەویش دای بە گەورە بەرپرسی جل و بەرگان کە ئەم لەقەب و پایەیەی بە میرات بۆ مابووەوەو بە شپرزەیی و بێتاقەتی گوتی: "جەنابی لۆرد تەماشای بکە!" بەمجۆرە گۆرەوییەکەی بە هەمان ڕێگەدا کە لێوەی هاتبوو، گەڕایەوە تا بە دەستی سەرۆکی پارێزەرانی دەربارو ئەفسەری

پاسەوانی بورجی لەندەن‌و سەرۆکی جارچییان‌و خەزنەدارباشی‌و سەرۆکی دۆکنشینی لانگستر و فەڕاشباشی (ستول)و سەرۆکی جەنگەڵوانانی بێشەی وێندزورو میرشکاری گەورەو ئەنجام بە دەستی میر ئاخوڕی شا گەییشتەوە. میر ئاخور بەم ڕێکەوتە نالەبارە تێك چوو، و ڕەنگی هەڵبزڕکاو بە ئەسپایی گوتی: "داوێکی گۆڕەوییەکە دەرهاتووە، دەبێ بەرپرسی گۆڕەوی سەڵتەنەتی بۆ زندانی بورجی لەندەن ڕەوانە بکرێت." ئەوجا لە ترسا خۆی بە شانی میرشکار باشییەوە گرت تا هێزی تێ بگەڕێتەوە.

لەم کاتەدا جووتێ گۆڕەوی دیکەی بێ عەیبیان هێنا. جا چونکە هەموو شتێك کۆتایی خۆی هەیە، ئاقیبەت تۆم کانتی توانی لە ژووری نووستنەکەی بێتە دەرێ. خزمەتکارێکی تایبەتی ئاوی بە دەستیا کرد، و یەکێکی دی کەوتە شتنی،و نۆکەرێکی تایبەتی دیکە بە خاولیەکی خاوێنەوە لەو نزیکانە وەستا بوو و چاوەڕوانی تەواو بوونی کارەکە بوو. کاری شۆردن‌و پاکوخاوێنی تۆم تەواو بوو. ئەوسا بۆ ئارایشی شاهانە ئامادە بوو. کە لە ژێر دەستی وەستای ئارایشت هاتە دەرێ، بوو بوو بە کوڕێکی دی، هێندە جوان بوو بوو زیاتر لە کچانی خشکۆك‌و شەنگوڵ دەچوو تا کوڕ. جلێکی حەریری سووری تۆخی لەبەر بوو، کڵاوێکی ڕەنگ ئەرخەوانی پەڕداری لەسەر بوو، بەم جەلال‌و شکۆیەوە بەرەو ژووری نانخواردن ڕۆیی‌و دەست‌و پێوەندو دەرباریان ڕێگەیان بۆ چۆڵ دەکردو کڕنۆشیان بۆ دەبردو دەهاتنە سەر چۆکان.

دوای نانی بەیانی (تۆم)یان بە تەشریفات‌و ڕێوڕەسمێکی گەورەو بە هاوڕێیەتی گەورە ئەفسەران‌و پەنجا قەراوڵی تایبەتی کە تەورزینی زێڕنیشانیان بە دەستەوە بوو، بۆ هۆڵی پاشایەتی بردو تۆم لەوێندەر دەستی بە کاروباری دەوڵەت کرد. خاڵی، هرتفورد بە مەبەستی ئامۆژگاری‌و ڕێنوێنی شا، لە پاڵ تەختی پاشایەتیدا وەستا‌و کەوتە ئامۆژگاری‌و ڕێنوێنی ئاقڵانەو حەکیمانە.

چەند ناودارێکی مەملەکەت کە لەلایەن شای ڕەحمەتیەوە ڕاسپێردرا بوون سەرپەرشتی جێبەجێ کردنی ڕێوڕەسم‌و تەشریفاتی کفن‌و دفنی ئەو بکەن، بە خزمەتی شای تازە مشەڕەف بوون تا داوای مۆڵەتی لیبکەن کە بکەونە ئەنجامدانی ئەرکی خۆیان. هاتنی ئەوان بۆ لای شای تازە، تەنیا بە مەبەستی ڕێزگرتنی داب‌و نەریتی باو بوو. ئەسقوفی گەورەی کڵێسای کانتربوری مەرسومی ئەنجوومەنی سەرپەرشتیاری کفن‌و دفنی خاوەنشکۆی بە دەنگی بەرز خوێندەوەو ناوی ئەندامانی ئەنجوومەنەکەی بەمجۆرە ڕاگەیاند:

ئەسقوفی کانتربوری، لۆرد سەرەك وەزیرانی ئینگلیستان، ویلیام لوردسانت جۆن، لۆرد جۆن ڕاسل، ئیدوارد لۆرد هرتفورد، جۆن ویکنت لاپل‌و کوت برت-ی کەشیشی دورهام.

تۆم کە لە یەکێك لە ڕستەکانی ئەم مەرسوومە حاڵی نەبوو بوو، بێئەوەی گوێ لە ئەسقوفی گەورە بگرێ، بە شپرزەیی سەری وەپەنا گوێی لۆرد هرتفورد ناو گوتی:

"تێ نەگەییشتم. چ ڕۆژێکیان بۆ ناشتنی جەنازەکە داناوە؟"

"قوربان، ڕۆژی شازدەی مانگی داهاتوو"

"کە شێتن! باشە جەنازەکە تا ئەو ڕۆژە تێك ناچێت؟"

تۆمی بەلەنگاز ئاگای لە داب و نەریتی شاهان نەبوو، ئەو لە ئوفال کورت دا ئەوەی بینی بوو کە مردووان بە زووترین کات دەنێژن. لیَ لۆرد بە یەك دوو وشە هێوری کردەوە.

لەم کاتەدا سەرۆکی تەشریفاتی پاشایەتی داوایەکی عەرزی شا کرد کە سبەینیَ سەفیرانی فەرەنگی بە حوزوری شا مشەرەف دەبن و داوای مۆڵەتی هاتنە ژوورەوەی بۆ کردن.

تۆم نیگایەکی پرسیار ئامێزی لۆرد هرتفوردی کرد. هرتفورد بە ئەسپایی گوتی:

"هەڵبەتە خاوەنشکۆ مۆڵەتیان دەفەرمیَ. ئەو سەفیرانە لەلایەن پاشایانی خۆیانەوە نێردراون تا هاوخەمی پاشایانی ناڤبری بە خودی خاوەنشکۆو بە وڵاتی ئینگلیستان رابگەیەنن".

تۆم بە رێنوێنییەکانی لۆرد هرتفوردی کردو مۆڵەتی تەشریف هێنانی سەفیرەکانی دەرکرد. سکرتێرێکی دیکە هات و لیستی خەرجیەکانی دوا شەش مانگی ماڵەکەی خاوەنشکۆی رەحمەتی خوێندەوە. کۆی خەرجیەکانی بیست هەزار لیرە بوو کە هێشتا نەدرا بوو. دەرکەوت کە خەزینەکەی شا بە تاڵەو کارمەندانی دەربار کە ژمارەیان هەزارو دوو سەد کەس بوون نەیاندەزانی مووچەی خۆیان کەی و لە کویَ وەربگرن.

تۆم،هەڵچوو، بەوپەڕی شپرزەیی گوتی:

"وا دیارە ئاقیبەت نابوت دەبین و دەکەوینە سوالَ. وا چاکە دەربارەکەمان بچووك بکەینەوەو ژمارەیەك لە کارمەندەکان جواب بکەین، چونکە پێویستمان بەم هەموو دەستوپێوەندە نییە، و لەسەریەشە بەولاوە هیچ خێرێکیان نیە. هەموویان لە بوکەڵەی بیَ مێشك دەچن و بە کەڵکی هیچ نایەن. من خانوویەکی بچووك لە بازاڕی ماسیفرۆشان پێدەزانم کە...."

گوشارێکی توند خرایە سەر باسکی تۆم،و لەو قسە وڕێنەئاسایانەی کرد. بەستەزمانە لە تەریقی دا رەنگی سوور هەڵگەڕا، لیَ خۆی نەبردە ئەو بارەی کە قسەی بیَ سەروبەری کردووەو قسەکانی سەرو دڵی ئامادەبووانیان گرتووە.

پاشان فەرمانێکی دیکەی شای رەحمەتیان خوێندەوە. بە گوێرەی ئەم فەرمانە دەبوایە عینوانی دۆکی بە لۆرد هرتفوردو عینوانی کۆنتی بە تۆماس سیمۆری برای هرتفورد و عینوانی ئەریلی بە کوڕەکەی هرتفورد بدرێت.

بۆ هەموو ئەندامانی دەرباریش بەرزکردنەوەی پلەو پایەو عینوان و ئیمتیازات دیاری کرابوو. ئەنجوومەنی سەڵتەنەتی بڕیاری دابوو کە لە شانزەیەمی هەیڤی شوباتدا کۆببوونەوە بکات و ئەم تەرفیع و ئیمتیازانە رابگەیەنێت. چونکە ئەجەل مەودای شای رەحمەتی نەدابوو، ئەو موڵکانەی کە دەبوایە وەکو تیولَ و ئیمتیاز بە هەندیَ لە نەجیبان بدرێت دیاری بکات و یەکلایی بکاتەوە،و چونکە ئەنجوومەنی پاشایەتی ئاگایان لە نیازی دڵ و بۆچوونی ئەو پاشا مەزنە هەبوو، بە گوێری نیازەکانی پاشای رەحمەتی بڕیاریان دابوو ئەو موڵکەی کە دەرامەتی پێنج سەد لیرەی هەبوو بە تۆماس سیمور بدەن و ئەو موڵکەی کە دەرامەتی هەشت سەد لیرەی هەبوو دەگەڵ موڵکێکی دیدا کە لە ئەوقاف کلێسا وەردەگیرایەوەو بایی سێسەد لیرە دەرامەتی هەبوو بە کوڕەکەی هرتفورد ببەخشن و لە فەرمان و قەرارەکەدا ئەوەش تۆمار کرابوو کە خاوەنشکۆ پاشای تازەش بەم دابەشکردنە رازییە.

تۆم ویستی ناڕەزایی دەربڕێت و بڵێت باشتر وایە جارێ قەرزەکانی شای رەحمەتی بدەنەوەو ئەم پارانە بە خۆڕایی بەفیڕۆ مەدەن و مەیدەن بەو خەڵکانە، لێ هرتفوردی لێزان زوو فریاکەوت و قۆڵی گرت و نەیهێشت ئەو قسە نابەجێیە بکات. بۆیە رەزامەندی شاهانە بە پێچەوانەی حەزو مەیلی ئەوو بێ هیچ ناڕەزاییەك پەسند کرا. لەم کاتەدا کە تۆم بیری لەم فڕان فڕان و تەخشان و پەخشان و بەخششانە کردەوە لە دڵی خۆیدا گوتی بۆچی لەقەب و عینوانی (دۆکبانوی ئوفال کورت) بە دایکی نەبەخشێت و موڵکێك بە بابی نەدات، لێ لە پڕ ئەم چاوە ڕەشەی کاڵ بووەوەو خەم دایگرت و ئەم خەیاڵە بێهودەیەی لە مێشکی خۆی دەرکرد، چونکە زانی کە هەر بە ناو پاشایەو ئەم پیاوە بە دەسەڵاتانەی دەربار مامۆستاو گەورەی ئەون. لەروانگەی ئەوانەوە دایکی ئەو بوونەوەرێکی بەدبەختی نەگبەتەو زادەی فیکرو خەیاڵێکی لەخۆی داماوترو پەریشانترەو لیاقەتی عینوانی دۆکبانوی نیە. ئەوانە پیاوانێك بوون بە گومان و بێ باوەڕییەوە دەیانڕوانیە قسەکانی تۆم و هەموو جارێك بە هەنجەتی ئەوەی کە کوڕیژگەی تاین شێتە دەیاننارد بە شوێنی پزیشکدا.

بەڵێ ئەم تەشریفاتە تاقەتبەرە، بەردەوام بوو، داواکاری و راپۆرو وتارو سکالانامەو داخوازی خەڵکی خوێنرانەوە. تۆمی بەلەنگاز لە دڵی خۆیدا دەیگوت ئاخر من چ گوناحێکم لەبەر قاپی خوادا کردووە کە بەمجۆرە لە گەڕانی دەشت ودەر، لە هەوای ئازادو تیشکی هەتاو مەحروم بووم و لەم زیندانە رازاوەو شکۆدارەدا گیرم خواردووەو عینوانی پاشام وەرگرتووە! بۆچی بەمجۆرە عەزابی روحم دەدەن؟ ئەوسا سەری لەقاندو لەپڕ سەری بەسەر شانیا خوار بووەوەو لە شەکەتی و ماندوویەتیدا خەوی لێکەوت. ئەم بویەرە کردیە کارێك کە کاروباری وڵات بوەستێت. هەموو لە دەوری ئەم منداڵە نووستووەدا بێدەنگ بوون و پیاوانی ئاقڵ و کارزانی وڵات لە گفتوگۆو راوێژان وەستان.

تۆم چەند سەعاتێکی پێش نێوەڕۆی ئەو رۆژەی، بە رێنوێنی جووتە نیگابانە هەمیشەییەکەی خۆی، لۆرد هرتفورد و سانت جۆن دەگەڵ هەردوو شازادەخانم، یانی لەیدی ئەلیزابت و لەیدی جین گری بە خۆشی بردە سەر. هەرچەندە جووتە خانم بەم خەسارەتە گەورەیەی کە لە ماڵباتی پاشایەتی کەوتبوو، دڵتەنگ و خەمبار بوون، لێ ئەم دیدارە بۆ تۆم زۆر خۆش بوو. تەنیا خوشکە گەورەکەی، ماری تودور، لە کۆتایی ئەم دیدارە خۆشەدا بووە مایەی رەنجانی روحی ئەو. ئەم خوشکەی هەمان ئەو کەسەیە کە پاشان لە مێژووی ئینگلیستان دا بە (ماری خوێن رێژ) ناوبانگی دەرکرد. باشی ئەم دیدارە تاڵە تەنیا ئەمە بوو کە کورت بوو و زوو تێپەڕی. پاشان بۆ چەند دەقیقەیەك بە تەنیا مایەوە. ئەوسا کوڕیژگەیەکی باڵابەرزی تەمەن نزیکەی دوانزە ساڵان، کە جلەکانی سەراپا، جگە لە یەخەکەی و سەری قۆڵەکانی، یەکپارچە رەش بوون و تەنانەت گۆرەوییەکانیشی رەش بوو، بە خزمەتی موشەرەف بوو. ئەم کوڕیژگە رەشپۆشە، بەڕەسمی تازیەباری نەوارێکی ئەرخەوانی بە شانییەوە کردبوو. ئەم کوڕیژگەیە بەسەری کۆت و بە ترس و دوو دڵییەوە هاتە پێشێ و لە بەرانبەری تۆم دا چۆکی دادا.

تۆم لە هەوەڵەوە بێدەنگ بوو و هەر سەیری ئەوی دەکرد. ئەوجا لە ناکاودا گوتی:

"رابە کوڕۆ. تۆ کێیتو چیت دەوێ؟"

کوڕیژگەکە هەستاو ئازادانە وەستا، بە سیمایەکی نیگەرانو خەمبارەوە گوتی:

"قوربان، تۆ دەبێ منت لەبیر بێ، من شەلاقخۆری تۆم."

"چی؟ شەلاقخۆری من؟"

"بەڵێ قوربان، من هامفری–م، هامفری مارلو."

تۆم هەستی کرد کە ئەم کوڕیژگەیە سەر بە دەربارەو پاسەوانو ئامۆژگارەکانی لە بیریان چووە لە بوونی ئەم کەسەی ئاگادار بکەن، بەڕاستی مەسەلەکە زۆر گرینگ بوو. ئێستا دەبوایە چی بکات؟ وا بنوێنێ کە دەیناسێتو پاشان بەقسەی بێ سەروبەر دەستەکەی خۆی کەشف بکاتو ناچار بێت بڵێ کە نەخێر نایناسێت؟ نا، نەخێر ئەمە کارێکی دروست نەبوو. بیری کردەوە کە لەگینە جاری تریش ئەم جۆرە ڕووداوانە بێنە پێشێو دووچاری هەمان پەشۆکانو سەرگەردانی ببێتەوە، چونکە نیگابانەکانی، لۆرد هرتفوردو سانت جۆن کە ئەندامی ئەنجوومەنی جێبەجێکردنی تەشریفاتی ناشتنی جەنازەکەی شای ڕەحمەتی بوون، و چوو بوون بە شوێنی کاری خۆیانداو لەگێن بوو جاری تریش جار جارێ لەبەر کاروباری پێویستو بەپەلەی وڵات شا بە تەنیا بەجێ بێڵنو بڕۆن، بۆیە دەبوایە تۆم بۆ خۆی نەخشەو پلانێك دابنێو لەم جۆرە هەلۆیستانەدا بەکاری بێنێ. بەڵێ ئەمە بیرۆکەیەکی زۆر ئاقڵانە بوو و دەبوایە ئێستا دەربارەی ئەم کوڕیژگەیە تاقی بکاتەوەو بزانێ ئەنجامی ئەم نەخشەیە چیە. نەخشەکە ئەمە بوو کە تۆم برۆکانی ویکهێنانەوەو بۆ ساتێك لە فکران ڕاچوو، و ئەوسا سەری هەڵبڕیو گوتی:

"ئەها، ئێستا، خەریکە وەك بڵێی تۆم بیر دەکەوێتەوە. چیبکەم زەینم شێواوەو هێشتا کەمێك نەخۆشم".

کوڕیژگەی شەلاقخۆری شا، بە خەمینییەکی زۆرەوە گوتی:

"قوربان، بەڕاستی مایەی داخە". ئەوسا لە دڵی خۆیدا گوتی: "بەڕاستی دەرکەوت کە ڕاستیان دەکرد. بەستەزمانە ئەقڵی تێك چووە. بەڕاستی حەیفە، بێچارە خۆت، ئای قوڕێ! قوڕم بەسەر! سەیری من کە، دەڵێی لە بیرم چووەتەوە کە هیچ کەس بۆی نیە وا خۆی نیشان بدات کە بە نەخۆشیەکەی زانیوە."

تۆم هەمدیس گوتی:

"بەڵێ زۆر سەیرە، ماوەیەکە مێشکم تەواو نیە، بەلام قەیدی نیە، تۆ هەقت بەسەر ئەمەوە نەبێت. من هەوڵدەدەم داوی پچڕاوی بۆیەرەکان لەمێشکی خۆمدا پێکەوە ببەستمەوە. زۆر لەگینە بە ئامازەیەکی چکۆلەو ڕێنوێنییەکی کورت ناوی ئەو کەسو شتانەم کە لە بیرچوون، وەبیر بێنەوە. (نەك هەر ئەو ناوانەی کە بیستوومن، بەڵکو ئەوانەش کە هەر لە بنی نەم بیستوون، وەکو چۆن ئەم کوریژگەیەی ئێستا دەیبینی.) ئێ، بڵێ، لەسەر قسەی خۆت بڕۆ، بڵێ بزانم چ کارێکت هەبوو؟، بڵێ."

"قوربان، عەرزێکی زۆر چکۆلەم لە خزمەتتا هەیە، بۆیەش عەرزی جەنابی باسەعادەتی تۆی دەکەم، چونکە هەستدەکەم حەزت لێیە گوێت لێی بێت: خاوەنشکۆتان پێرێ لەوانەی زمانی

یونـــانی دا ســـێ هەڵـــەت هـــەبوو، لـــە بیرتـــە؟ لـــە دەرســـی بـــەیانی دا بـــوو."
"بـەڵێ لـە بیرمـە، ئەمـە خـیلافی تیـا نیـە، چـونکە مـن هەمیشـە لـە دەرسـی یونـانی دا غەڵـەتی زۆر دەکەم، بۆیە نەك سێ هەڵە، بە چل هەڵەش مەمنوونم. ئێ، بەڵێ لە بیرمە. قسەی خۆت بکە!"
"بەڵێ قوربان، مامۆستا لـەم هەڵانـەی خاوەنشـکۆ پەسـتو تـوڕە بـوو، و بڕیـاری دا بـە شـەلاخ مـن تەمبێ بکات."
تۆم کە تەقەی سەری دەهات، سەری لەم کارە سوڕماو گوتی:
"تۆ تەمێ بکات؟ تۆ تۆ؟ لەسەر هەڵەی من تۆ سزا بدا، لە تۆ بدات؟"
"ئاه قوربان، تۆ دیسان لە بیرت چوو. کە تۆ دەرسەکەت ڕەوان نەبێت..."
"ڕاستە، دروستە. من بیرم چوو بوو. کە من دەرسەکەم ڕەوان نەبێت، تۆ یارمەتیم دەدەیتو پێمی ڕەوان دەکـەی، ئەگـەر هـەر ڕەوانم نـەکردو فێـری نـەبووم، ئیـدی مامۆسـتا بـە تـاوانی ئـەوەی کـە ئەرکی خۆت ئەنجام نەداوە، سزات دەداو لێت دەدا..."
"نـەخێر، نـەخێر، قوربـان ئەمـە چ فەرمایشـتێکە. مـن بچـووکترین خزمـەتکاری تـۆم، حـەدم چـیە دەرس بە تۆ بڵێم؟"
"باشـە، کەواتـە گۆنـاحی تـۆ چیە؟ ئەمـە چ مەتـەڵو لەغەزێکـە؟ مـن شـێتم یـان تـۆ؟ دەی بـۆم بـاس بکە."
"قوربان، ئەمە شتێکی زۆر سادەیە، پێویستی بە باسو شرۆڤە نیە، هیچکەسێك بۆی نیە دەست لە رووی موبارەکی خاوەنشکۆ وەلیعاد بەرز بکاتەوەو لەشی پیرۆزی بشەمزێنێ. بۆیـە ئەگـەر ئـەو لە دەرسەکەیدا هەڵەیەك بکات، دەبێ من لـە جیاتی ئـەو کوتـەك بخـۆمو مـن بـە کـەماڵی ئارەزوو و شانازیەوە ئەو لێدانە قەبووڵ دەکەم. چونکە ئەمە سەرچاوەی رزقو رۆزیو گوزەرانی منە."
تۆم بۆ ساتێك بەسەر سامی ڕوانیە کوڕیژگەی تاینو لە دڵی خۆیدا گوتی:
"ئەلهەقی ئەمە شتێکی سەیرە! ئەمەش بوو بە وەزیفە! سەیرە ئەدی بۆچی منداڵێکی دیکەیان بۆ سەر شانە کردنو جل پۆشین بـەکرێ نـەگرتووە کـە لـە جیـاتی مـن سـەر شـانە بکاتو جل لەبەر بکات؟ خۆزیا ئەم کارەشیان دەکرد! نا، ئەم قسـەیە بـە هـیچ ناچـێ. لەمـە بـە دواوە دەبـێ خـۆم لـە جیاتی غەڵەتەکانی خۆم کوتەك بخۆم. هەر باشـە ئەمـەش بـۆ خـۆی جـۆرە گۆڕانکارییـەك دەبـێ لـە ژیانما."
ئەوسا بە دەنگی بەرز لە سەری رۆیی:
"یانی، ئێستا تۆی داماو لە جیاتی من لێدانت خواردووە؟"
"نـەخێر خاوەنشـکۆ، لێدانەکـەمیان بـۆ ئـەمڕۆ دانـا بـوو، لـێ چـونکە ئێسـتا دەربـار تازیـەبارە، ئومێدی ئەوەم هەیە کە چاوپۆشی لە لێدانی من بکەن. جا من ئێستا جەسارەتم کـردووەو ڕێـم بـە خـۆ داوەو هاتوومـە خزمـەتی موبارەکـتو تکاکـارم کـە ئەگـەر دەس بـە بـەرێوە دەچـێت ئـەمر بفەرمووی بمبەخشن."
"یانی قسە دەگەڵ مامۆستاکەی خۆدا بکەم کە شەلاقت لێنەدا"
"بەڵێ قوربان، ئێستا دەرکەوت کە مەسەلەکەت بیرکەوتەوە."

"ئەریٚ، ئەریٚ، بزانە چۆن داوە پچڕاوەکانی بیرم خەریکە یەك دەگرنەوە. ئەرخایەن بە کە من ئەم کارە چاك دەکەم. دڵنیابە شەلاق ناخۆی."

کوریژگەی تاین، بەریٚزو حورمەتەوە هاتە سەر چۆکان و گوتی:

"قوربان، گەلەك مەمنوونم، ئەگەر نەبیٚ بە پڕکیٚشی، عەرزیٚکی ترم لە خزمەتتا هەیە..."

تۆم کە بینی هامفری دوو دڵە، ئەمری پیٚکرد کە لەسەر قسەکەی بەردەوام بیٚت و قەولی دایە کە داواکانی جیٚبەجیٚ بکات. هامفری گوتی:

"ئیٚ، بۆیە ئەمەتان عەرز دەکەم چونکە بە پیٚویستی دەزانم، ئیٚستا تۆ وەلیعاد نیت و لە خودا بە زیاد بیٚ بوویت بە شاو هەر ئەمریٚك بفەرموویت کەس زاتی رەتکردنەوەی نیە. لەوەیە تۆ ئیتر دەرس و خویٚندن بە شتیٚکی زیادە بزانی و بە پیٚویستی نەزانی میٚشکی خۆت بە خویٚندنەوەو کتیٚب و دەرس و دەور ماندوو بکەیت، و دەستوور بدەیت کە کتیٚبەکانت بسووتیٚنن و فیکری خۆت بە گەمەو سەرگەرمی یان کاروباری مەملەکەتەوە مژول بکەیت، لەم حاڵەتەدا من نابووت دەبم و خوشکە هەتیوەکانم لە برسان دەمرن".

"تۆ نابووت دەبیت؟ بۆچی؟"

"قوربان، نانی من لە پشتمایە، ئەگەر پشتم شەلاق نەخوات، لە برسان دەمرم، ئەگەر تۆ دەرس نەخویٚنی ئیدی پیٚویستت بە شەلاقخۆر نامیٚنیٚ و من لەم کارو خزمەتە دەردەکەن."

تۆم دڵی بە حاڵی ئەو بەلەنگازە داماوە سووتاو جومیٚرانە گوتی:

"دڵنیابە کە ئەم کارە هەتا هەتایە بۆ ماڵباتی تۆ دەبیٚ و بە میرات بۆ یەکە بە یەکەتان دەمیٚنیٚتەوە!"

ئەوسا بە ئەسپایی پانایی دەمی شمشیٚرەکەی بە شانی کوریژگەی تاین دا هیٚناو گوتی:

"رابە هامفری مارلو، تۆ لە ئیٚستا بە دواوە شەلاقخۆری هەمیشەیی ماڵباتی سەڵتەنەتی ئینگلیستانی و پشتاو پشت ئەم وەزیفەیەتان پیٚ دەبڕیٚ. هیچ خەمت نەبیٚ، دڵنیابە کە من جاریٚکی دی دیٚمەوە سەر کتیٚبان و دەرس و دەورو ئەوەندە خراپ دەرس دەخویٚنم کە ناچارن موچەو بەراتی تۆ زیاد بکەن... یان کارو وەزیفەکەت بایەخیٚکی زۆر زیاتر پەیدا دەکات."

هامفری کۆڵیٚکی سوپاس کردو لە کەیفان لە پیٚستی خۆی نەدەهیٚوری و بەو حاڵ و بارەوە گوتی:

"زۆر مەمنوون و منەتباری ئەم دلاوایی و کەرەمەی خاوەنشکۆتانم. بە خەویش ئەمەم دیبا باوەڕم نەدەکرد، لە خەویش دا زاتی ئەم پڕ کیٚشییەم نەدەکرد. لە ئیٚستا بەدواوە هەمیشە شادو بەختەوەر دەبم و هەموو ئەندامانی ماڵباتی (مارلو)ش لە دوای من بەختەوەرو سەربەرز دەبن."

تۆم، بەشی خۆی زیرەك و ئاقڵ بوو، یەکسەر پەی بەوە برد کە لەگینە ئەم کوڕیژگەیە بە کەڵکی بیٚت. بۆیە هامفری هاندا تا لەسەر قسەکانی بڕوات. ئەزقەزا بە هەڵەش نەچوو بوو، چونکە هامفری بەو خەیاڵەی کە هەر چییەك بڵیٚت کۆمەکیٚکە بە شا تا شتە لە بیرچووەکانی وەیاد بیٚنیٚتەوەو لە مالیجەی نەخۆشی بیرچوونەوەدا یارمەتی دەدا، هەر بویەرو رووداویٚك کە لە ژووری دەرس دا یان لە هەر شویٚنیٚکی کۆشکدا رووی دابوو، بە ئاووتاو بۆی گیٚڕایەوە، بە جۆریٚ بۆی

گێڕایەوە کە تۆم بە باشی توانی زۆر شتانی بیر بێتەوە. دوای یەك سەعات لە قسەکردنی هامفری، تۆم کۆمەڵێك زانیاری باشی دەربارەی وەزعو حاڵی دەربارو دەرباریان بە دەست کەوت، بۆیە بڕیاری دا کە هەموو رۆژێك لەم سەرچاوەی زانیاریەوە، زانیاری هەڵێنجێ، ئیدی بەو مەبەستە دەستووری دا کە هەر کاتێ هامفری ویستی بە حوزوری ئەو موشەڕەف بێت، یەکسەری بیکەنە ژوورەوە، تەنیا ئەو کاتانە نەبێت کە دەگەڵ خەڵکی دی دا لە گفتوگۆدا بێ. بەڵێ هێشتا هامفری لە ژوورەکەی شا دوور نەکەوتبووەوە کە لۆرد هرتفورد بە پەلە خۆی بە ژوورا کرد. هرتفورد بە خاوەنشکۆی راگەیاند کە گەورە پیاوانی ئەندامی ئەنجوومەنی پاشایەتی نیگەرانی ئەوەن کە خوا نەخواستە هەواڵی نەخۆشییەکەی شا دزەی کردبێتو لە دەوروبەرو دەرەوەدا بڵاوبووبێتەوە، بۆیە وای بە مەسڵەحەت دەزانن کە بۆ پوچەڵکردنەوەی کاریگەری ئەم هەواڵە، خاوەنشکۆ تا یەك دوو رۆژی دی لە کۆڕی گشتیدا ئامادە بێتو لە حوزوری عامدا نان بخوات. ئەم کارە، ئەگەر هەواڵێکی خراپ بڵاوبووبێتەوە، دەبێتە مایەی ئەوەی کە رای گشتی ئارام ببێتەوە، چونکە دیتنی بەدەنی ساغو سیمای شەنگوڵو پاراوی خاوەنشکۆ لە هەر بەرپەرچدانەوەو بەدرۆ خستنەوەیەکی دی کاریگەرتر دەبێ.

ئەوسا لۆرد هرتفورد بە کاوەخۆو بەوپەڕی ئەدەبو نەزاکەتەوە کەوتە تەعلیم دانی تۆمو هەوڵی دەدا هەموو رێوڕەسمو تەشریفاتێکی نانخواردنی وەبیر بێنێتەوەو لەگەڵ هەر قسەیەکیشدا دووپاتی دەکردەوە کە شا هەموو ئەو شتانە چاك دەزانێتو ئەو تەنیا بە مەبەستی وەبیر خستنەوە عەرزی دەکات. لێ لۆرد هرتفورد بۆی دەرکەوت کە بەڕاستی تۆم زۆری پێویست بە یارمەتیو یادهێنانەوە نەبوو، چونکە زانیاریەکی باشی لە هامفرییەوە وەرگرتبوو و کۆمەڵێك شتی لەمبارەیەوە زانی بوو. بۆ نموونە لە هامفری بیست بوو کە دەبێ تا چەند رۆژێکی دی لە حوزوری خەڵکدا شێو بخواتو هامفری-ش گوێی بۆ گفتوگۆی دەربارییەکان هەڵخستبوو و ئەم هەواڵەی زانی بوو. بەڵام تۆم وای پیشان دا کە ئەم زانیاریانە هی خۆین.

کە لۆرد هرتفورد سەیری کرد زەینو بیری شا لە جاران باشتر بووە، لێبڕا تاقی بکاتەوەو بزانێت کە شا تا چ ئەندازەیەك چاك بووەو شتە بیرچووەکانی هاتوونەتەوە بەر زەین. ئەنجامی تاقیکردنەوەکە زۆر باش بووم. هەڵبەتە کەمدابێژێك هەڵەو نا دروستی لە قسەکانیا دەبینرا، لێ ئەم هەڵانە زادەی ئەو بابەتو شتانە بوو کە هامفری نەیتوانی بوو، شایان لێ ئاگادار بکات. بە شێوەیەکی گشتی لۆرد هرتفورد بە رادەیەك شادو خۆشحاڵ بوو کە بە دەنگێکی پڕ ئومێد بە شای عەرز کرد:

"ئێستا تەواو دڵنیام کە ئەگەر خاوەنشکۆ کەمێك هۆشو حەواسی خۆی بخاتە کار، مەسەلەی گوم بوونی تەمغە گەورەکە چارەسەر دەبێت. هەڵبەتە گوم بوونی تەمغەو مۆری پاشایەتی تا دوێنێ بە کارەساتو خەسارەتێکی گەورە دەژمێردرا، لێ ئەمڕۆ زۆر گرینگ نیە، چونکە بە مردنی خاوەنشکۆی رەحمەتی، ماوەی خزمەتی ئەو تەمغەیەش بەسەر چووە. ئێ، ئایا ئێستا خاوەنشکۆ مایلە کە ئەو زەحمەتە بە خۆی بدات؟"

تۆم حەپەسا، تەمغەی گەورە چیە؟ بە هیچ جۆرێ شتی وای نەبینی بوو، و نەیدەزانی چیە. قەیەرێك راما، و بە نیگایەکی پاك و بەری پرسی:

"جەنابی لۆرد، ئەم تەمغە گەورەیە چۆن شتێك بوو؟"

لۆرد هرتفورد راچڵەکی و بە خۆی گوت: "مخابن، مخابن کە جارێکی دی مێشکی تێك چووەوە! خراپم کرد کە ماندووم کرد."

ئەوسا باسەکەی گۆڕی تا بیری تۆم بەلای شتی تردا بەرێت و زۆر بەئاسانیش ئەو کارەی بۆ چووە سەر.

((١٥))

## پاشایەتی تۆم

بۆ سبەینێ، سەفیرانی فەرەنگی بە خۆو دەست و پێوەندیانەوە تەشریفیان هێنا، تۆم کە لەسەر تەختی پاشایەتی دانیشتبوو پێشوازی هەموویانی کرد. هەیبەت و شکۆی ئەم رێوڕەسم و دیمەنە لە هەوەڵەوە زۆری خۆشحاڵ کردو هێنایە سەر شەوق و زەوق،بەڵام ماوەکەی زۆر درێژو وشك بوو، و زۆربەی وتارەکانیش بێ تام و تاقەتبەر بوون. هەر وتارێك کە دەدرا لە هەوەڵەوە خۆش بوو لێ بەرە بەرە بێ تام دەبوو و پیاوی بێزارو بێتاقەت دەکرد. تۆم زۆر بە زەحمەت ئەو وتانەی کە لۆرد هرتفورد جارجارێ بە گوێیدا دەچپاندو دەی خستنە سەر زاری، دەگوتەوە، لێ چونکە لە پیشەی پاشایەتی دا ناشی و تازەکارو تازە کورە بوو، نەیدەتوانی لەم کارەدا بە تەواوەتی سەرکەوتن بە دەست بێنێ. هەرچەندە رواڵەتێکی بۆشناخ و شاهانەی هەبوو، لێ نەیدەتوانی بە باشی و بە تەواوەتی رۆڵی پلەوپایەکەی خۆی بدینێ، بۆیە کە ئەو تەشریفاتە کۆتایی هات زۆر خۆشحاڵ بوو.

زۆربەی وەختی ئەو رۆژەی تۆم خۆی گوتەنی بە فیڕۆ رۆیی، چونکە لە بەڕێوەبردنی کاروباری دژوارو ناخۆش و تاقەتبەری پیشەی پاشایەتیدا بەسەر چوو. تەنانەت ئەو دوو سەعاتەش کە بۆ پشووی ئەو دایان نابوو، وەکو بارێکی قورس بوو بەسەر شانییەوە، چونکە ئەو دوو سەعاتەش بە ریعایەتی ئوسوڵ و تەشریفات و داب و نەریتانی ئیجباری تێپەڕی. تەنیا ئەو سەعاتەی، کە دەگەڵ کوریژگە شەلاقخۆرەکەی خۆیدا بەسەری برد، بە سوودمەندو خۆش زانی، چونکە دیداری ئەو هەم سەرگەرمی بوو و هەم زانیاری لێ وەردەگرت.

رۆژی سێیەمی پاشایەتی تۆم کانتی وەکو رۆژانی دیکەی پاشایەتی تێپەڕی، لەوە دەچوو لە رۆژانی پێشوو باشتربێ، چونکە نیگەرانی و ناڕەحەتی تۆم لەو رۆژەدا، لە رۆژانی پێشوو کەمتر بوو. هەرچەندە جارجار ناڕەحەت و نیگەران دەبوو، بەڵام دەگەڵ بارودۆخ و ژینگە تازەکەیدا راهاتبوو. هەستی دەکرد کە بە ملکەچی و گوێڕایەڵی گەورە پیاوانی دەرباری و بە رووبینی و ریابازی و دەڵەچەیی ئەوان ڕاهاتووەو کەمتر لە گیانی ناخۆشە.

تەنیا یەك شتی زەحمەتی لە بەردەم مابوو، ئەویش ئەوە بوو کە دەبوایە لە رۆژی چوارەمدا لە حزووری خەڵکی دا شام بخوات. بەرنامەیەکی تێرو تەسەل و رێوڕەسم و تەشریفاتێکی بەشکۆیان

بۆ ئەو رۆژە دانا بوو. دەبوایە لەو رۆژەدا لە سەرووی مەجلیسی پاشایەتییەوە دانیشێتو کۆمەڵێك قەرارو بڕیاران دەربارەی سیاسەتی تازە، لەمەڕ ولاتانی فەرەنگی دوورو نزیکی دنیا بدات. هەروەها دەبوو لەو رۆژەدا بە فەرمی جەنابی لۆرد هرتفورد بۆ جێنشینی سەڵتەنەت دابنات، زۆر کاری گرینگی دیکەش خرابووە ئەو رۆژە، لێ هەموو ئەو کارانە بەلایەكو نانخواردنی ئێوارە لە حوزورو بە بەر چاوی خەڵکییەوە لەلایەك. بە تایبەتی کە لە ئێستاوە هەستی دەکرد کە خەڵکی هەموو چاو دەبڕنە دەمی ئەوو چاودێری هەموو هەڵسوکەوتێکی دەکەنو ئەگەر هەڵەیەکی، لەمەڕ ئەتەکێتی نانخواردن، لێ بدینن، هەموو بە گوێی یەکدا دەچپێنن.

ئەفسووس کە هیچ شتێك نەیدەتوانی رێگە لە هاتنی رۆژی چوارەم بگرێت. کە ئەو رۆژە هات، تۆمی بەلەنگاز زۆر خەمینو خەمبارو بێ حەواس بوو، هەرچی کردو کۆشا نەیتوانی ئەو خەمو پەژارەیە لە خۆی بڕەوێنێتەوە. ئەرکی قورسو ئاسایی دانی بەیانی ئەو رۆژە زۆری ماندوو کرد، و جارێکی دی وای هەستکرد کە لە زندان دایە.

تۆم پێش نیوەڕۆی ئەو رۆژە لە هۆڵێکی گەورەو رازاوەدا دەگەڵ لۆرد هرتفوردا قسەی دەکردو چاوەڕوانی ئەو ساتە بوو کە پێشتر بۆ تەشریف هێنانی کۆمەڵێك پیاو ماقوولانو گەورە دەرباریان دیاری کرابوو.

دوای تۆزێك سەرنجی تۆم لەسەر پەنجەرەی هۆڵەکە گیرسایەوەو لەوێندەرەوە چاوی بە ئاپۆڕایەك کەوت لەو دیو محەجەرەو دەرگاکانی کۆشکەوە خڕ بوو بوونەوە. تۆم زۆری حەز دەکرد بزانێ کە لە دەرەوە چ باسە. سەیری کرد کە کۆمەڵێك ژنو پیاوو منداڵ بەدەم هوراکێشانو هاتو هاوارەوە نزیك دەبنەوە. شا، زۆری حەز لێ بوو بزانێ ئەمە چیە، بۆیە بە فزوڵیەتو کونجکاویەکی منداڵانەوە گوتی:

"زۆر حەز دەکەم بزانم ئەمە چیەو چی رووی داوە."

لۆرد هرتفورد ئیکلامێکی کردو گوتی:

"هەڵبەتە تۆ پاشایتو هەقی خۆتە بزانی چی بووە، ئەگەر رێگە بفەرمووی دەچم تاقیب دەکەم بزانم چیە."

تۆم بەوپەڕی جۆشو خرۆشەوە گوتی:

"باشە، بەڵێ بەڵێ بڕۆ."

ئەوجا بەوپەڕی خۆشییەوە لە دڵی خۆیدا گوتی:

"پاشایەتی زۆریش خراپ نیە، ئەگەر ناخۆشیو سەریەشەی هەبێ، خۆشی خۆیشی هەیە".

لۆرد هرتفورد، بە ناوی پاشاوە خولامێکی بۆ لای سەرۆکی پاسەوانانی تایبەت نارد تا بە ئەمری پاشا ئەو خەڵکە رابگرێو لە هۆی ئەو قەرەباڵغیو ئاژاوەیە بپرسێتو بزانێ چیە. دوای تۆزێك کۆمەڵێك لە پاسەوانانی سەڵتەنەتی لە دەرگای کۆشکەوە دەرپەڕینو پێشیان بەو خەڵکە گرت. دوای تۆزێك، قاسیدێك لە دەرەوە گەڕایەوەو هەواڵی هێنا کە ئەو حەشاماتە بەدەم

هاوارەوە دوای پیاوو ژن و کچۆڵەیەك کەوتوون کە بە تاوانی دژایەتی کردنی ئەمن و ئاسایشی وڵات، حوکمی ئیعدام دراون و بۆ پای قەنارەیان دەبن.

"ئیعدام، ئیعدام! باشە ئەم نەگبەتانە چیان کردووە، بێچارە خۆتان!" ئەم بیرە دڵتەزێن و سامناکە دڵی تۆمی گوشی و بە جۆرێ نیگەران و ناڕەحەتی کرد، کە هەموو شتێکی لە بیر کردو هەرگیز بیری لەوە نەکردەوە کە ئەمانە بێ حورمەتیان بەرانبەر بە قانوون کردووە، زەرەرو زیانیان لە خەڵکی داوە، ماف خەڵکیان پێشێل کردووەو ئەمە کارێکی ناپەسندو دزێوەو سزای خۆی هەیە. هەموو هۆش و بیری لەلای سێدارەو مەرگی ئەو مەحکومە بەدبەخت و نەگبەتانە بوو. تەنانەت بۆ چەند ساتێك ئەم خاڵەشی فەرامۆش کرد کە ئەو لە راستیا تەنیا سێبەری شایە نەك خودی شا، لەو چەند ساتەوەختەدا، بێ ئەوەی بیر بکاتەوە، هەر هات بە دەمیاو ئەمری کرد: "بۆ ئێرەیان بێنن."

لێ یەکسەر هەستی کرد کارێکی باشی نەکرد، سوور هەڵگەڕا، دەیویست لەم فرمانە نابەجێیەی خۆی ژێوان ببێتەوە، لێ کە بینی لۆرد هرتفوردو دەست و پێوەندو خولامانی دەرباری هیچ کاردانەوەیەکیان نەبوو و سەریان لەم کارە سوڕنەماو بڕۆیان وێك نەهێنایەوە، بێدەنگ بوو و هیچی نەوت.

نۆکەرە تایبەتیەکە ئیکلامێکی کردو بە مەبەستی جێبەجێ کردنی فرمانی شا پاشەو پاش گەڕایەوەو رۆیی. تۆم بەم سەرکەوتنەی خۆشحاڵ بوو، و جۆرە متمانەو غرورێکی لا دروست بوو، و لە دڵی خۆیدا گوتی:

"بەڕاستی پاشایەتی رێك لەوە دەچێت کە من لە کتێبەکانی قەشە پیرەکەی لەمەڕ خۆمان دەمخوێندەوە، و هێندەم ئەو کتێبانە خوێندبووەوە کە خۆم لێ بوو بوو بە شازادەو ئارەزووم دەکرد کە منیش رۆژێ لە رۆژان ببم بە پاشاو ئەمرو نەهی بەسەر هەموو کەسێکدا بکەم و بە کەیفی دڵی خۆم هەر کەسێکم بوێ فەرمانی پێ بدەم کە فلان کار بکەو یان فیسار کار مەکە، و کەس هەقی ئەوەی نەبێ قسەو چەندو چوون لە کاری مندا بکات.

لەم کاتەدا دەرگا گەورەکانی هۆڵەکە کرایەوەو دوا بە دوای ئەوە ریزێك لەقەب و عینوانی دووروو درێژیان بە گوێی شادا دا. ناوی هەر کەسێکیان دەخوێندەوە یەکسەر دەهاتە هۆڵەکەوە. زۆری نەبرد کە هۆڵەکە پڕ بوو لە پیاو ماقولان و نەجیمان و ئەشرافانی شار. لێ تۆم زۆر گوێی بەمانە نەدەدا، چونکە لە ناخا زۆر نیگەران و پەریشان بوو، زیاتر بیری لە مەسەلەی ئیعدامکردنی سێ کەسەکە دەکردەوە. بە حەواسپەرتی لەسەر تەخت دانیشتبوو و بەبێ ئۆقرەیی چاوی بڕی بووە دەرگای هۆڵەکە.

دوای تۆزێك، دەنگی هەنگاوی هێواش و قورسی سەر بازان کە نزیك دەبوونەوە، هاتە گوێ. مەحکومەکان، بە چاودێری پاسەوانانی تایبەتی سەڵتەنەتی وەژوورکەوتن. ئەفسەری فەرماندەی پاسەوانەکان، سەرەتا لە بەردەم تەختەکەی شادا چۆکی دادا، پاشان هەستاو لە حاڵی خەبەرداریدا لەلایەکەوە وەستا. سێ مەحکومەکەش چۆکیان دادا، لێ بە هەمان حاڵ مانەوە. پاسەوانی تایبەتی لە پشت تەختەکەی تۆمەوە وەستا. تۆم بەوپەڕی لاپرەسەنی و وردی چاوی

بڕییە مەحکومەکان. جل‌و بەرگ‌و سەروسیماو ڕواڵەتی ئەو پیاوەی پێ غەریب نەبوو، لە دڵی خۆیدا گوتی لەوەیە ئەو پیاوەی لە شوێنێك بینی بێت، لێ هەرچی کردو کۆشا بیری نەکەوتەوە کە لە کوێ‌و کەی‌و لە چ وەزع‌و حاڵێکا دیتبووی . لەو کاتەدا پیاوە سەری هەڵبڕی، کە بەرگەی نیگای شای نەگرت، هەمدیس سەری دانەواندەوە. لێ ئەو تاقە نیگایە بۆ تۆم بەس بوو کە کابرای مەحکوم بناسێتەوە، لە دڵی خۆیدا گوتی:

"ئەها ئێستا بە تەواوەتی ناسیمەوە، ئەمە ئەو پیاوە غەریبەیە کە ڕۆژەکە (جیلسویت)ی لە ڕوباری تایمز دەرهێنایەوەو لە خنکانی ڕزگارکرد. ڕۆژی یەکەمی ساڵی تازە بوو، ئەلهەقی کارێکی مەردانەی کرد، لێ مخابن کە دەڵێن ئێستا کارێکی خراپ‌و تاوانێکی گەورەی کردووەو کاری گەییوەتە ئێرە. پیاو ڕاست بڕوا من هەرگیز ئەو ڕۆژو سەعاتە فەرامۆش ناکەم، چونکە ئێستاش لە بیرم ماوە، هەر سەعاتێك دوای ئەوە، واتە لە سەعات پازدەدا، کوتەکێکی وەهام بە دەستی داپیرەم خوارد، کە کوتەکانی پێش ئەو ڕۆژەو تەنانەت پاش ئەو ڕۆژەش لە چاویا لاوانەوەو نەوازشت بوون."

تۆم فەرمانی دا کە ژن‌و کچەکە بۆ چەند ساتێك لە هۆڵەکە ببەنە دەرەوە، ئەوجا ڕووی کردە فەرماندەی سەربازەکان کە جێبەجێکاری قانون بوو، و گوتی:

"ئێ، ئەم پیاوە چ تاوانێکی کردووە؟"

فەرماندە بە کەماڵی نەزاکەتەوە چۆکی داداو عەرزی کرد:

"ئەزبەنی، ئەم پیاوە یەکێك لە ڕەعیەتەکانی خاوەنشکۆی موبارەکی ژەهرخوارد کردووەو کوشتوویەتی".

تۆم کە گوێی لەم وەڵامە بوو ڕاچڵەکی، و ئەو سۆزو بەزەییەی کە دەرهەق بە چارەنووسی مەحکومەکان، لە دڵیا پەیدا بوو بوو، کاڵ بووەوە. لەگەڵ ئەوەشدا هەر پرسی:

"باشە ئەم تۆمەتە ساغ بووەتەوە؟"

"بەڵێ ئەزبەنی، بە تەواوەتی ساغ بووەتەوە."

تۆم ئاهێکی هەڵکێشاو گوتی:

"کەواتە ببیەن، هەرچییەکی بەسەر بێت هەقی خۆیەتی. هەرچەندە حەیفە کە پیاوێکی وا بە غیرەت‌و مەرد بمرێت، مەبەستم ئەمەیە کە بەسەرو سیمایدا لەوە دەچێ پیاوێکی بە شەرەف‌و بەغیرەت بێ."

لێ کابرای مەحکوم هەردوو دەستی بە نیشانەی پاڕانەوە نا بەیەکەوەو بەلالانەوەوە گوتی:

"گەورەم!.. خاوەنشکۆ ڕەحم بە حاڵی مندا بکە. من بێ گوناحم‌و ئەو تۆمەتەی کە دەیدەنە پاڵم بە هیچ جۆرێ ساغ نەبووەتەوە. بە تاوانێك تۆمەتباریان کردوم کە ڕوحم ئاگای لێ نیە. بەڵام من نامەوێ باسی بێ تاوانی خۆم بکەم چونکە باوەڕم وایە کە عەدالەت‌و دادپەروەری ڕێڕەوی خۆی دەگرێت‌و حەقیقەت ئاشکرا دەبێت. من تەنیا یەك داوام لە خاوەنشکۆ هەیەو چونکە بوونی شا بە نیشانەو ڕەمزی شکۆداری‌و دەسەڵات‌و گەورەیی دەزانم، ئومێدەوارم داواکەم قەبوول بکات. ئەزبەنی، داواکەی منی گیان فیدا تەنیا ئەمەیە کە ئەمر بفەرمووی لە سێدارەم بدەن".

هەردوو چاوی تۆم لەسەر سامیدا کرانەوەو گوتی:
"خودا چی دەژنەوم؟ ئەم پیاوە چ داوایەکم لێدەکات! یانی چی! کابرا؟ ئەدی بەخۆت ئەو حوکمە نەدراوی؟"
"نەخێر قوربان، بەوەیان حوکم داوم کە بەزندوویەتی لە مەنجەڵێك ئاوی گەرما بمکوڵێنن."
تۆم لە زگ بوو لەسەر سامی و لە داخا لەسەر کورسییە دەسکەدارەکەی بکەوێتە خوارەوە، لێ کە هێور بووەوە بەوپەڕی دڵسۆزی گوتی:
"رابە کڵۆڵ، ڕابە، ئەوا داواکەم قەبوڵ کردیت. بەزاتی خودا ئەگەر سەد کەسیشت ژەهراخوارد کردبا، هەرگیز ڕێم نەدەدا بەو شێوازە ترسناكو دڵتەزێنە سزا بدرێی."
کابرای مەحکوم لە رووی منەتباریو سوپاسگوزارییەوە، سەری نایە عاردیو کەوتە دوعای خێر بۆ شاو سەلامەتی شا،و گوتی:
"قوربان، یاخودا خێرت بێتە ڕێ، رۆژی تەنگانەو ناخۆشی نەبینی، هیوادارم کە خواوەند لە رۆژی سەختو تەنگانەدا، جەزای ئەم چاکەیەت بداتەوە کە ئەمڕۆ دەرهەق بە من فەرمووتان، خودا بە چاکە جەزای ئەم چاکەیەتان بداتەوە."
تۆم، رووی کردە لۆرد هرتفوردو گوتی:
"لۆرد، ماقولە دادگاکانی مەملەکەتی من ئەم پیاوە کڵۆڵە بەو سزا قورسو ترسناکە مەحکوم بکەن؟"
لۆرد هرتفورد گوتی:
"بەڵێ قوربان، قانوونی سزای ئەو کەسانەی کە خەڵکی دەرمانخوارد دەکەن ئەوەیە کە بە زندوویەتی بخرێنە مەنجەڵێك ئاوی کۆڵە کوڵەوە. لە ئەڵمانیادا ئەو کەسانەی کە سکەی قەڵب لێدەدەن یان ئەسکەناسی قەڵب چاپ دەکەن سزایان ئەوەیە بخرێنە ناو رۆنی داغەوەو هەڵبەتە تاوانبار بەیەك کەڕەت ناخەنە ناو مەنجەڵەکەوە، بەڵکو بەسەر مەنجەڵە رۆنە داغکراوەکەوە بە پەتێك هەڵیدەواسنو هەر جارەی تۆزێکی پەتەکە شل دەکەن تا بەشێکی بەدەنی یارۆی تاوانبار بچێتە ناو مەنجەڵەکەوە. بۆ نموونە لە لاقیەوە دەست پێدەکرێو بەرە بەرە بەسەری کۆتایی دێت."
تۆم وەك ئەوەی ئەم سزا لە توانا بەدەرە بە چاو بدێنێ، هەردوو چاوی بەدەست گرتو گوتی:
"بە سە مای لۆرد، بەسە، نامەوێ لەوەی پتر گوێم لەم قسانە بێت، تکایە دەستوور بدەن ئەم یاسا ناڕەوایانە لە وڵاتی مندا هەڵوەشێننەوە. من رازی نیم بە ناوی یاساو قانوونەوە خەڵکی کڵۆڵو داماو بەم جۆرە ئەشکەنجەو سزا نەنگینانە حوکمو سزا بدرێن."
لۆرد هرتفورد کە لە زۆربەی هاوکارەکانی خۆی دڵنەرمترو جوامێرتر بوو، بە رەزامەندییەوە گوتی:
"قوربان، ئەم قانونە بە دەستوری خاوەنشکۆتان یەکسەر چاك دەکرێتو مێژوو ئەم شانازیە بە ناوی خاوەنشکۆتانەوە تۆمار دەکات."

لەم کاتەدا فەرماندەی سەربازەکان هاتە پێشەوە کە دەستی کابرای مەحکوم بگرێت و لە ژوورەکەی بەرێتە دەرێ، لێ تۆم بە ئاماژەیەك ڕێی لێگرت و گوتی:

"من ئێستا دەمویست زانیاری پتر سەبارەت بە کاری ئەم مەحکومە بزانم. ئەو دەڵێت تۆمەتەکەی بە سەرا ساغ نەبووەتەوە. بڵێ بزانم تۆ لەمبارەیەوە چی دەزانی؟"

ئەفسەری فەرماندە عەرزی کرد:

"قوربان، من لە دادگایی ئەم پیاوەدا ئامادە بووم و بە گوێی خۆم گوێم لە بەسەرهاتەکەی بوو، کە بە شایەدی و گەواهی سێ کەس، ڕۆژێك ڕێك لە سەعات دەی سەر لە بەیانی دا ئەم کابرایە خۆی بە کوختەیەکی گوندی ئایلینگستندا کردووە، دوو کەسی تر لە شایەدەکان گەواهیاندا کە نەخێر سەعات دەو شتێك خۆی بە کوختەی نێوبراودا کردووە. بە هەرحاڵ نەخۆشێك لەو کوختەدا بووە کە لە کاتی چوونی مەحکومدا لە خەوا بووە. پاشان ئەم مەحکومە لەو ماڵە هاتووەتە دەرێ و دوای سەعاتێك یارۆی نەخۆش، کەوتووەتە ڕشانەوەو لە پەلوپۆ کەوتووەو گیانی سپاردووە."

"باشە، کەس بە چاوی خۆی دیتویەتێ کە ئەم مەحکومە ژەهری بە یارۆی نەخۆش دابێ؟ ئایا هیچ کەسێك ژەهرەکەی پێ دیتوە؟"

"نەخێر قوربان"

"دەی باشە لە کوێ زانیان کە یارۆی نەخۆش دەرمانخوارد کراوە."

"کە پزیشکەکان فەحسیان کردبوو، شایەتیان دابوو کە ئەو نیشانانە تەنیا بە هۆی ژەهراوی بوونەوە دەردەکەون."

تۆم لە فکران ڕاچوو و لە دڵی خۆیدا گوتی:

"هەڵبەتە گومانکردن لە بۆچوونی پزیشکان زەحمەتە!"

ئەوسا بە دەنگی بەرز لەسەری ڕۆیی و گوتی:

"هەڵبەتە پزیشکان لە کاری خۆدا شارەزاو بە ئەزموونن و جێی خۆیەتی کە بڵێین هەق بەوانە... بەڵام مەسەلەکەش ئاڵۆزەو پیاو ناتوانێ قسەی تیا بکات و ڕای خۆی بڵێت!"

ئەفسەری فەرماندە دیسان هەڵیدایەو گوتی:

"قوربان، مەسەلەکە لێرەدا کۆتایی نایەت، لەمەش ئاڵۆزتر دەبێت، چونکە بە گوێرەی گەواهی چەند شایەدێك، ژنێکی جادووگەر کە لەو ڕۆژانەدا چووەتە گوندی ئایلینگستن، پێشبینی کردووە کە گوایە یارۆی نەخۆش بە خواردنی ژەهر دەمرێت و ئەو ژەهرەش پیاوێکی غەوارەی شڕ پۆشی گەنم ڕەنگ دەرخواردی دەدات. جا هەموو ئەم نیشانانە لەم کابرا مەحکومەدا، کە ئێستا لە خزمەتی خاوەنشکۆدایە، هەیە، و لەبەر ئەمە وەکو ملاحەزە دەفەرمووی پێشوەختە پێشبینی تاوانەکەیان بۆ کردبوو."

لەو ڕۆژگارەدا خورافات و خەیاڵاتی پوچ هێشتا بەسەر مێشك و بیری خەڵکیدا زاڵ بوو، بۆیە ئەم بەڵگەیەیان لە هەموو بەڵگەیەکی دی بە دروستتر دەزانی.

تۆم لە دڵی خۆیدا گوتی: "مەسەلەکە ڕوونەو ئەم بەڵگەو شایەدیانە بۆ مەحکوم کردنی ئەم کلۆڵە سەرو زیادە."

لـێ وێـڕای ئەمـەش بـۆ ئـەوەی ڕێگەیـەك بـۆ دەربـاز بـوونی مـەحکومی بەدبـەخت بکاتـەوەو کلاورۆژنەیەکی ئومێدی پیشان بدات رووی تێکردو گوتی:

"باشە تۆ هیچ داکۆکیەکت نیە لە خۆتی بکەی؟"

"مخـابن قوربـان، مـن چ داکۆکیـەك بکـەم. عـەرزم کـردی بێگونـاحم، لـێ بـۆ بابایـەکی وەکـو مـن ئەستەمە کە بێگوناحی خۆم بسەلمێنم. منی بێ کەسوکار، بی دۆسـتو یـارو یـاوەر، بـێ پشـتو پشتیوان، چۆن دەتوانم بیسەلمێنم کە لە رۆژی روودانی ئەو مەسەلەیەدا لـە ئایلینگسـتن نـەبووم، بەڵکو چوو بووم بۆ (واپینگ ئولدسترز)ی یـەك فەرسـەخی ئـەو کوختەیـە. جا قوربـان بـا شـتێکی لەمەش گرینگترتان عەرز بکەم: رێك لەو سەعاتەدا، کە داواکاران دەڵێن گوایە من کابرای نەخۆشم دەرمانخوارد کردووە، منداڵێکی داماو، کەوتبووە روباری تایمزەوە،و من خـەریك بووم لـە خنکـانم رزگار دەکرد."

تۆم کە گوێی لەو قسەیە بوو، رووی وەکو گوڵەباخ گەشایەوەو گوتی:

"بەسە!"و یەکسەر رووی کردە ئەفسەرەکەو پرسی:

"ئەم تاوانە لە چ رۆژێکدا رووی داوە؟"

"قوربان، لە دەوروبەری سەعات دەی سەر لە بەیانی رۆژی یەکەمی ساڵی تازەدا".

"دەمەوێ یەکسەر ئەم مەحکومە ئازاد بکەن، ئەمە فەرمانی منە، فەرمانی پاشایەتیە!"

تۆم لە ناخا شڵەژا، دەموچاوی سوورهەڵگەڕاو لە دڵی خۆیدا گوتی:

"بێگومان من ناتوانم بە حیلەو خوو خەسێتی پاشایان کارم بەڕێوەبەرم!"

و بۆ ئەوەی ئەو کاریگەرییە خراپەی کە شێوازی زبری دەربڕینی بڕیارەکەی لەلای خەڵکەکەی دروست کرد بوو، بڕەوێنێتەوە، بەمجۆرە لەسەر قسەکەی خۆی بەردەوام بوو:

"کاتێ بیردەکەمـەوە کـە هەنـدێك لـە رەعیەتـەکانم، لـە سۆنگەی ئـەم بەڵگەو شـایەدییە سـەیرو بـێ بنجو بناوانانە حوکمی مەرگ دەدرێن، یان ئازارو ئەشکەنجە دەدرێن، خەریکە لە قارا شێت بم."

ورتە ورتی ئافەرینو ستایش لە ناو ئامادەبووانـەوە بـەرز بـووەوە، لـێ ئـەم ئافـەرینو ستایشـانە لەبەر دلۆڤانیو میهرەبانیو بە رەحمیو جوامێری تۆم نەبوو، بەڵکو لەبەر ئەمە بوو کە هـەمووان کەیفیان بە تواناو زیرەکیو هوشیاریو کارزانیو لێزانی تۆم هات. لەو مەجلیسـەدا ئەگـەر یـەکێك گوێی هەڵخستبایە، بە ئاشکرا گوێی لێدەبوو کە دەستو پێوەندو دەرباریـیەکان دەمیـان لـە پـەنا گوێی یەکدی دەناو بە ئەسپایی هەنـدێ شتیان بـە گـوێی یـەکتردا دەچپاند. بۆ نموونـە یـەکێك لەوانە دەیگوت:

"بۆچی دەڵێن پاشامان شێتە، بە زاتی خوا هیچ کەسێك بەم باشییە بیر ناکاتەوە!"

یەکێکی دی دەیگوت:

"تەماشـا، بـە چ هۆشـیاریو رۆشـنبینییەکی تایبەتیـەوە، مەسـەلەکان تـاوتوێ دەکـات! شـوکر بـۆ خـوا پاشـای گـەنجمان راسـتگۆییو ماقولیـەتو هەڵوێسـتی بوێرانـەی خـۆی بـە دەسـت هێناوەتەوە!".

یەکێکی دی دەیگوت:

"شوكر بۆ خوا كە پاشا چاك بووەتەوە. ئێستا نەخۆش نیە، بەڵكو پاشای راستەقینەو تەواوە. كە قسان دەكات كوتو مت دەڵێی بابی رەحمەتیەتی. خوا تەمەن درێژی بكات!"

هەڵبەتە تۆم لە ناو ئەم دەنگە دەنگەو غەڵبە غەڵبەی كە لە هۆڵەكەدا بەرپا بوو بوو، نەیتوانی لە یەك دوو رستە زیاتر بژنەویٚ، لیٚ ئەو یەك دوو رستەیە بە رادەیەك خۆشحاڵ و ئومێدەواری كرد، كە بڕیاری دا درێـژە بە لێكۆڵینەوەو پرسو جۆیەكەی خۆی بدات، بۆیە دەستووری دا ژنو كچۆڵە مەحكومەكە، كە هەردووكیان لە دەرێی ژوورەكەدا، لە ترسا هەڵدەلەرزین، بێننە ژوورەوە.

هەر كە مەحكومەكان وەژووركەوتن، تۆم لە ئەفسەری فەرماندەكەی پرسی:

"ئیٚ، ئەمانە چیان كردووە؟"

"ئەزبەنی، ئەم جووتە تاوانێكی گەورەیان كردووەو چونكە تۆمەتەكەیان بە تەواوەتی لەسەر ساغ بووەتەوە، حوكم دراون كە لە سێدارە بدرێن."

"تاوانەكەیان چیە؟"

"ئەزبەنی، خۆیان بە شەیتان فرۆشتووە."

تۆم كە گوێی لەو قسەیە بوو موچوڕكێكی لە خۆی هێنا، چونكە لە هەوەڵەوە فێریان كردبوو كە دەرهەق بەوانەی ئەو جۆرە تاوانە قێزەونانە دەكەن، نەفرەتو بێزاری بنوێنیٚ، لیٚ وێڕای ئەمەش چونكە حەزی دەكرد هەستی لاپرەسەنیو كونجكاوی خۆی پاراو بكاتو بچێتە بنجو بناوانی مەسەلەكە پرسی:

"ئەم كارەیان كەیو لە كویٚ كردووە؟"

"ئەزبەنی، لە نیوە شەوی، شەوێكی مانگی دیسامبەرو لە كڵێسایەكی وێرانەدا، ئەم كارە دزێوەیان كردووە."

تۆم جارێكی دی موچوڕكەیەكی لە خۆ هێناو گوتی:

"باشە كەسی دی لەویٚ بووە؟"

"نەخێر قوربان، جگە لەم دوو ئافرەتە كەسی تری لیٚ نەبووە، هەندێك دەڵێن كە ژنێكی دیكەشی لیٚ بووە."

"باشە دانیان بە گوناحی خودا ناوە؟"

"نەخێر قوربان، نەك هەر دانیان بە گوناحی خۆدا نەناوە، بەڵكو هەر سەعاتو دەقیقەیەك بە بێعاریو بیٚ شەرمیەكی زیاترەوە نكوڵی لێدەكەن."

"كەواتە لەم حاڵەدا، چۆن پەی بەو تاوانە براوە؟"

"قوربان، چەند شایەدێك دیتوویانن كە ئەو شەوە بەرەو كڵێسا وێرانەكە رۆییون، و ئەو شایەدانە گومانیان لە كاری ئەم جووتە كردووەو لەبەر رۆشنایی ئەو گومانەدا شایەتیان لێداون كە ئەو تاوانەیان ئەنجام داوە. هەڵبەتە هیچ گومانێكیش لەمەدا نیە كە ئەم جووتە دوای ئەوەی جەستەو روحی خۆیان بە شەیتان فرۆشتووە، هێزو توانایەكی نائاساییان لا پەیدا بووەو لافاوو زریانو تۆفانێكی وەهایان هەستاندووە كە هەموو دەڤەرەكەی وێران كردووە. چل شایەدی بە

ئیحتوبار له دادگادا ئاماده بوون‌و شایه‌دیان له‌سه‌ر داون، چونکه خه‌ساره‌مه‌ندانی ئه‌و زریان‌و لافاوه له ناوچه‌که‌دا زۆرن، نه‌ك هه‌ر چل که‌س، به‌ڵکو هه‌زار که‌سیش ئاماده‌ن گه‌واهی بده‌ن."

"ئه‌لهه‌قی مه‌سه‌له‌یه‌کی ئاڵۆزه!"

تۆم، بۆ چه‌ند ده‌مێك له‌م تاوانه گه‌وره‌و ترسناکه راما، ئه‌وسا له پڕ سه‌ری هه‌ڵبڕی‌و گوتی:

"ئایا ئه‌م ژنه به‌خۆیشی له‌و زریان‌و لافاوه زه‌ره‌رمه‌ند بووه؟"

ژماره‌یه‌ك له ده‌رباریییه‌کان، که گوێیان له‌و پرسیاره پڕ حیکمه‌ت‌و زیره‌کیه بوو، سه‌ری ستایشیان بۆ له‌قاند، لێ ئه‌فسه‌ری فه‌رمانده، که په‌ی به ماقولیه‌تی پرسیاره‌که نه‌برد بوو، که‌وته ته‌ڵه‌وه‌و به‌وپه‌ڕی راشکاوی گوتی:

"به‌ڵێ قوربان، ده‌بێ دان به‌وه‌دا بنرێ که به خۆیشی له‌م نسیبه‌ت‌و به‌ڵایه به دوور نه‌بووه‌و خانووه‌که‌ی ژێرو ژوور بووه‌و خۆی وکچه‌که‌ی بێ شوێن‌و مه‌ئوا ماونه‌ته‌وه".

"ئێ، ئێ، ئێستا به ته‌واوه‌تی بۆم روون بووه‌وه که ئه‌م کلۆڵه، وه‌ك ده‌ڵێن بۆ ریش چووه‌و سمێڵیشی ناوه‌ته‌سه‌ر. تاوانێکی قورسی به‌دکاریه‌که‌ی خۆی داوه. دیاره شه‌یتان فریوی داوه‌و له‌و کاته‌دا که روحی خۆی‌و کیژه‌که‌ی به شه‌یتان فروشتووه، ئه‌قڵ میوانی نه‌بووه. واته شێت بووه‌و شێتیش گوناحی له‌سه‌ر نیه، به‌م پێیه ئه‌م ژنه بێ تاوانه".

جارێکی دیکه‌ش ده‌رباریانی پیرو به ته‌مه‌ن که سه‌ریان له‌م هه‌موو زانایی‌و فامیده‌ییه سوڕما بوون سه‌ری ستایش‌و ئافه‌رینیان له‌قاند.

یه‌کێکیان به ئه‌سپایی گوتی:

"ئه‌گه‌ر وه‌کو باوو بڵاوه پاشاکه‌مان شێت بێ، ده‌بێ شێتێکی تایبه‌تی بێ، چونکه وه‌کو ده‌بینین ره‌فتاری ئه‌و سوکنایی‌و هاوسه‌نگییه‌کی تایبه‌تی ئه‌وتۆ به شێتانی راسته‌قینه ده‌به‌خشێت که هه‌زار ئاقڵ خۆزیا به تواناو به‌هره‌ی ئه‌و ده‌به‌ن‌و به‌غیلی پێده‌به‌ن.

دوای ماوه‌یه‌ك بێده‌نگی، تۆم له سه‌ری رۆیی‌و پرسی:

"ئه‌م منداڵه چه‌ند ساڵه؟"

ئه‌فسه‌ره‌که وه‌ڵامی دایه‌وه:

"قوربان، نۆ ساڵ."

تۆم، رووی کرده یه‌کێك له‌و ده‌رباریانه‌ی که له نزیکی ئه‌و وه‌ستا بوو، و به یه‌کێك له مافناسانی نێوداری وڵات ده‌ژمێردرا،و پرسی:

"مای لۆرد، ئایا یاسای وڵاتی ئینگلیستان، رێ به کوڕ یان کچێکی له‌و ته‌مه‌نه ده‌دات که جه‌سته‌و روحی خۆی به شه‌یتان بفرۆشێت؟"

یارۆی مافناس عه‌رزی کرد:

"نه‌خێر قوربان، یاساکانی ئینگلیستان به هیچ کلۆجێ رێ نادات منداڵ هیچ جۆره سه‌وداو مامه‌ڵه‌یه‌ك بکات، خۆ ئه‌گه‌ر به رێکه‌وت شتی وا کرا، ئه‌و سه‌وداو مامه‌ڵه‌یه به تاڵه‌و وه‌کو ئه‌وه‌یه نه‌بووبێ. لێ شه‌یتان ئه‌گه‌ر بیه‌وێ، به مه‌رجێ منداڵه‌که خۆی مه‌یلی لێ بێ‌و رازی بێ، ده‌توانێ ئه‌و منداڵه بکڕێت."

تۆم هاواری کردو گوتی:

"بەڕاستی ئەم شتە لە بنەماکانی ئاینی مەسیحەوە دوورە من تێناگەم چۆن یاساکانی ئینگلیستان ئەو ئیمتیازەیان بە رەعیەتانی من سەرباری ئەهلیەتیان، نەداوە کەچی بە شەیتانیان داوە؟"

ئەم ئیعترازە کە زادەو هەڵقوڵاوی شەرافەتی سروشتیو جۆشو خرۆشی لاویەتی تۆم بوو، ئامادەبووانی خۆشحاڵ کردو بزەی شادی خستنە سەر لێو، و ژمارەیەکیان، هەمان ئەو وشانەی ئەویان بە چپە بە گوێی یەکدی دا دایەوە. دەربارییان ئەم خاڵەیان بە نیشانەی بەهرەو جەوهەری زاتی شای لاو لە قەڵەم داو، بە بەڵگەی بێ چەندو چوونی شیفای عاجیلی ئەویان لە شێتییەکەی زانیو هیوایان خواست، کە بە زووترین کات نیگەرانی گشتی، لەمبارەیەوە بڕەوێتەوە.

ژنەی مەحکوم کە لە گریان کەوتبوو و نیگای پڕ پاڕانەوەو لالانەوەو هیواو ئومێدی بڕی بووە سیماو چارەی تۆمو بە جۆرێ نقومی وتەو قسەکانی ئەو بوو بوو کە چاوی لە دەمو زاری هەڵنەدەگرت. تۆم–ش کە حاڵی پەریشانو پەشێوی ئەو، کاری لە ناخی کردبوو، و رەحمی جوڵا بوو،. لە دڵی خۆیدا لێبڕا کە هەرچییەکی لە توانادا بێ بۆ رزگاری ئەو ژنە لەو چارەنووسە تاڵو ترسناکە بیخاتە کار، بۆیە روویکردە کابرای فەرماندەو گوتی:

"باشە ئەم جووتە کلۆڵە چۆن توانیویانە زریانو لافاو بەرپا بکەن؟"

"قوربان بە داکەندنی گۆرەوییەکانیان."

"بە داکەندنی گۆرەویەکانیان؟ یانی چی؟"

تۆم تا چەند ساتێك لە سەرسامیا دەمی داچەقی، پاشان تۆزێ هێور بووەوەو هاتەوە سەر دۆخی ئاسایی خۆییو پرسی:

"یانی هەر ژنێك گۆرەوییەکەی لە پێ دابکەنێ زریانو لافاو هەڵدەستێ؟"

"قوربان، ئەگەر ژنێك بە خۆی بیەوێ زریانو لافاو هەستێ، بە داکەندنی گۆرەوییەکەی بە مراز دەگات بە مەرجێ لەگەڵ ویستو نیازەکەیدا وێردی تایبەتیش بە ئاشکرا یان لە زەینو دڵی خۆیدا بخوێنێ."

تۆم روویکردە ژنەکەی مەحکومو بە ئەمرەوە پێی گوت:

"ئا دەی توانای خۆت بخە گەڕو زریانو لافاوێك هەستێنە! من حەز دەکەم زریانو لافاو بدینم."

ژمارەیەکی زۆر لە ئامادەبووان، ترسان. رەنگیان زەرد هەڵگەڕا، ئەگەر دەرفەتیان هەبوایە، و دابی پاشایەتی رێگەی دابان، هەموو خۆیان دەدزییەوەو لە هۆڵەکە دەچوونە دەرێ. لی کەس زاتی نەکرد لە جێی خۆی بجوڵێت یان قسەیەك بکات. تۆم بە هیچ جۆرێ ئاگای لە دەربارییەکانی نەما بوو. کە بینی ژنەی تاین بە ترسو سەرسامی لێی دەڕوانێ، دیسان گوتیەوە:

"مەترسەو هەرچیەکت لە توانادایە بیکە! من گلەییت لێناکەمو خەتای تۆ ناگرم. و رێگات دەدەم بە کەماڵی ئیسراحەتو ئازادی لەم کۆشکە بچیتە دەرەوەو کەسیش رێگەت پێنەگرێ. دەی! توانای خۆت بخە کار. بزانم چیت لە دەست دێت!"

ژنەی تاین بە کزییەوە گوتی:

"قوربان، بە زاتی خوا من هیچ توانایەکم نیە، بە خۆڕایی ئەوەیان بۆ هەڵبەستووم، من هیچ خەتاو تاوانێکم نەکردووە".

"من دووبارە پێت دەڵێمەوە کە لە هیچ مەترسە، وەرە دڵی من خۆش بکەو لافاوێك هەستێنە. ئەگەر دەتوانی لافاوێکی چکۆڵە هەستێنە با زەرەر بە هیچ کوێیەك نەگەیەنێ. پاش ئەوە ئازادیت کە دەگەڵ کچۆڵەکەتدا بڕۆیتە دەرێ‌و لە هەموو شوێنی بڵێیت شا ئازادی کردووم‌و بەخشیومی. دڵنیاش بە کە هیچ کەسێك حەددی نابێ دەست لە رووی تۆدا بەرز بکاتەوە".

ژنەی تاین کڕنۆشێکی بردو بە دەم پاڕانەوەوە گوتی:

"قوربان، سوێندت بۆ دەخۆم کە توانای بەرپا کردنی زریان‌و لافاوم نیەو کە جەنابت دڵت نەرم بووەو بەزەییت جوڵاوە بەلای کەمەوە رەحمێ بە کچەکەمدا بکەو عەفوی بفەرموو. من بۆ خۆم ناپاڕێمەوەو هیچ عەرزێکم نیە، چونکە من پیر بووم‌و مردن‌و ژیانم وەکو یەکە."

لێ تۆم، بە دەم خەیاڵاتی خۆیەوە گوتی:

"ئەم ژنە ڕاست دەکات. ئەگەر قەرارداد دەگەڵ شەیتاندا بکرایە، دایکی من دەیکردو هەنوکە بۆ رزگار کردنی من لەم مەرگەی ئێستام، ئامادە بوو ترسناکترین‌و گەورەترین زریان‌و لافاوی جیهان هەستێنێ‌و سەرانسەری خاکی ئینگلیستان وێران بکات... بە هەرحاڵ خانم، تۆو کچەکەت هەردووکتان ئازادن، چونکە من بەبێ تاوانتان دەزانم. ئێستا کە لە ئازادی خۆت دڵنیا بوویت، تکایە گۆرەویەکانت دابکەنە، ئەگەر توانیت زریان‌و لافاو هەستێنی ئەوەندەت پارەو پول‌و سەروەت‌و سامان دەدەمێ کە لە خەویش دا بیبینی باوەڕنەکەی."

ژنەی تاین پاش ئەوەی بە دڵ‌و بەگیان‌و لە ناخی ناخەوە منەتباری خۆی دەربڕی، سوپاسێکی گەرمی شای کرد،‌و بینی شا سوورە لەسەر ئەوەی کە گۆرەوییەکانی خۆی دابکەنێ، یەکسەر گۆرەوییەکانی داکەند. تۆم سەری بۆ پێشەوە دانەواند بووو بەخەمباری دەیڕوانییە کارەکەی ئەو. دەست‌و پێوەندو دەربارییەکان کە لە ڕادەبەدەر شڵەژا بوون‌و بەرە بەرە هەڵدەچوون. ژنەی تاین نەك هەر گۆرەوییەکانی خۆی بەڵکو گۆرەوی کیژەکەشی داکەند.. داماوە بۆ ئەوەی وەفاداری‌و منەتباری خۆی بۆ شا بسەلمێنێ، ئەگەر بیتوانیبا نەك زریان‌و لافاو، بگرە گەرداوو هەورە تریشقەو گڕکان‌و بوومەلەرزەشی بەرپادەکرد. لێ بەلەنگازە هەوڵ‌و تەقەلاکەی هیچی لێ شین نەبوو. هەنگێ تۆم ئاهێکی هەڵکێشاو گوتی:

"بەسە، بەلەنگازی نەگبەت‌و مەزلووم، ئەگەر پێشتر بەهرەو توانایەکت بوو بێ، ئێستا ئەوەشت نەماوە. بڕۆ ئازادبە، لێ ئەگەر ڕۆژێ لە ڕۆژان ئەو توانا‌و بەهرەیەت ژیاوەو ئەو رازەت، کە دەڵێن فەرامۆشت کردووە، وەیاد هێنایەوە، من لە بیر مەکە، یەکسەر وەرە بۆ دیدەنی من‌و لافاوێکی باشم بۆ بەرپا بکە. قەولت دەدەمێ کە بەبێ پاداشت بەرێت نەکەم."

"١٦"

## فراڤین

وەختــی فــراڤین نزیــك دەبــووەوە. تــۆم هەســتی بــە شــڵەژان‌و نیگەرانیــەکی کــەم دەکــرد. جــێ بەجێکردنی کاری ئەو سێ نەفەرە مەحکومە بەدبەختە بەو شێوەیەی کە بینرا، جۆرە بوێری‌و متمانــە بــەخۆبوونێکی لا دروســت کردبــوو، چــونکە نیشــانی دابــوو کــە منــداڵێك لــە گــەلێك لــە گەورەکان بالاَ دەست ترە. لە زەرفی چوار دانە ڕۆژدا، منداڵێکی وێڵ‌و ئاوارەی کوچەو کۆلاَنان، کوریژگەیــەك کــە بــە گــەدای گــەدایان دەژمێــردرا، لــە ســەرووی مەجلیســی گــەورە پیاوانــدا دانیشتبوو،و تاڕادەیەك لەسەر ژیانی تازەی خۆی راهاتبوو.

جا با ئێستا بڕۆین بۆ هۆڵی نانخواردنی کۆشك.

ئەم هۆڵــە ژوورێکــی گەورەیــە، پایــە وکۆڵەکــەی گــەورەی زێڕکفتــی هەیــە، ساپیتەو دیوارەکــانی یەکپارچە نەخش‌و نیگاری جوان بوون. چەند پاسەوانێکی قۆزی بالاَبەرز، پەیکەر ئاسا لەبەر دەرگای هۆڵەکە وەستا بوون. هەموو تەورزین بە دەست، بە جلکی جوانی گرانبەهای یەك شێوە وە ڕەق راوەســتا بــوون. گــۆرانی بێــژان‌و ئــەهلی مۆزیــك‌و هونــەر لــە سوچێکی ڕاڕەوی هۆڵەکــەدا خڕبوونەتــەوەو خــەڵکێکی زۆر لــە پیــاو مــاقولان‌و دەوڵەمەنــدانی شــار، لــە ژن‌و پیــاو، لــە نێویانــدا دەبینــرێن. ژنــان جلکــی زۆر جوانیــان لەبــەر کــردووەو بــە هــەموو لایەکــدا خــۆ دەهــەژێنن. مێــزی نــانخواردنی شــا لــە ناوەنــدی هۆڵەکــەدا دانــراوەو کورســیەکی دەســکداری گــەورەی لەپشــتەوە دانراوە.

یــەکێك لــە نــەجیبان بــە دارێکــی بــاریکی درێــژەوە لــە ئاســتانەی دەرگاکــەوە وەژوور دەکــەوێ. نەجیمزادەیــەکی دی لــە دوای ئــەوەوە بەســفرەیەکەوە وەژوور دەکــەوێ. هــەردووکیان لەبــەردەم کورسییەکەی پاشادا سێ جاران بە چۆکدا دێن، سفرەکە لەسەر مێزەکە ڕادەخەن‌و پاش ئەوەی کــە بــۆ جــاری چــوارەم کڕنــۆش دەبــەن، لــە دەرگــای هۆڵەکــەوە وەدەردەکــەون. دوای ئــەوان دوو نــەجیمزادەی دی وەژووردەکــەون، ئــەمجارەش نــەجیمزادەی یەکــەم دارێکــی بــاریکی درێــژی بــە دەســتەوەیەو،و دووەمیــان خوێــدان‌و قــاپ‌و نــانی هــەڵگرتووە. دوای ئــەوان دووکــەس لــە پیــاو ماقولان دێن‌و کێردو چەقۆی پاشا بەوپەڕی پارێزو ئەدەب‌و نەزاکەتەوە لەسەر سفرەکە دادەنــەن. دوای تەواو بوونی ئەو تەشریفات‌و ڕێورەسمە لە ڕاڕەوی دەرێی هۆڵەکەوە دەنگی شەیپوران‌و بۆقی بەرز دەبێتەوە،و هەر بانگەو لە دوورەوە دووبارە دەبێتەوەو دەڵێن:

"لا کەون، ڕێگە بۆ پاشای ئینگلیستان چۆڵ بکەن!"

ئەم دەنگانە سات بە سات نزیکتر دەبنەوە، تا پاسدارانی کاروانەکەی شا دەگەنە جێ‌و دەچنە ناو هۆڵەکەوە.

لە پێشا (بارۆن)و (کۆنت)و (پاڵەوانان)ی بەر پرسی بەستنی گۆرەوی‌و زەنگالاَن دێن. لە دوای ئەوانــەوە ســەرۆك وەزیرانــی ئینگلیســتان لــە بــەینی دوو ئەفســەردا، کــە یــەکێکیان ســەوڵەجان‌و ئەویتریان شمشێری پاشایان هەڵگرتووە، دێت. پاشا، لە دوای ئەوانەوە ڕێدەکات. دەنگی دوانزە شەیپور، دەگەڵ گرمەی دەهۆڵاَندا تێکەڵ دەبێت‌و خێرهانینی شا دەکەن. لەگەڵ بــەرز بوونــەوەی دەنگــی شــەیپورو دەهۆڵاَنــدا ژمارەیــەکی زۆر لــەو خەڵکــەی کــە لەمبــەرو لەوبــەری ڕارەوەکــەدا وەستابوون بە دەنگی بەرز هورایان دەکێشا:

"خوا، شا بپارێزێ!"

کۆمەڵێك لەو گەورە نەجیبانەی کە پەیوەندی نزیکیان بە شاوە هەبوو، لە دوایەوە بوون. پەنجا کەس لە پاسەوانانی گاردی شەرەف، تەورزین بە دەست،. بە ریز ئەم دیوو ئەو دیویان گرتبوو.
بە ڕاستی دیمەنێکی جوان و بەشکۆ بوو! تۆمی بەسەرزمان هەستی دەکرد دڵی بەتوندی لێدەدا. بریسکەی شادی لە چاوانیا پرشنگی دەدا. لوتف و نەجابەت و ویقارو سەنگینی لە سەراپای دەرباری. شادی و خۆشی تۆم لەبەر جلە جوانەکانی نەبوو، چونکە ئەوەی بیری لێنەدەکردەوە و بەلایەوە گرینگ نەبوو جلکی فاخیرو نایاب و ڕەنگا و ڕەنگ بوو. بەڵکو لەبەر ئەمە بوو کە دەیڕوانیە هەر لایەك جگە لە دیمەنێن شادی بەخش و پڕشکۆ هیچی تری نەدەبینی. تۆم چونکە تەعلیماتەکەی باش لەبەر کرد بوو، لە هەنبەر پێشوازی گەرمی جەماوەری رەعیەتەکەی خۆیدا بە ئاستەمێك سەری دادەنەواندو بزە لە لێوی نەدەبڕا. تۆم کڵاوێکی لەسەر بوو کە پەڕێکی جوانی پێوەکرا بوو. بەلەنگازە جارجارێکیش لە بن لێوانەوە ورتە ورتێکی دەکرد و دەیگوت:
"میللەتی نەجیبم، من زۆرت لێ مەمنونم!"

تۆم، لە پشت مێزەکە دانیشت، کڵاوەکەی دانەکەند، هەڵبەتە دانەکەندنی کڵاو لەسەر نانخواردن جێگەی هیچ گلەییەك نەبوو، ئەدی هەر لە منداڵیەوە بەو جۆرەی نەهێنا بوو؟ چما نان خواردن بەکڵاوەوە، تاقە خاڵی هاوبەشی نێوان خانەوادەی کانتی و خانەوادەی پاشایەتی ئینگلیستان نەبوو؟

پاسدارانی کاروانەکە لە سەرەتادا لێکدی جیا بوونەوە و جارێکی دی لە گۆشەو کەنارانـدا، بەشێوەی کۆمەڵ کۆمەڵی بچووك خڕ بوونەوە. لەم کاتەدا ئەفسەرانی گارد بە سەری کۆت و جلێن رەنگا و ڕەنگی جوانەوە کە نەخشی گوڵەباخیان بە سەرا ئاڵدۆزی کرابوو، هاتنە هۆڵەکەوە. هەر یەکەیان قاپێ خواردنی بەدەستەوە بوو کە دەیدایە دەستی یەکێك لە نەجیبانی دەرباری. کەسێك بە عینوانی (چێژەر) یان پێشمەرگ، لە پای مێزەکەی پاشا وەستا بوو.

ئەم (چێژەرە) کاری ئەوە بوو، تۆزێکی لەو قاپە خۆراکەی کە هەر یەکێك لە ئەفسەرانی گارد لە موبەقەوە تا هۆڵی نانخواردن هێنابووی، بە هەر یەکێکیان دەچەشت تا نەبادا لەو مەسافەیەدا ژەهریان تێکردبێت.

تۆم، وێڕای ئەوەی کە دەی بینی سەدان چاو چاودێری بچووکترین رەفتاری ئەوەو بە کونجکاوی و لاپرەسەنیەوە تەمەشای هەر پاروە خۆراکێك دەکەن کە بۆ دەمی دەبات، فراڤینێکی خۆش و باشی خوارد. بەلەنگازە بە ترس و لەرزێکی زۆرەوە پاروەکەی لە زار دەناو هێندە هەراسان و سڵ و سرك بوو لە تۆ وایە لە جیاتی خۆراك دەست بۆ تی ئێن تی درێژ دەکات. تۆم لە کاتی نانخواردندا زۆر بە پارێزەوە رەفتاری دەکرد، هێندەی لە توانادا بوو هەوڵی دەدا لە کاتی خواردندا پەلەنەکات، بە تایبەتی هەوڵی دەدا کە بە خۆی دەست لە هیچ شتێك نەدات و خۆسەری هیچ کارێك نەکات. بەمجۆرە تۆم بچووکترین هەڵەی نەکردو لەم ئەزموونە ئەستەم و قورسەدا، کە بریتی بوو لە نانخواردن بە بەرچاوی خەڵکییەوە، سەرکەوتنێکی گەورەی بە دەست هێنا.

هەرکە تەشریفاتی نان خواردن بە بەرچاوی خەڵکییەوە کۆتایی هات. شا بە هەمان وەزعو حاڵەوە کە هاتبوو، خرایە بەینی پاسداران و هاودەمانی خۆیەوەو هەرکە دەنگی نزمو ناخۆشی شەیپوران و گرمەی دەهۆڵان و هاواری پڕ جۆش و خرۆشی ئامادەوبووان لە ئاسمانی هۆڵەکەو ڕاڕەوەکانیدا بەرز بووەوەو دەنگی دایەوە، لە ژووری نانخواردن وەدەرکەوت. تۆم لە کاتی زڤرینەوەدا لە دڵی خۆیدا دەیگوت:

"ئەگەر رۆژی چەند جارێك لەم جۆرە تاقیکردنەوانەم بکەن قەبوڵمە، بە مەرجێ لە هەموو بێگارە قورسەکانی دیکە کە پیشەی پاشایەتیان ناخۆش کردووە، عەفوم بکەن!".

((١٧))

## بالولی، یەکەم سوڵتانی گەوجان

مایلز هندن، بە هەشتاو بەرەو ئەو سەری پردی لەندەن کە نزیکی (ساوتۆرك) بوو، رۆیی، بە هیوا بوو ئەو کەسانەی کە بۆیان دەگەڕا بدۆزێتەوە. مایلز هندن توانی لە ماوەیەکی تا رادەیەك کەمدا بە پرسیار لەم رێبوارو لەو رێبوار لە گەڕەکی (ساوتۆرك)دا سۆراخێکی شازادەی چکۆلە وەدەست بێنێ، بەڵام زێدەباری ئەمەش چەند گەڕاو سوڕایەوە هیچ هەواڵێکی لەمەڕ شازادە بەدەست نەکەوت. هەرکە شەو داهات مایلز هندن ماندوو و مردوو لەبەر ئوتێلێکی چکۆلەدا وەستا، بۆ شیو کردن خۆی وەژوورا کرد، ئەوسا بۆ خەو بۆ ماڵەکەی خۆی زڤرییەوەو لێبڕا کە سبەینێ دەگەڵ گەردی بەیانیدا بکەوێتە گەڕان و سەر بە هەموو پەناو پەسێرێکدا بکات و ئەگەر پێویستی کرد هەموو شار بداتە ژێر پێوە. ئەم لاوە لەسەر تەختە خەوەکەی خۆی راکشا بوو، و بیری دەکردەوەو لە دڵی خۆیدا دەیگوت:

"کوڕیژگەی داماو، هەڵبەتە هەوڵدەدات لەدەست بابە درۆینەکەی هەڵێت، لێ ئەگەر توانی هەڵێت چ دەکات؟ ئایا بەو نیازەی کە بۆ نك من بگەڕێتەوە، دیسان دێتەوە بۆ شاری لەندەن؟ نەخێر، چونکە چاك دەزانێ کە ئەگەر کاری وا بکات ئەوپەڕی بێ موبالاتی و خەمساردیەو تاقیبکارانی زوو بەزوو دەیگرنەوە. بە ئەقڵی من یەکسەر بۆ (هندن هول) دەڕوات. بۆ نا، ئەدی من پێم نەگوتبوو کە بە تەمام دەگەڵ ئەودا بۆ زاگەو نیشتمانی خۆ بگەڕێمەوە؟ بۆیە من دەبێ یەك کار بکەم، و ئەوەیش ئەوەیە کە لە رێگەی (مونکس هولم)ەوە یەکسەر بۆ دەڤەرو ویلایەتی (کنت) بڕۆم و لێرو دارستانەکانی سەر رێگەی بۆ بگەڕێم و پرسیار لە رێبوارانیش بکەم."

جا ئێستا با بێینەوە سەر سەربهوری شازادەی چکۆلە.

ئەو پیاوەی کە گارسۆن و بۆی ئوتێلەکە، لەو سەری پردی لەندەن دیتبووی و گوتبووی کە شێوەو هەیئەتی هەر بۆ پای قەنارە باشە، کە بینی نێردراوەکەی دەگەڵ شازادەی چکۆلەدا، گەڕایەوە، بێئەوەی ورتە بکات، یان خۆی شێلو بکات، چاوەڕوانی کرد تا ئەوان گەییشتن، و ئەوسا بە دویاندا کەوتە رێ. ئەم پیاوە قۆڵی چەپی لە ملیا هەڵبەستوو، سارغییەکی کەسکی بە چاوی چەپییەوە بەستبوو، وبە ئاستەمێ دەلەنگی، بۆیە بە دارشەق دەڕۆیی. کابرای نێردراو،

شازادەی بە نێو گەڕەکی (ساوتورك)دا دوای خۆی دا. کە گەییشتنە جادەکەی دەرێی (ساوتورك) شازادە توڕە بوو، لە جێی خۆی وەستاو گوتی:

"دەبوایە مایلز هندن بێ بۆ لای من، نەك من بۆ لای ئەو بچم. وا دیارە ئەم پیاوە، زۆر بێ شەرمو حەیا دەرچوو. من ئیدی لێرە ناجوڵێم، یەك هەنگاوی دی نانەم"

کابرای نێردراو گوتی:

"چۆن؟ یانی ناتەوێ لێرە بجوڵێی؟ هاوڕێکەت بە زامداری لە گۆشەیەکی دارستانەکە کەوتووەو چاوەڕوانی تۆیە"

شازادەی بچووك کە گوێی لەم قسەیە بوو، سیمای گۆڕاو گوتی:

"زامدارە؟ باشە کێ زاتی کردووە بریندار بکات؟ خێراکە، خێرا، نابێ کاتەکە بە چەنەبازی بە فیڕۆ بدرێ. دەبێ تا زووە فریاکەوین، پەلە بکە! گوتت بریندارە؟ خوا بەو سەرەوە عالیمە ئەگەر کوڕی (دۆك)ش ئەمەی کردبێ بەسەریەوە ناچێ‌و دەبێ پەنجەی پەشیمانی بگەزێ."

دوای چەند دەقیقەیەك بە جووتە گەییشتنە لێڕەوارەکە.

کابرای نێردراو تەمەشایەکی دەوروبەری خۆی کرد، لە لقەدارێك کە لە عاردیان چەقاند بوو و پەڕۆ کۆنێکیان بە سەریەوە بەستبوو، نزیك بووەوە. ئەوسا لەوێ ڕەت بوو گەییە لقە دارێکی میناکی لقە داری یەکەم. ئەوسا گەییە لقی سێیەم‌و چوارەم‌و هەر بەو دەقەوە دەڕۆیی. ئەم لقانە بۆ دیاریکردنی مەوداو سەمتی ڕێگا بوو. لە پڕ کابرای نێردراو‌و شازادە گەیینە بەتاڵاییەکی ناو لێڕەوارەکە. کە لە نزیکیا شوێنەوارو خەرابەی کوختەیەکی پەرپوتی داروخاوی دێهاتی دەبینرا، و لە خاکەی ڕەژوودا ڕەش هەڵگەڕا بوو، لە نزیکی ئەو خەرابەیەدا عەمارێکی وێرانەی داڕوخاویش هەبوو. بێدەنگییەکی ڕەها باڵی بەسەر لێڕەوارو بێشەکەدا کێشا بوو، و هیچ نیشانەیەکی ژیان‌و ئاوەدانی لەو ناوەدا نەدەبینرا. نێردراوەکە، کە لە پێش شازادەوە ڕێی دەکرد، خۆی وەعەمارەکەدا کرد. کەس لە عەمارەکەدا نەبوو. شازادە نیگایەکی پڕ گومانی دەوربەرو دەلیلەکەی خۆی کردو پرسی:

"ئەدی ئەو کوا؟"

خەندەیەکی نێشدارو پڕ تەوس‌و تەڵفیزی وەڵامی ئەو پرسیارەی دایەوە. ئیدوارد تودور کە دەهری بوو بوو، سەرە بزووتێکی لە عاردی هەڵگرت‌و بە دەوری خۆیدا بای دا.. خەندەیەکی تەوس ئامێزی دیکە لە پشتییەوە بەرز بووەوە، ناچار ئاوڕی دایەوەو تەمەشای پشتەوەی کرد. هەمان ئەو پیاوە بوو کە بە قۆڵی هەڵبەستراوەوە لەسەر پردی لەندەن وەستا بوو و چاوەڕوانی دەکردن، ئێستا لە نێو ئاستانەی دەرگاکەدا وەستا بوو. شازادەی چکۆلە بە دەنگێکی توڕە هاواری لێکردو گوتی:

"تۆ کێی؟ لێرە چ دەکەی؟"

کابرا بە تەوسەوە گوتی:

"بەسە ئیدی، خۆت کەر مەکە. ناشێ دیسان بڵێی کە بابت ناناسی؟"

"تۆ بابی من نیت. من بە هیچ جۆرێ تۆ ناناسم. من پاشام. بڕۆ نۆکەرەکەم بانگ بکە، کوا لە کوێیە؟ ئەگەر بە گوێم نەکەی، هەر بە هەمان نۆکەر دەڵێم لە قیمەت بدات."

جۆن کانتی بە دەنگێکی زبر، لێ هێدی بەرسڤی دایەوەو گوتی:

"کوڕۆ، تۆ بەڕاستی شێتی،و خوا قەبوڵ ناکا دارکاریت بکەم، بەڵام ئەگەر ناچارم بکەی مەجبورم... جاری تا لێرەین، دادو بێدادو هاتو هاوارو وڕاوەو شێتبازی تۆ بچووکترین کارم تێناکات. بەڵام ئاگادارت دەکەمەوە کە دەبێ لە ئێستاوە ئاقڵ و وریا بیت، چونکە لەگینە ناچار بین ئەم شوێنەمان بگۆڕین. ئەوە بزانە کەمن قەتڵێکم لە دەست قەوماوەو ناتوانم لەم دەڤەرەدا بژیم. هەروەها ناچار بووم ناوی خۆیشم بگۆڕم. من ئێستا نێوم هۆبسە، حاڵی هەی؟ جۆن هۆبس... ناوی تۆش (جاك)ەو هەڵبەتە نابێ ئەم ناوە لە بیر بکەی، وا نیە؟ دەی پێم بێژە دایکت و خۆشکەکانت لە کوێن؟ من لەو شوێنەی کە قەراری دیدارم دەگەڵدا هەبوون، نەم بینین. تۆ دەزانی کێوە چوون؟

شازادەی چکۆلە، بەروو گرژی و مۆنی گوتی:

"تۆ بەم مەتەڵ و لەغزە بێ مانایەت مێشکی سەرت بردوم! دایکی من مردووەو بابم ژنی تری هێناوەتەوەو خوشکەکانیشم لە کۆشکدا دەژین."

کابرای نێردراو لە قاقای پێکەنینی دا، شازادەی چکۆلە کوڵە مستی گۆشی و ویستی پەلاماری بدات، لێ جۆن کانتی یان جۆن هۆبس، کەوتە بەینەوەو گوتی:

"دەمت داخە هۆگۆ، تۆ خۆت دەزانی ئەم کوڕە شێتەو هۆش و گۆشی نیە. جاك، تۆش ئاقڵ بە، هەر ئێستا خواردنت دەدەمێ."

جۆن هۆبس و هۆگۆ بە ئەسپایی دەستیان بە قسان کرد، شازادەی چکۆلەش کە تەواو لە گفتوگۆکانی ئەو جووتە بێگانەیە پەست و بێزار بوو بوو. چوو لە بنەبانی عەمارەکەدا، لەسەر شڕە حەسیرێك کە لە سوچێکدا رایان خستبوو، راکشا. ئەوجا لەجیاتی لێفەو پێخەف چەند چنگێك پوش و پەڵاشی بەسەر خۆیدا داو نوقمی دنیای بیرکردنەوەیەکی قووڵ بوو. شازادە هەزارو یەك خەمی لە دڵدا بوو، لێ هەموو خەمەکانی بەلایەك و خەمی مردنەکەی بابی بەلایەك. هنری هەشتەم، پاشای رەحمەتی، لەبەر چاوی میللەتەکەیدا هەمیشە وەکو دێوێکی ترسناك بەرجەستە بوو بوو. جانەوەرو دڕندەیەك بوو کە لەوە بوو، بە تیلەی چاوێك هەزاران کارەسات بەرپا بکات. جگە لە ئیمزای حوکمی ئیعدام هیچ هونەرێکی دیکەی لە دەست نە دەهات، لێ ئەم رەمزی کلۆڵی و نەگبەتیە، لە ویژدان و نیهادی کوڕەکەیدا جگە لە یادگاری میهرو مەحەبەت و خۆشی و پڕ سۆزی هیچ شتێکی دیکەی بەجێ نەهێشتبوو.

شازادەی نەگبەت لە ژێر کاریگەریی یادگارێن شیرین و خەمڕەوێنی بابی دا، هەستی کرد روندك لە چاوانی قەتیس ماوەو گریان ئەوکی گرتووە. بەلەنگازە ئەنجام خەوی لێکەوت و خەوێکی خۆش و هێدی و ئارام بردییەوە.

کە دوای چەند سەعاتێك لە خەو رابوو، بۆ ماوەیەکی زۆر بە دەم خەیاڵەوە لەسەر هەمان حەسیر جوڵەی نەکرد. لە دڵی خۆیدا دەیگوت: "خودایا، من لە کوێم و چیم بەسەر هاتووە؟" پاشان کە

گوێی لە دەنگی لێزمەی باران بوو بەسەر سەربانەکەدا دادەباری خۆی قانگڵە کردو خزییە ژێر حەسیرەکەوە. شازادە لە پڕ لە جێ ڕاپەڕی، چونکە دەنگی دادو بێدادو هەراو هۆریایەکی زۆرو پێکەنینێکی زبرو کرێتو دزێوی هاتە گوێ. بەلەنگازە سەری هەڵبڕیو تەمەشای کرد کە لە بنەبانی عەمارەکەدا ئاگرێك نێڵە نێڵ دەسووتێو گروپێکی سەیر دەوریان داوە، گروپێکی هێندە سەیر مەگەر هەر لە خەوا تەحەمول بکرێ. لە نێو ئەو گروپەدا خەڵکانێکی کەتەو زلهۆرتو شڕ پۆشی قژنو دەموچاو تاوەگاز هەبوون، گەنجانێکی سیما زبرو دزێو هەبوون، خەڵکانێکی سواڵکەرو گەداو کوتو کوێرو نقوستان هەبوون کە بەلاقی داریین یان دارشەق دەڕۆییشتن. کابرایەکی چەرچی زلهۆرتی ترسناکی ڕەزا قورس، چەقۆ تیژکەرێکی ڕەشتاڵەی سیما تاوەسووت، کابرایەکی مسگەرو کابرایەکی کیسەکێش-یان لە نێودا دەبینران. هەندێ ژنیان دەگەڵ بوو کە تەمەنیان نەگەیی بووە سی ساڵان، بەڵام هەندێکی تریان پیرەژنانی جادووگەریان وەبیر مرۆۋ دێنایەوە. هەندێ منالی شیرە خۆرەیان دەگەڵ بوو کە دەموچاویان وەکو پیرەمێردان چرچو لۆچ بوو، ودەگەڵ ئەو کسۆکانەدا گەمەیان دەکرد کە هی کوێرەکان بوون. ئەم کۆمەڵە هەموو لە دەوری ئاگرەکە دانیشتبوون، و قسەیان دەکردو پێدەکەنینو هاواریان دەکردو سەریان کردبووە مەی نۆشییەکی بێ وێنە.

دوای نان خواردن، ئیدی قاپە وێسکی کەوتە گەڕانو دەستاو دەست کردن، هەموو جامو پیاڵەیان لە دەستی یەکدی دەفڕاند، ئەوجا یەکێکیان بە زۆڕە زۆڕ هاواری کرد:

"گۆرانی بڵێن، گۆرانی!"

کوێرێك لە جێی خۆی هەستا، سارغیەکەی سەرچاوی کردەوە، بە چاوە ساغەکەی، نیگایەکی پڕ خەندەو شادی جماعەتی کردو بە دەنگێکی ناساز دەستی بە گوتنی گۆرانیەك کرد کە شازادەی چکۆلە هیچی لێ حالی نەبوو، چونکە گۆرانی گۆرین بە زمانی تایبەتی دزان بوو. بەلام ئامادەبووانی مەجلیسەکە بە باشی تێی دەگەییشتنو هەر هەموویان لەگەڵ ئەو گۆرانی بێژە کوێرەدا گەرم بوونو کردیان بە گەڕەلاوژەو هەراو هەنگامەیەکی وەها کە کاریتەێن عەمارەکە کەوتنە لەرزینەوە.

دوای گۆرانی، کەوتنە حیکایەتو باسان. یەکێکیان لە جون هوبس-ی پرسی:

"ئەرێ دەمێکە تۆمان نەدیتوە، کارەکەت بە کوێ گەیی!"

جۆن هوبس گوتی:

"ئەگەر پیاوم نەکوشتبایە، بۆ خۆم ئێستا لە لەندەندا دەژیام. پیاو لە شارا باشتر هەڵدەکات تا لە گوند، بە تایبەتی ئەگەر پیشەیەکی وەکو منی هەبێ. بۆ نەگبەتی ئەم ڕێکەوتە بچووکەم لێقەوماو ئیدی دڵنیام کە ناچار دەبم تا مودەتێك لە گوندی بژیم."

ئەوجا رووی کردە سەرۆکی دزان، کە هەموویان بە ماتامۆر بانگیان دەکردو گوتی:

"ئێستا دەستەکەی تۆ چەند کەسن؟"

ماتامۆر بە کەشو فشێکی تایبەتییەوە گوتی:

"تێکڕا بیست‌و پێنج کەسین،بیست‌و پێنج دزی جەربەزەی جەردەی شەوگەڕو گیرفانبڕ، ئەمە جگە لە ماشوقەو ژنەخشکۆك‌و جوانەکانیان. ژمارەیەك لەم دزانە لێرە لە خزمەتی تۆدان، ئەوانی دی بەرەو رۆژهەڵات یانی بۆ زستانەوار رۆییشتوون. ئێمەش. سارەزی بەرەو لای ئەوان دەڕۆین"

جۆن هۆبس لە سەری رۆیی‌و گوتی:

"لە نێو ئەم پیاوە شەریفانەی کە لێرە دانیشتوون، گواترو نابینم، ئەو ئێستا لە کوێیە؟"

"حەیف! بەلەنگاز خۆت گواترو! ئەو نەگبەتە کە ئەوەندە لە خۆراکدا دژ پەسند بوو، ئەمێستا گڵی گۆڕ دەخوات، بەستەزمانە پار زستان لە شەڕێکدا کوژرا."

"بەداخەوە! ئەلهەقی کوڕێکی ئازاو شایستە بوو."

"بەڵێ، ئەلهەقی کوڕێکی باش بوو، شوێنی لێرەدا دیارە. لیٚ ژنە ئازیزەکەی (بسە ڕەش) هەر لەگەڵ خۆمانە. ئەویش بۆ زستانەوارەکەمان چووە. ژنێکی یەجگار جدی‌و بە تەربێتە، کەس ناتوانیٚ بڵیٚ کە ئەوی لە هەفتەی چوار رۆژ زیاتر بە مەستی دیتووە."

"ها... بەڵیٚ، بەڵیٚ، ئێستا بیرم کەوتەوە. ئەلهەقی کچێکی ئازاو بەغیرەتە! چەندی تاریف بکەی کەمە. ئەگەر بە هەڵەدا نەچووبم، دایکی بە ئەندازەی ئەو شیرین‌و دڵگیر نەبوو. پیرەژنێکی سەختگیرو گرژو مۆن‌و عەبوس بوو، بەڵام هۆش‌و گۆش‌و زیرەکی شەیتانی هەبوو. گرەوی لە شەیتان بردبووەوە".

"ئەنجام بوو بە قوربانی هۆش‌و زیرەکی خۆی. ئەو پیرەژنە نەگبەتە هێندەی دەست گرتەوەو چارەنووس‌و تالحی خوێندەوەو فاڵی گرتەوە کە بە جادوگەر نێوبانگی دەرکردو قازی‌و حاکمان، حوکمیان دا کە بەزندوویەتی بخرێتە ئاگرەوە... ئاه.. خۆزگە لەویٚ دەبوویت‌و دەتبینی لەو کاتەدا کە بڵێسەی ئاگر تێی وڕکا بوو و کەزییە بۆزەکەی دەسووتاند، چۆن جنێوی بە گەوجان‌و خۆشباوەڕان دەدا. باوەڕ بکە ئەگەر هەزار ساڵی دیکەش بژیم، دەنگی ئەوم لە گویٚ دەرناچێت‌و ناسڕێتەوە. هەر دەڵێی دوێنێیە. چ دەمێکی گەرمی هەبوو! چ پڕ جۆش‌و خرۆش بوو! چ قسەیەلێکی دەگوت، و چ دەم‌و زارێکی پێوە بوو! دڵنیابە کە لە شێوەی نوتق‌و وتاربێژیدا موریدانێك پەیدا دەکات، لیٚ دڵنیام کە لە جنێودان‌و دەم پیسیدا، لە هەموو دنیادا هاوتای نیەو هیچ دەربڕین‌و ئینشایەك بە فەساحەت‌و بەلاغەتی ئەودا ناگات."

لێرەدا ماتامور ئاهێکی هەڵکێشاو جماعەتێك لە هاوڕێکانی بۆیان سەندەوە. هەموو سەریان داخستبوو و خەمبار بوون، چونکە خویایە کە یاخیان‌و یاسا بەزێنان، وەکو خەڵکی تەسەور دەکەن، بیٚ هەست‌و سۆز نین. بە تایبەتی لەو کاتانەدا کە هەست دەکەن یەکێك لە جەربەزەکانیان نەماوە.

لەگەڵ ئەمەشدا، ئامادە بووان دوای ئەوەی قاپە ویسکییەکەی دیکەشیان فت کرد، داخ‌و کەسەرەکەیان رەوییەوەو گەڕانەوە سەر کەیف‌و سەفاکەی پێشوویان.

جۆن هوبس، هەمدیس هەڵیدایە‌و گوتی:

"باشە کەسی دی لە هاوڕێکانمان هەیە، تووشی بەڵا بووبیٚ؟"

ماتامور گوتی:

"بەڵێ چەند کەسێك هەن، بە تایبەتی لە نێو تازەکاندا. ئەهای یوکل، هەستەو بەسەرهاتی خۆت بگێڕەوە!"

یوکل، لە شوێنی خۆی هەستاو، بەمجۆرە هاتە زمان:

"من کابرایەکی وەرزێر بووم، ژن‌و منداڵم هەبوو، لێ ئێستا نە ماڵم هەیەو نە منداڵ. ڕەنگە بپرسیت ئەدی ماڵ‌و منداڵەکەم چیان بەسەر هاتووە؟ من بە خۆیشم نازانم. لەوەیە بۆ ئاسمان هەڵکشابن. بە هەرحاڵ ئەوەی کەلای من روونەو لێی دڵنیام –و لەم رووەوە شوکری خوا دەکەم– ئەمەیە کە حاڵی حازر لە ئینگلیستان نین. دایکم کە یەکپارچە لوتف‌و مەرحەمەت بوو لە ڕێگەی پەرستاری‌و تیماری نەخۆشانەوە گوزەرانی دەکرد.

ڕۆژێك، یەکێك لە نەخۆشەکان مرد. پزیشکەکان چونکە نەیانتوانی بەڵگەی قەناعەتبەخش بۆ مردنی ئەو نەخۆشە بدۆزنەوە، گومانی جادوگەریان خستە سەر دایکم‌و بەوەیان مەحکوم کرد کە بەزندوویەتی بیسوتێنن –براینۆ، پێکەکانتان هەڵبڕن، با بە سەلامەتی یاساکانی ئینگلیستان بخوێنەوە– دوای ئەو کوشتنە تراجیدییەی دایکم من‌و ژنەکەم کەوتینە سواڵ‌و بە لە دەرگادانی ماڵان پاروە نانێکمان پەیدا دەکرد، لێ چونکە برسی بوون لە ئینگلیستاندا بە تاوان حیساب دەکرێ، گرتیانین‌و شەلاقکارییەکی باشیان کردین. ژنەکەم، یانی ماری ئازیزم بەرگەی ئەو ئەشکەنجە دڕندانەیەی نەگرت‌و لە ژێر شەلاق‌و جەڵدەدا مرد، بۆیە ئەمڕۆکە لە گۆڕستانی گشتیدا، خەوی یەکجارەکی لێکەوتووە –کوڕینە با بخۆینەوە، بە سەلامەتی یاساکانی ئینگلیستان– ڕەنگە بپرسن‌و بڵێن ئەدی منداڵەکانم چیان بەسەر هات؟ ئەوانیش کەوتنە حاڵی برسیەتی‌و بۆ تێرکردنی ئەوان، جارێکی دی کەوتمەوە سواڵ‌و دەرۆزە، ئەمجارەیان گوێیەکیان بڕیم. چونکە نەمدەتوانی دەستبەرداری گەدایی ببم، گرتیانم‌و وەکو کۆیلە فرۆشتیانم‌و بە داغمەی داغ نیشانەی (غ)یان(واتە غولام) نا بە سەر گۆنامەوە. بۆیە ئێستا من غولامم، غولام... غولامی ئینگلیزی! من لە دەستی خاوەنەکەم هەلاتووم‌و ئەوەتام لە نێو ئێوەدام، لێ ئەگەر بەردەستیان بکەوم، دڵنیابن کە لە سێدارەم دەدەن. بەڵێ، ئەمەیە یاسای ئینگلیستان!"

لەم کاتەدا دەنگێکی لەرزۆك، لە نێو هەراو هەنگامەو غەڵبە غەڵبی عەمارەکە بەرز بووەوەو گوتی:

"نا، تەواو ئیتر لە سێدارە نادرێی، چونکە لەمڕۆ بە دواوە ئەم یاسایە هەڵدەوەشێتەوەو کاری پێناکرێ."

هەموو ئامادەبووان ئاوڕیان بۆ لای سەرچاوەی دەنگەکە دایەوە، شازادە بە هەشتاو لە ئاگرەکەو خەڵکانی دەوری ئاگرەکە نزیك بووەوە، یەکێك لە ئامادەبووانی مەجلیسەکە پرسی:

"کوڕۆ، تۆ کێی؟"

کوڕیژگە بەوپەڕی ویقارو متمانەوەو بێئەوەی بپەشۆکێ گوتی:

"من ئیدوارد تودور، پاشای ئینگلیستانم!"

دزو جەردەکان لە قاقای پێکەنینیان دا. ئەلهەقی دیمەنێکی کۆمیدی بوو. شازادە کە زۆر لە پێکەنین‌و تەوس‌و توانجەکانیان ڕەنجا بوو، بە دەنگێکی وشك‌و توڕە گوتی:

"دەربەدەرانی نەگبەت! یانی بەم شێوەیە سوپاسی ئەو لوتفو مەرحەمەتە دەکەن کە من پێم ڕەوا دیتوون؟"

شازادە کۆمەڵە قسەیەکی دیکەشی کرد، لێ لە نێو جەنجاڵو دەمڕێژی پێکەنینی تازەدا کە لە هەموو لایەکەوە بەرز بووەوە، ون بوونو کەس گوێی لێ نەبوون. جۆن هوبس چەندین جار ویستی شتێك بڵێ لێ نەیتوانی. ئەنجام دوای ئەوەی بێدەنگی، یانی نیمچە بێدەنگی یەك بەرقەرار بوو، کابرای دڵڕەق گوتی:

"هاوڕێیان ئەم کوڕە منداڵی منە لێ شێت بووە. ئێوە گوێتان لە قسەی ئەو نەبێ. نەگبەتە خۆی بە پاشای ئینگلیستان دەزانێ!".

ئیدوارد تودور ناڕەزایی دەربڕیو گوتی:

"نا، من هەر خۆم بە پاشای ئینگلیستان نازانم، بەڵکو خودی پاشام. کەسێ نەمرێ بەو زووانە ئەم ڕاستییە بۆ ئێوەش دەردەکەوێ. بەڵام زۆرتان لەسەر دەکەوێ، چونکە دەستور دەدەم کە لەسەر ئەو تاوانەی کە کردووتانەو بە ئاشکرا دانتان پێدا ناوە لە سێدارەتان بدەن".

جۆن هوبس لە جێی خۆی هەستاو گوتی:

"چۆن؟ یانی تۆ زات دەکەی خەبەر لە من بدەی! نەگبەت! بوەستە! بە زاتی خوا ئەگەر دەستم بتگاتێ تۆ..."

ماتامورش لە جێی خۆی هەستاو مستێکی هێندە توندی بە سینگی جۆن هوبس دا کێشا، توری دایە گۆشەیەکەوە. ئەوجا بەوپەڕی توڕەیی گوتی:

"بوەستە، قوڕ بەسەر! تۆ چ بنیادەمێکی؟ نە ڕێزو حورمەتی پاشا دەگریتو نە هی من؟ بە زاتی خودا ئەگەر جارێکی دی لە حوزوری مندا هەر نابەجاییەك بکەی، من خۆم لە سێدارەت دەدەم."

ئەوجا رووی کردە منداڵەکەو گوتی:

"کوڕۆ، تۆش چیتر هەڕەشە لە هاوڕێکانت مەکە، ئەوەی لێرە گوێت لێ بوو لە شوێنێکی دیکە مەیگێڕەوە. ئێستا کە حەزدەکەی پاشا بیت پاشا بە، لێ ئەگەر دەتەوێ بە خیانەت تۆمەتبارت نەکەن، لە دەرێ ئەم قسانە بە کەس مەڵێ. ڕەنگە ئێمە هەموومان دزو جەردەو ڕێگرببینو لەگینە زەرەرمان بۆ کەسیش نەبێت، لێ بە هەرحاڵ سەبارەت بە وەلینیعمەتو پاشای خۆمان وەفادارین. جا گوێش بگرە بزانە چ دەڵێم!".

ماتامور رووی کردە دزو هاوڕێکانیو گوتی:

"کوڕینە، دەی هەموو پێکەوە با بە سەلامەتی ئیدوارد پاشای ئینگلیستان پێك هەڵدەین! بژی ئیدوارد پاشای ئینگلیستان.

جەردەو ڕێگرەکان تێکڕا دەنگیان لێ هەڵبڕیو گوتیان:

"بژی ئیدوارد پاشای ئینگلیستان!"

شازادە کە لە خۆشیو کەیفان رووی گەشابووەوە، بزەیەکی کرد، سەری ڕێزو حورمەتی بە ئاستەم بۆ لەقاندنو زۆر بە جدیو ڕاشکاوی گوتی:

"سوپاس بۆ ئێوەی دلێرو بە غیرەت!"

دەمڕێـژێکی سـامناکی پێکـەنینی تـازە میچـی عەمارەکـەی هێنایـە لـەرزە، کـە جـارێکی دی بێدەنگی و کڕی بەرقەرار بووەوە ماتاموڕ بە شێوەیەکی جدی، بەڵام پڕ لوتف و میهرئـامێز دەگـەڵ شازادەدا کەوتە قسەو گوتی:

"کوڕەکە گیان سەرسەختی مەکە! ئەم قسەیەی تۆ دەیکـەی هـەم مایـەی پێکەنینـەو هـەم خەتـەرە. ئەگەر هەر سووری لەسەر ئەمەی کە لەقەب و عینوانێك بە خۆتـەوە بنـەی نـاوو عینـوانێکی دیکە هەڵبژێرە!".

کابرای مسگەر هاواریکردو گوتی:

"کوڕینـە، وەرن نـاوی بنـەین، بـالولی، یەکـەم سـوڵتانی گـەوجان!" زۆربـەی دزەکـان، بـە قروسـکە قروسك گوتیان: "بژی بـالولی یەکـەم، سـوڵتانی گـەوجان!" هەنـدێکی دیکەشـیان بـە میـاوە میـاو، یـانی بەلاسـایی کردنـەوەی دەنگـی پشـیلە ئـەو دروشمـەیان دووبـارە کـردەوە. هەنـدێکی دی بـە شێوەی کسۆکان کەوتنە وەڕین. چەند نەفەرێکی دیکـەش لەبـەر پێکـەنین خۆیـان پـێ نـەگیراو بـە پشتا کەوتن. لەم کاتەدا هەر پێشنیاز بوو و لەسەر پێشنیاز دەکرا، ئامادەبووان دەیانگوت:

"با تاجی لەسەر بنەین!"

"سەوڵەجانی بدەینە دەست!"

"لەسەر تەخت دای بنەین!"

دوای تۆزێك جماعەتی دزان بە کەیفی دڵی خۆیان کەوتنە ئارایشتی ئیدوارد تـودوری بەلـەنگاز. یانی لە جیاتی تاج جامولکەیەکی تەنەکەیان لەسەرنا، لە جیاتی شـانێل پارچـە لێفەیـەکی دڕاوی کۆنیان بە شانیاداو لە بری سەوڵەجان، پارچە دارێکیان، کە کابرای مزگـەر لـە کـاری لـەحیمکاری و جۆشـکاریدا بـەکاری دێنـا، دایـە دەسـتی راسـتی و لەسـەر بەرمیلـە کـۆنێکی سـکراب دایـان نـا. هـەموو دزەکـان لەبـەردەمیا هاتنـە سـەر چـۆك و لـە حاڵێکـا کـە بەسـەری قـۆڵی دڕاوو بەرکۆشـە پیسەکانیان رۆندکی درۆینـەیان لـە چاوی خۆ دەسڕی، بە دەنگێکی پێکـەنیناوی و تەشـەرئامێز کەوتنە لالانەوەو پاڕانەوەو دەیانگوت:

"ئەی پاشای دلۆڤان، لە لوتف و مەرحەمەتی خۆتمان مەحرووم مەکە!"

"ئـەی سـوڵتانی نـەجیب و دادپـەروەر، ئێمـەی کەسـاس و زەبـوون لـە ژێـر دەسـت و پێـی خۆتـا مەپلیشێنەوە!"

"ئەی شازادەی دلۆڤان و دڵسۆز، رەحم بە غوڵامانی خۆتا بکە!"

"ئەی هەتاوی دەوڵەت، بە تیشکی گیانبەخشی خۆت گەرممان بکەوە!"

"لـە دەورت گـەڕێین، خـاکی بـەرپێیانت موبـارەك بکـە تـا ئێمـە بتـوانین لێـی بخـۆین و بـەوە قـەدرو پایەی خۆ زیاد بکەین!"

"لوتف بفەرموو، سەرو تفمان بە چارەدا بکە تا نەوەکانی دوای خۆمان بۆ هەمیشە بەو کەرەمـەوە بنازن!"

ئەنجام کابرای مزگەر گرەوی قەشمەربازیەکەی بردەوە، چونکە ئـەو مێردەکـە بێشـەرم و حەیایـە پێـی شـازادەی گـرت و بـۆ دەمـی بـرد تـا ماچـی بکـات، لـێ ئیـدوارد تـودور نـەیکردە نامـەردی،

بەوپـــەڕی تـــوڕەیی شـــەقێکی بـــە سەروچـــاویا کێشـــا، کـــابرای مزگـــەر هەســـتایەوەو روویکـــردە هاوڕێکانی و گوتی:

"هاوڕێیان، تکایە پارچە پەڕۆکێکم بدەنێ تا جێ شەقەکەی پاشای پێ بشارمەوە. ئەو سوچەی دەموچاوم کە پەنجە کەڵەی پێی پاشای پێکەوتووە، لە ئێستا بە دواوە موبارەکەو بە موفەرك دەچێت. دەچم بۆ بازاڕان و گەڕەك و بانان و بۆ سەری چوار ریانەکان و هەر رێڤینگ و رێبوارێك بدینم، پیشانی دەدەم و سەد شلینگی لێ دەستێنم و بەمجۆرە سەروەت و داراییەکی مۆڵ پەیدا دەکەم!"

بەڵێ کابرای مزگەر هێندەی لۆتیایتی و قەشمەربازی کرد کە هاوڕێکانی نەك هەر ستایش و ئافەرینیان کرد، بەڵکو بەغیلیشیان پێبرد.

لێ شای لاو کە زۆر توڕە بوو بوو، لە داخا روندك لە چاوانیا قەتیس مابوو و دەدرەوشایەوە، بە کەسەرێکی زۆرەوە لە دڵی خۆیدا دەیگوت:

"ئەگەر من دەگەڵ ئەم نامەردانەدا خراپەشم بکردایە، لەمە خراپتریان دەگەڵ نەدەکردم. خۆ من لای خۆی چاکەم دەگەڵ کردن، و جگە لە خێری ئەوان هیچی ترم نەویست! ئەمە بوو پاداشتی چاکەکەم!"

((١٨))

## لەگەڵ گەدایان دا

سارەزی، دەگەڵ شیرەی شەبەقدا، ماتامۆرو هاوڕێکانی کەوتنە رێ، ئاسمان مۆن و هەورو هەڵا، وعاردی قوڕو دنیا سارد بوو. وا دەهاتە بەرچاو کە گەلی دزان زەوق و کەیف و شادییەکەی دوێنێیان لە دەست داوە. جماعەتێکیان کڕوکپ و گرژو عەبوس بوون، هەندێکی تریان خەریکی چەنەبازی بوون و لەوە بوو بە بچووکترین شت دەهری بن. هەر هەموویان تینو بوون.

ماتامۆر ئەمری بە جۆن هوبس کرد کە لە کوڕەکەی نزیك نەکەوێتەوە. ئەوسا کوڕێژگەی تاینی بە هۆگۆ سپاردو ئامۆژگاری کرد کە تا دەتوانێ دەگەڵیا دلۆڤان و نەرم و بە بەزەیی بێت.

زۆری پێ نەچوو کە تەشقی سەرما دایە کزی و گەواڵە هەوران ڕەوینەوە. دزەکان کە بەرە بەرە روویان گەشا بووەوە، دەگەڵ یەکدیدا کەوتنە حەنەك و سوعبەتان، تەشقەڵەو تەڵفیزیان بەو رێبوارانە دەکرد کە لە ڕێگەدا تووشیان دەبوون. سەروسیماو بیچمیان هێندە ناشیرین و ترسناك بوو کەس زاتی نەدەکرد وەڵامیان بداتەوە. ئەم دزانە کە بە گوندەکاندا تێدەپەڕین بە بەرچاوی جووتیارەکانەوە دەستیان دەبردو ئەو جل و پەڵاسانەیان، کە بەسەر پەرژینەکانەوە هەڵخرا بوون، هەڵدەگرت و دەیانبردن. جووتیاران نەك هەر دەنگیان نەدەکردو نارەزاییان دەرنەدەبڕی، بەڵکو مەمنوون بوون کە پەرژینەکە هەڵناکەنن و نایبەن.

ئەنجام گەییشتنە مەزرایەکی چکۆلەو لەوێندەر لایاندا. خاوەن مەزراکەو وەرزێرو ماڵ و منداڵەکەی هەرچیەکیان هەبوو لەسەر رەفەو لە ناو دۆڵابیان داگرت و دەرهێنا تا سفرەو خوانێکی ئاواو ئاوەدان و رەنگینیان بۆ برازێننەوە. هەموو لەسەر سفرەی ئەو خێزانە دانیشتن، دوای

ئەوەی نانی بەیانیان خواردو تێر بوون، هەرچی سەوزەو ورتکەنانو ئێسقانە مریشكو شتی دی لەسەر سفرەکە مابووەوە، دایان بە سەرو کەللەی جوتیاری بەلەنگازو منداڵەکانیا. ئەنجام یەکێك لە کارەکەرەکانی خانەخوێیە بێچارەکەیان گرتو بە هەنجەتی ئەوەی کە بێ حورمەتیو بێ شەرمیەکانی ئەوانی پێ خۆش نەبووە، بە کەیفی دڵی خۆیان کەرەیان لەسەروچاوی هەڵسو. کە رۆییشتنش، تا توانیان جنێوی ساردو سووکیان بە خاوەن ماڵەکە داو هەڕەشەیان لێکرد کە ئەگەر لای مامورانو کاربەدەستانی ناوچەیی خەبەریان لێبدەن، دەگەڕێنەوەو ئاگر لە مەزراکەی بەردەدەن.

نزیکی نیوەڕۆ، دوای ئەوەی قۆناغە رێیەکیان بڕی بوو، لە نزیکی ئاواییەکی گەورەدا، لە پەرژینێکدا وەستان، لەوێندەر لایانداو بۆ ماوەی سەعاتێك پشوویان دا. ئەوسا هەستانو لێکدی جیابوونەوە، تا هەرکەسە لە قۆڵێکەوە بەناو گوند بکەوێو هونەری دزیو گەدایی خۆی بنوێنێ. شازادە، یان جۆن هوبس گوتەنی جاك، دەگەڵ هۆگۆدا رۆیی. شازادەو هۆگۆ، ماوەیەك بە کوچەو کۆڵانەکاندا وێڵو سەرگەردان سوڕانەوە. ئەنجام هۆگۆ دەستی بە قسەکردو گوتی:

"هیچ شتێکم نەدۆزییەوە کە بە کەڵکی دزین بێت. جا کە شتەکە وای لێهات وەرە با دەرۆزە بکەین."

شازادە گوتی:

"جا کە کاری تۆ دەرۆزە و گەداییە، بڕۆ بیکە، بەڵام لەم رووەوە بە تەمای من مەبە! من گەدا نیم."

هۆگۆ، لەسەر سامیا هاواری کرد، بەدەم مۆڕەوە بە شازادەی گوت:

"چۆن؟ تۆ ناتەوێ گەدایی بکەی؟ باشە بیرت لەوە کردووەتەوە چ وەڵامێکی هاوڕێیان بدەیتەوە؟"

"لە مەبەستت تێناگەم."

"تێناگەی؟ زۆر باشە، چما تۆ بە درێژایی تەمەن لە کوچەو کۆڵانەکانی لەندەن دا هەر گەداییت نەکردووە؟"

"من؟... وا دیارە زۆر کەری بۆیە ئەم پرسیارە لە من دەکەی!"

"خۆت کەری، هەتیو! بابت دەیگوت تۆ هەمیشە هەر گەداییت دەکرد، خۆ ناشێ بڵێی بابت پیاوێکی درۆزنە".

"ئەو پیاوە بابی من نیە. بەشەرێکی درۆزنە."

"باشە، باشە، واز لەم شێتبازییە بێنە، دەنا ئەگەر بە بابت بڵێم بە زندوویی پێستت دەگروێ. ئاقڵ بە بۆ خۆت کڕۆ! ئێستا کە ناتەوێ گەدایی بکەی، ئامادەی دەگەڵ مندا بێیو سەرێك بە کولانە مریشكو کەڵەشێرانی دێهاتیاندا بکەین؟ شایەت ڕاوێکمان دەست بکەوێ؟"

شازادە بە شێوەیەکی توندو تووڕە گوتی:

"وادیارە تۆ شێتی، دەنا زاتی ئەوەت نەدەکرد ئەم پێشنیازە قێزەونە بۆ من بکەی".

"عەجایەب! نە دەتەوێ گەدایی بکەیو نە گەرەکتە دزی بکەی!... ئەدی تەگبیر؟ باشە پێشنیازێکی دیکەت بۆ دەکەم. گوێ بگرە بزانە دەمانەوێ چی بکەین؟"

شازادە، زاری کردبووەوە و دەیویست ئیعتراز بگرێ، لێ هۆگۆ دەستی خستە سەر دەمی و گوتی: "

"بێدەنگ بە! تەمەشا، ئەوە کابرایەکی دێهاتیەو خەریکە بۆ ئێرە دێ. بە سیمایا لەوە دەچێ پیاوێکی باش بێت. من ئێستا خۆم بە عاردیدا دەدەمو ڤ لە خۆ دێنم. تۆش بە دیارمەوە دانیشەو گریەو زاری بکەو بڵێ: "ئای ئاغا، مەعز بۆ ڕەزای خوا، ئەم بەڵەنگازە برای منە نەخۆشە. ڕەحمێکمان پێدا بکە، ئێمە لەم دنیایەدا بێ کەسینو هیچ شتێکمان نیە، بیکە بە خاتری خوا تاقە (پنی)یەکمان بدەیە." کوڕۆ بیرت نەچێت، لە یەکبینە بگریو تا (پنی)یەك وەرنەگری مەیبڕەوە."

هۆگۆ، دوای ئەم پێشەکیە، دەمودەست و یەك تەختە لەسەر عاردەکە ڕاکشاو چاوانی خۆی ئەبڵەق کردن و وەکو یەکێك نەخۆشی فێی لەگەڵدا بێ، کەوتە لەقە فرتێ. کابرای دێهاتی نزیك بووەوە، بەسەر یارۆی نەخۆشدا دانەوییەوەو گوتی:

"داماوی بەدبەخت، بێگومان ئازارت زۆرە! با لەم سەرە ڕێگایە هەڵتگرم."

هۆگۆ هاواری کردو گوتی:

"ئەی ئاغا، مەعز بۆ ڕەزای خوا دەستم تێوە مەدە. من کە ئەم حاڵەم لێ دێت، دەستم لێ بدەی دەمردم. لەم برایەم کە لە نزیکی تۆوە وەستاوە بپرسە کە منی بەدبەخت چ ئازارێك دەکێشم! لە ڕای خودا (پنی)یەکمان بدەیە با بچین نانێك بۆ خۆ بگڕین".

کابرای دێهاتی دڵی پێی سووتاو گوتی:

"هەر یەك پنی؟ یەك پنی هیچ نیە، داماوی بەدبەخت! من ئامادەم بە دڵو بە گیان سێ (پنی)ت بدەمێ. ها بگرە، ئەمەش سێ پنی. من ئەم پارەیەم لە ڕای خودا پێ داوی."

ئەوسا رووی کردە ئیدوارد تودورو گوتی:

"کوڕۆ، تۆش وەرە یارمەتیم بدە، با برا داماوەکەت بگەیەنینە یەکێك لە ماڵە نزیکەکانی ئەم ناوە."

شازادە بەوپەڕی خۆێنساردیەوە گوتی:

"ئەمە برای من نیە."

"چۆن؟ برات نیە؟"

هۆگۆ، ناڵەیەکی کردو گوتی:

"دەتوخوا تەمەشا! ئەم هەتیوە براکەی خۆیشی بە برا نازانێ، تەمەشا چۆن حاشا لە برایەتی براکەی دەکات. ئەو برا داماوەی کە پێی بە لێواری قەبرەوەیە!"

کابرای دێهاتی سەرێکی لەقاندو بە ئیدوارد تودوری گوت:

"کوڕۆ شەرم لە خۆت بکە! ئەگەر ئەمە برات نیە ئەدی چیتە؟"

"ئەمە دزو دەرۆزەکەرە، شەیتانە بەم حیلەبازیە سێ پنی لە تۆ سەند، لێ لە هەوەڵەوە بە تەما بوو گیرفانت هەڵتەکێنێ. تۆ دەتەوێ موجیزاتێکی ڕاستەقینە بدینی؟ لە جیاتی ئەوەی هاوخەمی

دەگەڵ بکەی، بە دار بکەوە گیانیو ئیدی هەقت نەبێت، تۆ ناوی خودای لێ بێنەو لێی بدە، ئەوسا بزانە چی دەبێ؟"

هۆگۆ، چاوەڕوانی روودانی موجیزەکەی نەکرد. یەکسەر لە جێی خۆی هەستاو پێی وەغارێوەنا. کابرای دێهاتیش بەغار دوای کەوتو هاواری دەکرد:

"بیگرن خەڵکینە، ئەو دزە بگرن!"

شازادەش کە بیروخەیاڵی رەحەتو ئاسوودە بوو بوو، ئاهێکی ئۆخەی هەڵکێشاو بەرەو پاش پێی وەغارێوە نا. بەستەزمانە تا هێز لە لاقیا بوو غاری داو ئەنجام گەییە شوێنێك هەستی کرد خەتەری لەسەر لاچووە. کە پشووی داو نەفەسی تازە کردەوە، ملی رێگای گرتو بڕۆ، چەند سەعاتێك بەبێ وچان رێی کرد. بەلەنگازە جارجارێ ئاوڕێکی پاشەوەی دەدایەوە تا بزانێ ئایا تاقیبی دەکەن یان نا. ئەنجام کاتێ کە دڵنیا بوو کە هاوڕێکانی وازیان لە سۆراخو تاقیبی هێناوە، بە خۆیدا هاتەوەو هەستیکرد کە نەك هەر شەکەتو ماندوو بووە، بەڵکو لە برسا گیانی گەییوەتە کونەلووتی. شازادە خۆی بەناو حەساری مەزرایەکدا کرد، لێ هەرکە کابرای جووتیار چاوی بە جلو پەڵاسە کۆنو شڕەکانی کەوت، بەر لەوەی بێڵێ زار هەڵێنێ، زۆر بە زبریو توڕەیی دەری کرد.

ئەو منداڵە کەساسە دیسان ملی رێگەی گرت. زۆر پەستو بێتاقەت بوو، لێبڕا کە ئیتر کارێکی وەها نەکات کە ئەو جۆرە رەفتارە درزێوو نا شیرینەی دەگەڵ بکەن. لێ برسێتی زۆری بۆ هێنا، برسێتی هەموو شتێ بە پیاو دەکات، کاتی ئێوارە خۆی بە حەوشەی مەزرایەکی تردا کرد. ئەمجارەیان نەك هەر دەریان کرد، بەڵکو هەزار جنێوی سەر بە کوڵکەشیان دایێو هەڕەشەیان لێکرد کە ئەگەر نەڕوات رادەستی داروغای دەکەن.

شەوێکی ساردو تاریك داهات، شازادەی بەسەزمان زاتی ئەوەی نەبوو بوەستێو لەوسەر جاردەیە ئیسراحەتێ بکات، چونکە هەرکە بۆ ساتێك دەوەستا سەرما دەگەییە سەر مۆخی ئێسقانەکانی. داماوە لە کەشو هەوایەکی هێندە ساردو کوشندەدا رێی دەکرد کە تا ئەو رۆژە نەك هەر نەی بینی بوو بەڵکو تەسەوریشی نەکردبوو. جارجارێ وای خەیاڵ دەکرد لە گۆشەو کەنارانەوە دەنگێکی دەگاتە گوێو زوو لە بێدەنگیو کپی رەهای ئەو دەشتو بیابانەدا خامۆش دەبێتەوە. وای تەسەور دەکرد خاوەنانی ئەو دەنگە بەرەو لای ئەو دێنە پێشێو میناکی تاپۆو تارمایی بەلایدا تێدەپەڕنو لە تەمو مژو تاریکی شەودا ون دەبن. هەروەها وای بە خەیاڵدا دەهات کە لە دنیایەکی ترەوە، روناکییەکی کز دەبینێو رۆشناییەکی ئاڵۆز چاوشارکێی دەگەڵ دەکات. دەنگی حەپەو لورەی کسۆکانو هەوهەوی شوانانو دەنگی زەنگوڵەی ملی پەزانی لە دووری دوورەوە دەهاتنە گوێ. لێ دەنگەکان هێند کز بوون، هەر زوو ئاوا دەبوونو نەدەمان. ئەو منداڵە بەستەزمانە وای هەست دەکرد کە دەستی قەدەر، سایەی حیمایەتی لەسەر هەڵگرتووەو لە دنیایەکی بێ سنوورو بێ پایاندا، تەنیاو بێکەس بە دەقی خۆیەوە بەرەڵلای کردووە.

شازادە رێی دەکرد، لێ هێندە شەکەتو ماندو بوو بەدەم رێکردنەوە لەتری دەداو بە کەمترین دەنگ، یا. بچووکترین جوڵەی گەڵای وشکی درەختان رادەچڵەکیو دەڕەوییەوە. لە پڕ لە

مەودایـەکی زۆر نزیکـەوە چـاوی بـە فانۆسـێکی هەڵگیرسـاو کـەوت کـە لەبـەر دەرکـەی عـەمارێك هەڵواسرابوو. داماوە گوێی هەڵخست. بێدەنگییەکی رەها باڵی بەسەر ناوەوەی عەمارەکەدا کێشا بوو، یەکسەر لێبڕا خۆی بە باوەشی گەرمی عەمارەکەدا بکات، لێ لـەو ساتەدا کـە خـەریك بـوو لـە ئاستانەی دەرکەکـەوە پـێ بنێتـە ژوورەوە، لـە قوڵی جادەکـەوە چـەند دەنگێکی بـەر گـوێ کـەوت. بەرمیلێك لە گۆشـەیەکی عەمارەکـەدا کـەوتبوو، و شـازادە یەکسـەر خـۆی دایـە پـەنای بەرمیلەکـەو لەوێنـدەر خـۆی مـەڵاس دا. دوو کرێکـاری مەزراکـە کـە یـەکێکیان فانۆسـەکەی بـە دەسـتەوە بـوو خۆیان وە عەمارەکەدا کرد. لە ماوەی ئەم چەند دەقیقەیـەدا شـازادە دەستەوستان دانەنیشـتبوو، چونکە ئەو داماوە ژێراو ژێر تەمەشای هەموو شوێنێکی دەکرد. لە پڕ لـە کۆتـایی ئەشـکەوتەکەدا چاوی بە ئاخورێك کەوت، دەوروبەری ئاخورەکە یەکپارچە تەختەی ئەستورو گەورە بوو، و چەند جلە ئەسپێکیانش لە پاڵیا هەڵچنی بوو. شـازادە بڕیـاری دا ئـەو شـەوە ئـەو جلانـە بـە کـار بێنێ و ئەگەر بۆ تاقە شەوێکیش بووە جلە ئەسپ بخاتە خزمەتی تەخت و تاجی ئینگلیستانەوە.

زۆری نەبرد کە کرێکارەکان لە کارەکەیان بوونەوە. فانۆسەکەیان دەگەڵ خۆدا بردو رۆییشتن و، دەرگاکەشـیان لـە دوای خـۆوە داخسـت. شـازادە بـە پەلـە، لـە تاریکیەکـەدا جلـە ئەسـپەکانی هەڵگرت و خۆی بە نێو ئاخوڕەکەدا کرد. ئەگەرچی جلـە ئەسپەکان تـەنك و کۆنـە بـوون، و بۆنیـان زۆر ناخۆش بوو، و کەپوی شازادەی ئازار دەدا، لـێ چـارە نـەبوو، و ئـەو دامـاوە دەربـەدەرە بیری لای برسـیەتیە بـێ ئامانەکـەی خـۆی نـەما بـوو، پێخـەفێکی تـا رادەیـەك گـەرم و رەحـەتی لـێ دروستکردن و چاوی نایە سەر یەك. شازادە خەریك بوو خەوی لێ بکەوێ، لە پڕ هەسـتی کـرد لـە تاریکییەکەدا شـتێکی بـەر دەموچاو کـەوت. بەسـتەزمانە لـە تـرس و سەرسـامیدا چـاوی کـردەوە. دڵی هێند بە توندی لێی دەدا خەریك بوو لە سینەی بێتە دەرێ.

ماوەیەك خۆی مت کردو هەستی راگرت، جگە لە تاریکی و بێدەنگی هیچ شتێکی لە دەوروبـەری خـۆی نـە بینی و نـە هەسـت پێکرد. ناچار جارێکی دی چاوی لێکنـان، لـێ هەمـدیس شـتێك بـەر بـەدەنی کـەوت. شـازادی بەلـەنگاز هێنـدە ترسـا کـە هەسـتی کـرد قـژی سـەری رەپ راوەسـتاوە. خودایا! ئەمە چ بوو؟ ئەو پەناهەندە کلۆڵە دەبوا چ بکات؟ ئایا دەبوایە هەستێ و بڕەڤێ؟ بۆ کوێ بڕەڤێ؟ چما دەیتوانی هەڵێ؟ ئەدی دەرگاکەیان لەسەری دانەخستبوو؟"

شازادە لە دنیای خەیاڵدا وای هەست دەکرد کە بە نێو چوار دیـواری عەمارەکـەدا هەڵدێت. لـێ شتێکی نادیار یان تاپۆیەکی ترسناك دووی دەکەوێ و خۆی بە شان و باڵ و دەموچاویدا دەدات. خودایا؟ یانی ئەو کلۆڵە دەبوایە بە درێژایی شـەو گیرۆدەی ئـەو کابوس و مۆتەکە ترسناك و ئـەو عەزابە ناخۆشە بێت؟ بەستەزمانە لەو دنیای تـرس و نیگەرانیـەدا کەوتـە بیری چارەیەك و بەخۆی گوت:

"تاقە چاری من ئەوەیە کە ئەمجارە دەست درێژ بکەم و بزانم ئـەم بوونـەوەرە نادیـارە چیە کـە ئـەم عەزابەی من دەدا!"

لێ ئەم کارە هەر بە دەم ئاسان بوو، شازادە سێ جار دەسـتی لـە تاریکییەکـەدا بـەرزکردەوە، لـێ هەر سێ جارەکە بە پەلە دەستی داگرتەوە. هەڵبەتە ئەم کارەی لەبەر ئـەوە نـەبوو کـە دەسـتی بـەر

شتێك كەوتبوو، بەڵكو لە ترسی ئەوە بوو نەبادا بەر شتێك بكەوێ. جاری چوارەم دەستی کەمێك بەرزتر کردەوەو قامکەکانی بەر شتێکی نەرمو گەرم کەوت. بەستەزمانە دیسان هەستی کرد کە قژی سەری لە ترسا گرژ بوو، و سوێندی خوارد کە چیتر دەست بەرز نەکاتەوە.

شازادە لەم سوێندو بڕیارەیدا، حیسابی بۆ دنیای بە هێزی هەستی لاپرەسەنیو کونجکاوی بەشەری نەکردبوو، بۆیە بۆ جاری پێنجەم بە ترسو لەرزەوە دەستی بەرز کردەوە. قامکەکانی چوون بە تۆپەڵێك کوتو کۆڵکەی نەرمداو دەستی بەر پەتێکی جوڵەدار کەوت کە دوای کەمێك ورد بوونەوە دەرکەوت تومەز کلکی گوێرەکەیەکە.

شازادە خەریك بوو لە قاقای پێکەنین بدات! بەلەنگازە چەندی ئاوات خواستبوو کە هاوڕێو هاودەمێك پەیدا بکات. چەند رۆژێك بوو کە هاوڕەگەزانی ئەو هێندەیان پەستو بێزارو بێتاقەت کردبوو، کە بوونی ئەو حەیوانە نەجیبەی بەلاوە نیعمەتێکی گەورەو مایەی متمانەو دڵگەرمی بوو.

شازادە بۆ چەند ساتێك بە دەست کەوتە نەوازشتی پشتی نەرمو ساقی گوێرەکەکە، ئەوسا لە پڕ بیرێکی بە مێشکا هاتو بە هەوای ئەو بیرەوە لە جێی خۆی هەستا. یەکەمجار شوێنی نووستنەکەی گۆڕی، ئەوسا پشتی دا بە لاقەبرغەی گوێرەکەکەوەو جلە ئەسپەکەی دا بەسەر خۆیو هاوڕێ تازەکەیدا. دوای تۆزێك شازادە هەستی بە گەرمییەکی هێندە خۆشو نەجاتبەخش کرد لە تۆ وایە لە نێو نوێنو لێفەی ئەتڵەس و لەسەر سەرینی پەڕی قوی کۆشکی (وست مینیستر)دا خەوتووە.

جارێکی دیکە، هزرو بیرێن پڕ نەخشو نیگار بەمێشکی دا کەوتنە جەوەلانو ژیانیان لەبەر چاوی شیرینو خۆش کرد. هەستی دەکرد کە لەو زنجیرە قورسو گرانەی کە دزەکان لە پێیان کردبوو ئازاد بووەو هەنووکە شادو بەختیارە.

ئەو شەوە بایەکی هێندە ساردو توندی دەهات کە میچو بناغەی دیوارەکانی ئەو کۆنە عەمارەی هێنابووە لەرزە. هەندێجاریش بایەکە هەندێك هێور دەبووەوەو زیاتر لە ناڵەیەکی دوورو درێژو نادیار دەچوو. لێ شازادە ئیدی ترسی شکاو بە خۆی دەگوت:

"زۆر باشە کە من لەم جێگا ئیسراحەتەدا خەوتووم! جا بایەکە با هەر بۆ خۆی بوەزێو بناڵێو بلورێنێ. من لە پەنادامو جێگاکەم گەرمە. لەمە زیاتر چیم دەویست؟"

ئەنجام شازادە، خەوێکی خۆشو قورسی لێکەوت کە یەکپارچە خەونو خەیاڵ بوو. لە دەرەوە، کسۆکانی مەزراکە دەحەپینو دەیان لوراندو ،چوارپێیان دەیان بۆڕاندو بارانێکی توند بەسەر سەربانی عەمارەکەدا دایدەکردو قامچی ئاسا خۆی پێدا دەکێشا. لێ پاشای تازەی ئینگلیستان خۆی قانگڵە کردبوو و خەوتبوو. گوێرەکە بەستەزمانەکەیش خەوی لێکەوتبوو. ئەو حەیوانە پاكو بێگوناحە نە باکی بە باو زریان بوو، نە لە بیری ئەم شانازیە گەورەیەدا بوو کە شەوێکی لە نێو یەك جێگەدا دەگەڵ پاشای ئینگلیستان دا رۆژ کردووەتەوە.

((١٩))

## ئیدوارد له ماڵه گوندی دا

كه شازادەی بچووك، بەیانی زوو له خەو هەستا بینی مشكێكی زیرەك و زیتەڵ لەسەر سینگی خەوتووه، شازاده نیگایەكی مشكەكەی كرد، كه بینی خۆی ئاماده كردووه كه هەڵێت له بن لێوانەوه گوتی:

"گەوجە، بۆچی دەترسیت؟ منیش وەكو تۆ بێچارەو داماوم، بەڕاستی شەرمه بۆ من ئەگەر بمەوێ ئەزیەتت بدەم. من دەبێ بەم دیدارەی تۆ شادو مەمنون بم، ڕۆژگاری پاشایەك بگات بەو ڕۆژەی مشكان لەسەر سینەی بخەون، مانای وایه لەوپەڕی بەدبەختی و ڕۆژە ڕەشیدایه، و دەبێ به مەمنونییەوه چاوەڕوانی ئەوه بێ كه جارجارێ بەختی خەواڵۆ، له خەوی قورس هەستێ و به ڕوویەوه پێ بكەنێ.

شازاده له جێی خۆی هەستاو،له ئاخوڕی ئەسپەكه هاتەدەرێ. گوێی له دەنگی چەند مناڵێك بوو، ئەوسا دەرگاكه كرایەوه، دوو كچۆڵه وەژووركەوتن.

كچۆڵەكان كه چاویان به ئیدوارد تودور كەوت نەك هەر دەستبەرداری قسەو پێكەنین بوون، بەڵكو ڕەق ڕاوەستان و به كونجكاوی و سەرسامیەكی فرەوه لەسەراپای كوڕەیان هەڵڕوانی. دوای تۆزێك، به ئەسپایی شتێكیان به یەكدی گوت و چەند شەقاوێك لێی چوونه پێشەوه. یەكێكیان به دەنگی بەرز گوتی:

"چەند سەروسیمایەكی جوان و دڵگیری هەیە!"

ئەویتریان گوتی:

"قژی چەند جوان و ناسكه."

یەكەمیان دیسان گوتی: "لێ جلەكانی زۆر شڕو خراپە!"

"بەستەزمانە، لەوە دەچێ زۆری برسی بێت!"

هەردووكیان به شەرم و ترسەوه، وەكو یەكێك چۆن ڕووبەڕووی حەیوانێكی ترسناك و دەبێتەوەو دەترسێت كه نەبادا حەیوانەكه پەلاماری بدات، بەو ئاوایە به دەوریا سوڕانەوه، چاویان لێ نەدەگواستەوەو به وردی له هەموو لایەكەوه لێیان دەڕوانی، ئەنجام بۆ ئەوەی نەترسن و زات وەبەر خۆبنەن دەستی یەكتریان گرت و چوون له بەردەمیدا وەستان. یەكێكیان كه به دەم و زمانتر بوو پرسی:

"كوڕۆ، تۆ كێی؟"

ئیدوارد تودور به دەنگێكی جدی و ئاشكراو گوتی:

"من پاشام."

هەردووكیان ڕاچڵەكین و چاویان لەسەرسامیدا ئەبڵەق بوو، بۆ چەند ساتێك مات و بێدەنگ له جێی خۆیان وشك بوون، ئەوسا، هەردووكیان به یەك دەنگ گوتیان:

"پاشا؟ كام پاشا؟"

"پاشای ئینگلیستان".

هەردوو سەرسام‌و حایر روانیانە یەکدی، ئەوسا روانیانە ئیدواردو دیسان چاویان ئەبڵەق بوو. یەکێکیان گوتی:

"خۆ گوێت لێ بوو مارجری، گوێت لێ بوو چی گوت: دەڵێ من پاشام. باشە تۆ باوەڕ بەم قسەیە دەکەی، تۆ بڵێی راست بکات؟"

مارجری گوتی:

"ئەی مانای چی پریسی، ئەگەر وانە بێ چۆن دەوێرێ درۆیەکی ئەوەندە گەورە بکات؟"

مارجری کەمێك لەفکران ڕاچوو، ئەوجا روویکردە ئیدواردو گوتی:

"تۆ ئەگەر بەڕاستی پاشا بیت، باوەڕ بە قسەکەت دەکەم."

"بەڵێ، من بەڕاستی پاشام."

بەوە شتەکە بڕایەوە، کچۆڵەکان بێ ئەوەی هیچ گومانێکیان لە قسەکانی شازادە بمێنێ، بە پرسیاران دایانگرتەوە، بۆ نموونە لێیان پرسی چۆن رێی کەوتووەتە ئەم عەمارە؟ بۆچی جلەکانی ئەوەندە شڕن؟ لە کوێوە هاتووەو کێوە دەڕوات؟.

ئیدوارد بێئەوەی هیچ شتێکیان لێ وەشێرێ، وەڵامی پرسیارەکانی دانەوە. داماوە هەستی دەکرد زۆری پێویست بەوەیە دەردی دڵی خۆی بۆ یەکێك هەڵڕێژێ‌و چونکە تا ئێستا هەر جارێ ویستبووی هاوڕازو هاودەمێ بۆ خۆی بدۆزێتەوە، جگە لە جنێوو کوتەك‌و ئازارو تەوس‌و توانج هیچ شتێکی دیکەی لە خەڵکی نەدی بوو، بەسەر هاتی خۆی لە نوکەوە تا کۆتایی بۆ کچۆڵەکان گێڕایەوە. هەردووکیان بەوپەڕی تاسەو نیگەرانیەوە گوێیان بۆ بەسەرهاتەکەی گرتبوو، لێ کە زانیان ئەو بەلەنگازە سەرگەردانە دەمێکە زادی نەچووەتە سەر زار، قسەکەیان پێ بڕی‌و بۆ مەزارەکەیان برد. ئیدوارد بەوپەڕی خۆشی‌و شادی لە دوویانەوە دەڕۆیی‌و لە دڵی خۆیدا دەیگوت:

"کە بۆ کۆشك‌و دەربار گەڕامەوە ئەم جووتە کچۆڵە دلۆڤان‌و خشکۆکە لە دیاری‌و جلك‌و بەرگان دا غەرق دەکەم. من هەرگیز ئەمە لە بیر ناکەم کە ئەم کچۆڵانە وەختێ باوەڕیان بە من کرد کە هەموو دنیا بەریشم پێدەکەنین‌و گاڵتەیان پێدەکردم‌و لە خۆیان دوور دەخستمەوە، کاتێ متمانەیان بە من کردو دانیان بە مندا نا کە گەورەکان لەوان گێژ ترو گەوجتر بوون‌و بە بابایەکی درۆزنیان دەزانیم!"

ژنە گوندییەکە، بە میهرەبانی‌و سۆزو بەزەییەوە پێشوازی پاشای چکۆلەی کردو بۆ نەگبەتی‌و پەریشانی‌و شێتی میوانە چکۆڵەکەیان خەمبار بوو. ژنەی تاین چونکە بێوەژن‌و هەژار بووو دژواری‌و رۆژە ڕەشی زۆری دیتبوو، و ئەوەندەی بەسەر هاتبوو کە لە هەنبەر نەگبەتی‌و چارەڕەشی خەڵکانی دیکەدا خوێنساردو بێ موبالات بوو. بەلەنگازە لە دڵی خۆیدا دەیگوت:

"بێگومان ئەم کوڕە شێتەو لە دەست پاسەوانەکانی هەڵاتووە، گرینگ ئەوەیە بزانم لە کوێ هەڵاتووەو کارێك بکەم کە بە ساغ‌و سەلامەتی بۆ ئەوێندەری بگەڕێنمەوە". ژنە بەو خەیاڵە چەند پرسیارێکی لەئیدوارد تودور کردو لە وەزع‌و حاڵی شارو ئاوەدانیەکانی دەوروبەری پرسی، لێ کوڕەی سەرگەردان لە وەڵامەکانیا ئەوەی تێگەیاند کە هیچ شتێك لەمەڕ ئەو دەڤەرەی کە ڕێی

خۆی تیا گوم کردووه، نازانێت. ئیدوارد بە لێزانیو شارەزایی کەسێك کە ماوەیەکی زۆری لە دەربارردا بەسەر بردبێت قسانی دەکردو تەنانەت چەند جارێکیش هاتە سەر باسی بابی، واتە پاشای رەحمەتی. وێڕای ئەمەش هەر جارێ باس دەهاتە سەر باسێن ئاسایی، ئیدوارد تۆدور نەیدەتوانی لە سەری بڕواتو بێدەنگ دەبوو.

ژنەی دلۆڤان زۆر حایر مابوو، لێ وێڕای ئەوەش دەستی لە پرسو جۆی خۆی هەڵنەگرتو بەدەم ئامادەکردنی فراڤینەوە، بەو ئومێدەی کە کوڕیژگەی تاین وادار بکات کە رازی دڵی خۆی بڵێت، چەند نەخشەو داوێکی کێشاو دانا، بەمجۆرە بەو خەیاڵەی کە کوڕە شوان بووە هەوەڵجار سەبارەت بەپەزو ماڵات پرسیاری لێکرد، لێ کوڕە نابەڵەدانە وەڵامی دایەوە. پاشان بەئەسپاییو لە بن لێوانەوە کەوتە ورتە ورت، ئەمجارەیان چەند پرسیارێکی دەربارەی چنینکاریو چنینکاران لێکرد. پاشان پرسیاری لەمەڕ پیشەو کارێن جیاوازو هەمەجۆر کرد. ئەوسا هاتە سەر باسی شێتخانەی بەدلامو زندانەکانی لەندەنو گەداخانەکانی شارو چونکە هیچی لەو رووانەوە هەڵنەکڕاند، لە دڵی خۆیدا گوتی: "با بزانم. رەنگە لە شوێنێکا خزمەکار بووبێت!" هەندێ پرسیاری لەو بارەیەوە لێکرد، لێ دەرکەوت کە کوڕیژگەی تاین لە کاری ماڵداریو پاكو خاوێنیو گسکدانو ئاگر خۆشکردنو ئەو شتانەدا زۆر دەست سپییە. لە پڕ خەیاڵێك کەوتە سەری ژنەو بە ئانقەست نێوی ئاشخانەی هێنا. ئەمجارەیان زۆری پێ سەیر بوو کە بینی رووی کوڕە گەشایەوەو خۆشیو شادییەکی نائاسایی کەوتە سەر سیمای، بۆیە خۆشحاڵ بوو و لە دڵی خۆیدا گوتی:

"ئەنجام خاڵێکی هەستیارم وروژاند. دەرکەوت چ کارەیە!"

لە راستیدا ئیدوارد بۆیە گەشابووەوە چونکە بۆنی خۆشی ئەو خواردنەی بەسەردا هاتبوو کە لە مەنجەڵو تاوەکەی پیرەژنەوە هەستا بوو، و ئیدی باسێکی تیرۆتەسەلی خۆراکی بەلەزەتو جۆرێن خۆراکی بەتامو گەوارای بۆ کرد. ژنەی تاین بەو خەیاڵەی کە مەزەندەکەی راست دەرچووە، لە دڵی خۆیدا خۆشحاڵ بوو بوو و بە خۆی دەگوت:

"زۆر باشە، دەی بۆم باس بکە، ئێستا زانیم کە تۆ چ کارەی، بێگەمان شاگرد ئاشچی بوویت!"

لێ دوای چەند ساتێك باسەکەیان گۆڕا، ئیدوارد هیچی لێ نەدەزانیو لە جێی خۆی چەقی،و ناچار بێدەنگ بوو و هیچی دەربارەی خواردن نەگوت. ژنە دیسان لە فکران ڕاچوو و بە خۆی گوت:

"یانی چی؟ بەڕاستی سەیرە! بۆچی ئەم کوڕە تەنیا ناوی ئەو خواردنانە دەزانێ کە لەسەر مێزو خوانی دەوڵەمەندانو ئەشرافان دەخورێ. ئەدی من بۆ ئەوەندە کەرم؟ یانی ناکرێ تەسەوری ئەوە بکرێت کە ئەم کوڕە بەر لەوەی لێی بقەومێو بکەوێتە دەربەدەری، لە ئاشخانەی دەربااردا کاری کردبێت؟ بە چ مەعلوم ئاشپەزی خودی شا نەبووە یان لەبەر دەستی ئاشچی تایبەتی شادا کاری نەکردووە؟ بوەستە، هەر ئێستا ئەمەی لێ دەردێنم!"

ئەوسا روویکردە کوڕیژگەکەو گوتی:

"تۆ ئاگات لە خواردنەکە بێ نە سووتێ، من هەر ئێستا دێمەوە."

ئەوجا بە گۆشەی چاو کیژەکانی حاڵی کرد کە دوای بکەون‌و لە ژوورەکە وەدەرکەون. کە لە ژوورەکە وەدەرکەوت بە خۆی گوت:

"بزانم ئایا دەتوانیٚ خواردنێکی بچووك ئامادە بکات؟"

ئیدوارد تودور هەرکە بە تەنیٚ لە ژوورەکە مایەوە لە بن لێوانەوە گوتی:

"رۆژیٚ لە رۆژان یەکێك لە پێشینانی من، لە پاشایانی ئینگلیستان بە نێوی ئالفریدی مەزن، ئەرکێکی وەکو ئەمەی منی دێتە ریٚ‌و هیچ لەبەری گران نابێت، بۆیە نابیٚ منیش ئەم بێگارەم لە شان گران بیٚ‌و لەدڵی بگرم. بە هەرحاڵ هیوادارم کە من لە ئالفریدی مەزن شایستەتر بم، چونکە ئەو خەمساردی کردبوو و کێکەکەی سووتاند بوو."

هەرچەندە ئیدوارد بە نیاز بوو، بەراستی ئاگای لە خواردنەکە بیٚ کە نەسووتیٚ، بەڵام کوریژگەی سەرگەردان میناکی ئەلفریدی مەزن لە خواردنەکەی غافڵ دەبیٚ‌و دەکەوێتە بیری کارەکانی رابردوو و داهاتووی خۆی‌و لە ئەنجامدا خواردنی نێو تاوەکە کەوتە سووتان. ژنەی خانەخویٚ زوو گەرایەوەو فریا کەت‌و خواردنەکەی لە سووتانی تەواوەتی رزگار کردو بە بۆڵە بۆڵ‌و تەشەران کورەی گێژو وێژی لە پرخەی خەوی خەیاڵی خۆشیدا دەرهێنا. پاشان کە بینی ئیدوارد لەم کارەی تەریق و خەمبارە، دڵی بە حاڵی سووتاو ئاراستەی باسەکەی گۆری‌و بە هەزار زەحمەت تێی گەیاند، کە ئەم پێشهاتە هیچ نیەو تەریق بوونەوەو خەمی ناویٚ.

ئیدوارد تودور، بەوپەری ئیشتیاوە خواردنێکی خۆش‌و بەلەزەتی خوارد. لێرەدا خاڵێکی گرینگ هەیە دەبیٚ ئامازەیەکی بکرێتیٚ، ئەویش ئەوەیە کە ئیدوارد تودورو ژنە گوندییەکە هەردووکیان لە کاتی نان خواردندا مەقام‌و پایەی خۆیان فەرامۆش کردو خۆیان لیٚ بە خاوەن نەکرد، واتا کە ژنەی تاین کە لە هەوەڵەوە دەیویست کوریژگەکە بەو حەساوەی بەرەڵلایەکی غەوارەیە، نەکات بە هاوسفرەی خۆیان‌و خواردنەکەی بۆ جیا بکاتەوەو لە سوچێکی ژوورەکەدا بۆی دابنیٚ کە بە تەنیا نان بخوات، لیٚ چونکە پێشتر لێی تورە بوو بوو، دڵی بە حاڵی سوتا بوو، و بۆ ئەوەی دڵی ئەو کلۆڵ‌و بەلەنگازە بداتەوە رێگەی دا وەکو هەر یەکێك لە خێزانەکەی خۆی بێتە سەر سفرەکەو دەگەڵ ئەواندا نان بخوات. ئیدوارد تودور–ش چونکە لەلایەکەوە شەرمەزارو منەتباری ئەو هەموو لوتف‌و چاکەیەی ئەم خێزانە بوو، و لەلایەکی ترەوە لەبەر ئەو خەمساردی‌و رەخاوەتەی لە ئەنجامدانی ئەو کارەی کە ژنەی تاین پێی سپارد بوو، کردبووی تەریق‌و خەمبار دەهاتە بەرچاوو حەزی دەکرد قەرەبووی ئەو خەمساردیەی خۆی بکاتەوە، لە دڵی خۆیدا گوتی:

"لە کاتی ئاسایی دا، ئەم ژنەو کیژەکانی دەبوایە لە پشت منەوە وەستابان‌و خزمەتیان کردبام، لیٚ هێندە باش‌و دلۆڤان‌و بەرێزو پر مەحەبەتن کە من شەرم دەکەم ئەو جۆرە حەقارەتەیان پیٚ رەوا بدینم. بۆیە باشتر وایە لەحوزوری مندا دانیشن‌و دەگەڵ مندا نان بخۆن."

دوای نان خواردن ژنەی جوتیاری خانەخویٚ روویکردە میوانەکەی و گوتی:

"بیٚ زەحمەت هەرە قاپەکان بشۆ!"

ئیدوارد تۆدور، له هەوەڵەوە بە تەما بوو کە پێشنیازی خانەخوێیەکەی ڕەت بکاتەوە، بەڵام کە سیٚو دووی خۆی کرد، لە دڵی خۆیدا گوتی:

"ئالفریدی مەزن چاودێری خۆراکی قەبوڵ کرد، هەڵبەتە ئەگەر پێشنیازی قاپ شۆریشیان بۆ بکردایە قەبوڵی دەکرد. خۆ من لەو زیاتر نیم. با هەستم بزانم دەتوانم قاپان بشۆم یان نا."

لەم کارەشدا سەرکەوتنێکی ئەوتۆی بە دەست نەهێنا، ئیدی شازادە بۆی دەرکەوت کە شۆردن و خاوێنکردنەوەی قاپ و کەوچکان نەك هەر کارێکی تاقەتبەرو ناخۆشە بەڵکو زۆریش زەحمەت و وردە. ئەنجام بەهەر جۆرێك بوو ئەم ئەرکەی ئەنجام دا، باش یا خراپ قاپەکانی شت و وشکی کردنەوە.

پاشان، داوای مەرەخس بوونی لە خانەخوێیەکەی کردو گوتی کە دەیەوێ بڕوات. خانەخوێ ڕێگەی نەدا کە میوانەکەی وا زوو بڕوات، و چەند خوردەکارێکی دیکەی پێ سپارد کە لە عۆیەی هەر هەموویان هات. ئەوسا ژنەی تاین ویستی کاری پاککردنی سێوە زستانەی پێ بسپێرێت، لێ شازادە بەرادەیەك لەم کارەدا ناشی و نەزان و دەست سپی بوو کە پیرەژن پێی گوت:

"ئەی بابە، ئەمە چیە، بڕۆ چەقۆکەت بەو بەردەی کە لەوێ کەوتووە تیژ بکە!"

کە لە کاری چەقۆ تیژکردن بووەوە، ژنەی دێهاتی بژارکردن و شیکردنەوەی خوری پێ سپارد. شازادە هەمدیس لەفکران ڕاچوو، لە دڵی خۆیدا گوتی:

"ئەم ژنە خەریکە شولی لێ هەڵدەکێشێت. من دڵنیام کە ئەگەر ئالفریدی مەزن لە جێی من بوایە ئەم هەموو کارەی قەبوڵ نەدەکرد. هەر ئێستا ئیستیقالەی خۆم دەدەم!"

ئەنجام ژنەی گوندی یەك زەمیلەی پڕ لە بێچوە پشیلەی دایە دەست و گوتی: "بڕۆ ئەمانە توڕ بدە دەریاوە!"

شازادە ئەم کارەشی بە نا بەدڵی و بە ناچاری قەبوڵ کرد لێ سوێندی خوارد کە ئەمە دوا کاری دەبێت. لەو کاتەدا کە شازادە زەمیلە بەدەست بەرەو دەریا دەڕۆیی چاوی بە جۆن کانتی کەوت وەکو چەرچیان کۆڵە بارێکی بە کۆڵیا دابوو و دەگەڵ هۆگۆی لاودا بەرەو مەزراکە دێن. شازادە زەمیلەکەی بە بێچوە پشیلەکانەوە لە نزیکی عەمارەکە داناو بە پەلەو سوکێ لەسەر نوکی پێ و بە پارێزەوە بە دەوری حەساری مەزراکەدا سوڕایەوەو لە باریکە جادەیەکی پشتی عەمارەکەوە پێی وەغارێوەناو قوچانی.

((٢٠))

## پاشا و ڕەبەن

ئیدوارد تودور، سەرەتا لە پشت پەرژینێکەوە خۆی مەڵاس دا، لێ زوو بەزوو لە ترسی جۆن کانتی، لەوێ هەڵبڕا، پێی وەغارەوە ناو تا بناری لێڕەوارێك نەوەستایەوە. لە دوورەوە دوو تاپۆی بینی کە لە حەساری مەزراکە وەدەرکەوتن، یەکسەر ناسینی، بۆیە ئەو بەلەنگازە دیسان دەستی بەغاردان کردەوە، تا لە تاریکی چڕە دارستانەکەدا ون نەبوو، نەوەستایەوە. کە تەواو دڵنیا بوو لە خەتەر خەلەسیوە، لەوێندەر وەستاو گوێی هەڵخست. هەرچوار نکالی کڕو کپ و بێدەنگ بوو.

هەندێجار وای هەست دەکرد کە لە دوورەوە دەنگ دێت، لێ دەنگەکان لە خامۆشی و بێدەنگی نامەفهوم ترو سامناکتر بوون.

شازادە هەوەڵجار لێبڕا تا شەوێ لەوێندەر وەمێنێ. هەرچەندە سەراپا لە ئارەقەدا هەڵکشابوو، بەڵام هەستیکرد هەوای دارستانەکە زۆر تەزیو ساردەو بۆ ئەوەی سەرمای نەبێت هیچ چارێکی نەبوو رێکردن نەبێ.

شازادە، بە نیازی ئەوەی بگاتە سەر شارێیەك، وەڕێکەوت، گەییە قوڵایی بێشەکە، جەنگەڵو دارستانەکە سات بە سات چڕترو گەورەتر دەهاتە بەرچاو، سەری هەڵبڕی بینی دنیا بەرەو تاریکی دەڕوات و هاکا شەوی بەسەردا هات. ئاخۆ ئەم کلۆڵە دەبوایە تا سپێدە لەم زیندانە سەیرو ترسناکەدا وەمێنێ؟ بەلەنگازە ئەمجارەیان گوڕی بەخۆدا کە پێ هەڵگرێو بگاتە شوێنێ، لێ چونکە دنیا تا رادەیەك تاریك بوو بوو، و چاو بەباشی رێگاکەی فەرق نەدەکرد،و زۆر جار پێی لە رەگو ریشەو کۆتەرەدارو بنەداری بڕاوە هەڵدەکەوت یان پنچە دڕوو بە لاق و لەتەریا دەچوو، بە زەحمەت رێگەی لەبەر دەڕۆیی.

ئەنجام لە دوورەوە تروسکەیەکی روناکی بەدی کرد، زۆری پێ خۆش بوو، و بەرەو تروسکەکە ملی رێی گرت، کە گەییە جێ، زۆر بە پارێزەوە لە تروسکەو روناکیەکە نزیك بووەوە، ئەم روناکیە لە پەنجەرەی بێ جامی کوختەیەکی بچووکەوە پرشنگی دەدا. لە نێو کوختەکەوە دەنگێك هاتە گوێی شازادە کە زۆری ترساند، بە جۆرێ ترسا لەزگ بوو پێ وەغارەوە بنێو هەڵێ، لێ بەسەر خۆیدا زاڵ بوو و وەستا، شازادە زوو بەزوو بۆی دەرکەوت کە ئەوە دەنگی کەسێکە خەریکی وێرد خوێندنو پاڕانەوەو دوعاو نزایە. شازادە چووە نزیکترەوە، لەسەر نووکی پێ خۆی بەرز کردەوەو لە پشت پەنجەرەکەوە نیگایەکی نێو کوختەکەی کرد.

کوختەیەکی زۆر تەنگو بچووك بوو، عەردەکەی بە قوڕ سواغ درابوو. خەوگایەکی حەسیرو یەك دوو لێفە لە سووچێکا دەبینرا. سەتڵێكو تەشتێكو پەرداخێکی ئاوخواردنەوەو مەنجەڵێكو چەند قاپێکی قوڵ لە نزیکی خەوگاکەوە دانرا بوون.. لە ناوەندی کوختەکەدا تەختێکی نزمو کورسیەکی سێ لاقیان دانا بوو، بڕە دارێکی هەڵاّیساو لە ئاورگەیەکدا بەرەو کوژانەوە دەچوو شتێك لە شێوەی میحراب لەبەر رۆشنایی مۆم دا دیار بوو. سەندوقێك لەبەر ئەم میحرابەدا هەبوو کە کتێبێکیان لەسەری دانا بوو، و لە کەناری کتێبەکەدا کاسە سەری مردوویەك دەبینرا. لە دوو هەنگاوی ئەو سەندوقەدا پیرەمێردێك ئەژنۆی دادا بوو. کابرای پیرەمێرد زلەیەکی داڵەگۆشتی رەقەڵە بوو. قژی سەریو مووی ردێنو سمێڵی میناکی بەفر سپی بوو. پۆستینێکی هاودامانی لەبەر بوو.

شازادە بەدیتنی خۆشحاڵ بوو، و لە دڵی خۆیدا گوتی:

"شوکور بۆ خوا کە ئەم پیاوە ڕەبەنە. تۆ بڵێی لەمە بەدوا بەخت بە پیرەمەوە بێ؟"

لەو کاتەدا کە پیرەمێرد هەڵدەستایەوە، ئیدوارد تودور بە درگاژەنەکە تەقەی لە دەرگا دا، دەنگێکی نووساوی گڕ لە ژوورەوە بەرز بووەوەو گوتی:

"وەرە ژووریٚ، لـیٚ هـەر کێیـەك هـەیت، گوناحـەکانت لـە دەرەوە بـەجیٚ بێڵـە، چـونکە عـەردی کوختەکەی من موبارەكو پیرۆزە!"

شازادە چووە ژوورەوە. کابرای ڕەبەن نیگایەکی پەشۆکاوی بەسەراپای دا گێڕاو پرسی:

"تۆ کێی؟"

ئیدوارد بەوپەڕی سادەیی گوتی:

"من پاشام."

کابرای رەبەن دەستی منداڵەکەی گرتو گوتی:

"تۆ پاشای؟ زۆر باشە، خێر هاتی!"

کابرای ڕەبەن (راهب) تەختەکەی هێنایە پێشیٚ، میوانەکەی لەلای ئاورگەکەوە دانیشاندو چەند بڕەدارێکی خستە ئاورگەکەوە، ئەوسا بە نێو کوختەکەدا کەوتە هاتوچۆ،و گوتی:

"بـەڵیٚ، خێرهـاتی. زۆر کـەس لـەم خەڵوەتخانەیـەی مـن گـەڕاونو نەیاندۆزیوەتـەوە. چـونکە شایستەی ئەوە نەبوون بگەنـە ئـەم شوێنە موبارەكو پیرۆزە. دەبیٚ سوڵتانیٚ پـیٚ بنێتـە ئێرە کە جلو بەرگی گەدایان لەبەر بکات، پاشایەك بیٚ گویٚ بە شانو شەوکەتو شکۆو جەلالو ماڵی ئەم دنیایە نەداتو تاجەکەی لە بیابانێکی پڕ لە گەزەنە فڕیٚ بدات، شازادەو میرێك بیٚ کە ئامادە بێت چلەکێشی بکاتو بە کەماڵی ئارەزووی تا کۆتایی تەمەن لەم خەڵوەتخانەیەدا بژی."

ئیدوارد تودور، دەمی هەڵێنا کە بەسەرهاتی خۆی بۆ کابرای خانەخویٚ بگێڕێتـەوە، لـیٚ کـابرای رەبـەن (راهـب) دەسـتی هـەڵبڕیو ئـەمری پێکـرد بـیٚ دەنـگ بێـتو بـە هـەمان نەفـەس درێـژەی بـە قسەکەی خۆی دا:

"تۆ لێرە هیچ مەترسیەکت لەسەر نابیٚ، لە ئەمنو ئەمانی تـەواودا دەبیت. هیچکەس نـاتوانیٚ بۆ ئێرە بێتو لەم پەناگایەت دەربێنیٚو بەرەو ئەو ژیانە پڕ لە حەماقەتو شێتایەتیەت بەرێتـەوە کە خواوەنـد بـە لوتـفو کـەرەمی خـۆی تـۆی لـیٚ رزگـار کـردووە. تـۆ لێـرەدا نوێـژ دەکـەی، وێـرد دەخوێنیو کتێبی مقەدەس فێر دەبی. لێرەدا تۆ لـە شـێتایەتیو وەهـمو خـەیاڵاتی خـەڵکی ئەم دنیـاو لـە عەزەمـەتو خۆشـیو پـاکی ئـەو دنیـا رادەمـێنیو قـووڵ دەبیتـەوە. خـواردنی تـۆ لـەم دێروپەرستەگەیەدا نانی وشكو ریشەی درەختانە. رۆژ بە رۆژ پتر دەگـەڵ رەوشـتی چلەکێشـی دا رادێیو روحـت پـاكو پاكـژ دەکەیـەوە. جلکـت پـەڵاس دەبێـتو جگـە لـە ئـاوی زولاڵ هیچـی تـر ناخۆیتەوە. هەنگیٚ شادو بەختەوەر دەبیت."

پیرەمێـرد، بـەدەم هاتوچـۆوە جـارێکی دی کەوتـە وێـردو سـەڵاوات. شـازادە ئەمـەی بـە دەرفـەت زانیو بەسـەرهاتی خـۆی لـە سـیری تـا پیـازی، بەوپـەڕی فەسـاحەتو جـوانی بـۆ گێڕایـەوە. لـیٚ کابرای رەبەن بێئەوەی گویٚ بە قسەکانی ئەو بدات، لەسەر وێردو سەڵاواتی خـۆی بـەردەوام بـوو. لەم کاتەدا، لەپڕ کابرای رەبەن وێردو نزاکەی خۆی بـڕیو لـە منداڵەکـە نزیـك بووەوەو بەتونـدیو گلەییەوە گوتی:

"بێدەنگ بە، من گەرەکمە سڕێکت بۆ کەشف بکەم!"

ئەوسا سەری هێنایە پێشێ و دەیویست بکەوێتە قسان کە دیسان راچڵەکی و لەسەر نووکی پێیان خۆی گەیاندە بنی پەنجەرەکەو نیگایەکی دەرەوەی کرد. ئەوجا بۆ لای ئیدوارد تودور گەڕایەوە، جارێکی دی سەری لێبردە پێشێ و بە ئەسپایی بە گوێیدا چپاند:

"من فریشتەی موقەڕەبم!"

شازادە داچڵەکی و لە دڵی خۆیدا گوتی:

"چاک گیرۆدە بووم! لە دەستی دز دەرباز بووم و کەوتمە دەستی شێت!"

لێ کابرای ڕەبەن هەر لەسەر قسەکەی بەردەوام بوو و دەیگوت:

"من ترس لە سیماتدا دەبینم، چونکە هەستت کردووە کە ئەم شوێنەی من شوێنێکی ئاسمانی و مەلەکوتییە. وەکو بە خۆت دەبینی، عومری من بە هاتوچۆ لە نێوان زەوی و ئاسماندا دەگوزەرێ. ئەوە پێنج ساڵە کە من بووم بە فریشتەی موقەڕەب. رۆژێك فریشتەکان لە ئاسمانەوە دابەزین و هاتنە کوختەکەی من و ئەم شوێنە تەنگ و تاریکەیان بە نوری خۆ روناك کردەوەو ئەو پلەوپایە تازەیەیان پێ راگەیاندم. ئەو فریشتانەی کە پەیامەکەیان هێنا بوو، تێکڕا کڕنوشیان بۆ هێنام و لە بەردەممدا هاتنە سەر چۆك، چونکە من لەوان گەورەترو پایە بەرزتر بووم. من چوومەتە باخی بەهەشت و بەگوێی خۆم گوێم لە قسەی پێغەمبەران بووە. وەرە دەستم بگرە، مەترسە وەرە پێشێ و دەستم بگرە، دەست لە دەستم بدە. ئەمە ئەو دەستەیە کە ئیبراهیم و ئیسحاق و یاقوب تەوقەیان دەگەڵ کردووە. جا گوێ بگرە! وەسفی پایەو مەقامی من هەر بەوەندە تەواو نابێ. من چوومە حوزوری خوداو رووبە ڕوو دیتم!"

کابرای ڕەبەن هەڵوەستەیەکی کرد تا قسەکانی کار لە شازادە بکەن، ئەوسا تۆنی قسەکەی گۆڕی و بە پشم و غەزەبەوە گوتی:

"بەڵێ، من فریشتەی موقەڕەبم، بەڵام دەبوایە ببمە پاپا. بیست ساڵێك لەمەوبەر خەوێکم بینی، بەپێی شرۆڤەو راڤەی ئەو خەونە دەبوایە ببم بە پاپا. بەڵام بۆ نەگبەتی پاشا، کۆمەڵێ روحانیانی، کە من یەکێك بووم لەوان، پەڕەوازە کردو مەڵبەندە موبارەکەکەیانی تێك دا. من کە قەشەیەکی هەژاری بێنەواو بووم، کەوتمە ئاوارەیی و سەرگەردانی و رووم دەکردە هەر شوێنێ دەریان دەکردم و ئیدی لەو چارەنووسە گەورەو پایە بەرزو پڕ شکۆیەی کە لە چارەم نووسرا بوو دوور کەوتمەوە."

کابرای ڕەبەن هەمدیس کەوتەوە نزاو وێرد خوێندن، لێ هێندە توڕە بوو کە بەمست دەیکێشا بە تەوێڵی خۆیدا. لە پڕ هاوارێکی هێندە ترسناکی کرد کە دیوارەکانی کوختەکەی لەراندەوەو بەدەم ئەو حاڵەوە دیسان هاتەوە قسان و گوتی:

"لەبەر ئەمەیە کە من ئێستا لە جیاتی ئەوەی لەسەر تەختی بەشکۆی پاپای ئەعزەم دابنیشم، تەنیا فریشتەیەکم و هیچی تر."

ئەم وتارە توندە پتر لە سەعاتێکی خایاند، پاشان کابرای ڕەبەن پێدەچوو کەمێك هێور بووبێتەوە. شوێنەواری توڕەیی لە سیمای ڕەوییەوەو چارەی گەشایەوە. کابرای ڕەبەن لە ئاسمانان و لەسەر هەورانەوە دابەزی بوو، و بوو بوو بە مرۆڤێکی سادەو واقیعی و دلۆڤان.

پیرەمێرد نیگایەکی شازادەی کرد، هێندەی لقەدارو درەختو دڕووانی نێو جەنگەڵو لێڕەواڕی بە بەدەنا چوو بوو، هەموو لەشی روشا بوو، ئیدی کەوتە تیمارکردنی. ئەوسا هەستاو خواردنێکی هێزبەخشو خۆشی بۆ میوانەکەی دروستکرد. ئەوسا لەلایەوە دانیشتو باسی زۆر شتی بۆ کردو هەموو جارێکیش دەستێکی بە گۆنای دا دێنا.

دوای نانی ئێواریێ، لە ژوورێکی چکۆلەتردا کە لە تەنیشت ژوورەکەی خۆیەوە بوو، جێگەیەکی بۆ شازادە راخستو میناکی دایکیکی دلۆڤان بردیە سەر جێگاکەی خۆیو خەواندی. ئەوسا گەڕایەوە لە پاڵ ئاورگەکەدا دانیشتو کەمێك ئاگرەکەی نێڵ داو ئەوسا لەپڕ وەکو یەکێك کە بیەوێ شتێك وەبیر بێنێتەوە، برۆکانی وێکهێنانەوە، لی هەرچی کردو کۆشا هیچی وەبیر نەهاتەوە. ناچار هەستا، دیسان خۆی بە ژوورەکەی شازادەدا کردو لێی پرسی:

"تۆ بەڕاستی پاشایت؟"

شازادە بە مینگە مینگەوە گوتی: "بەڵێ"

"پاشای کوێ؟"

"پاشای ئینگلیستان."

"پاشای ئینگلیستان؟ باشە هنری هەشتەم مردووە؟"

"بەڵێ، مخابن کە ئەو مرد. من کوڕی ئەوم."

کابرای رەبەن کە لە توڕەیی دا کۆڵە مستی گوشی بوو، و چارەی گرژو هەناسەی سوار بوو بوو، یەکسەر لە جێی خۆی هەستاو بە توڕەییو دەنگێکی گیراو گوتی:

"دەزانی ئەو کەسەی کە منی لە کلێساکەی خۆم وەدەرنا ئەم هنری هەشتەمەی بابی تۆ بوو؟"

کە شازادە هیچ وەڵامێکی نەدایەوە، کابرای رەبەن بۆ چەند ساتێك لە سیمای ئارامو شەرمنی راماو گوێی بۆ هەناسەی رێكو پێکی هەڵخستو لەبن لێوانەوە گوتی:

"خەوی لێکەوت، خەوێکی قووڵ!"

ئەوسا، رەزامەندیو شادیەکی دڕندانە نیشتە سەر سیمای کابرای پیرەمێرد. بزەیەکی ئاشکرا بەسەر لێوانی شازادەی نووستووەوە، پشکوتوو بوو. کابرای رەبەن دیسان روانییە چارەیو گوتی:

"بەڵێ، خەوتووە! خۆزگەم بە خۆی. بەڕاستی بەختەوەرە!"

ئەوسا هەستا، کەوتە گەڕان بە کونو کەلەبەری کوختەکەدا، هەرسا نا ساتێ دەگەڕایەوەو نیگایەکی جێگەوبانی میوانەکەی دەکرد، ئەنجام ئەو شتەی دۆزییەوە کە بۆێ دەگەڕا، شتەکە کێردێکی ژەنگاویو هەسانێك بوو. رەبەنەکە گەڕایەوە شوێنەکەی خۆیو لە پاڵ ئاگرەکەدا دانیشتو لە بن لێوانەوەو بێئەوەی دەنگی دەربچێت، کەوتە دوعاو وێرد خوێندنو لە پاڵەوەش دەستی بە تیژکردنی کێردەکە کرد.

لە دەرێی کوختەکەدا لورەی با هەترەشی پیاوی دەبردو درەختانی لێڕەوارەکەش بە دەنگی بەرز درێژەیان بە شەوانە گفتوگۆی خۆ دەدا. جرجو مشکان سەریان لە کونو کەلەبەری زۆرو

زەبەندی کوختەکەوە هێنا بووە دەرو نێگای پیرە رەبەنیان دەکرد کە بە کاوە خۆ مژولی کارە نهێنی ئامێزەکەی خۆی بوو.

کابرای رەبەن ناو بە ناو دەمی چەقۆکەی بەسەری قامکی خۆیدا دێناو ئەوجا سەرێکی دەلەقاندو دەیگوت:

"باش تیژ بووە، دەبڕێت، باش دەبڕێت!"

کابرای پیرەمێرد، هێندە سەرقاڵی کارەکەی خۆی بوو کە بە هیچ کلۆجێ ئاگای لە تێپەڕ بوونی وەخت و زەمەن نەبوو. هەندێ جاریش نقومی هزرە شوومەکانی خۆی دەبوو و لەدڵی خۆیدا دەیگوت:

"بابی بووە باعیسی نەگبەتی و بەدبەختی من و ئێستا لە ناوەندی ئاگری ئەزەلی دۆزەخدا دەسووتێت. بەدبەختانە تازە لە چنگی ئێمە دەرچووو و پەنای وەبەر مەرگ بردووە، لێ شوکر بۆ خودا کە ئیدی ناتوانێ لە عەزابی پڕ ژانی ئەو دنیاو لە ئاگری دۆزەخ هەڵێت."

بۆ چەند ساتێك و بە دەنگێکی بەرزتر قسەی کردو گوتی:

"سەبەبکاری تێکڕای ئەم نەگبەتیانە تەنیا بابی ئەوە. ئەگەر ئەو نەبوایە من تەنیا فریشتەیەکی سادە نەدەبووم بەڵکو دەبووم بە پاپا."

شازادەی چکۆلە لە جێگەکەی خۆیدا تلێکی دا. پیرەمێرد لەسەر تەختەکە هەستا، لە جێگەکەی شازادە نزیك بووەوە، بە دیاریەوە دانیشت، کێردەکەی بەرز کردەوەو بەو دەقەوە دەستی راگرت. منداڵەی داماو گینگڵێکی دیکەی داو چاوی کردەوە، لێ هیچی بەدی نەکرد، جارێکی دی خەوێکی قووڵ بردییەوە.

کابرای رەبەن بۆ چەند چرکەیەکی دی لە سیمای ورد بووەوە، ئەوجا بە ئەسپایی دەستی وەرسوڕاندو هێدی هێدی چەقۆکەی هێنایە خوارێ. و بەو دەقەوە لە بن لێوانەوە دەی پرتاندو دەیگوت:

"بێگومان شەو لە نێوە تێپەڕیوە، بەڵام نابێ کارێکی وەها بکەم کە ئەو هاوار بکات و دەنگی دەربچێت. چونکە لەگینە بەرێکەوت لەو کاتەدا یەکێك بەم ناوەدا تێپەڕێت."

هەمدیس هەستا، کەوتە گەڕان بە گۆشەو کەناری کوختەکەدا، پاش ئەوەی کۆنەپەڕۆیەکی لێرەو، کۆنە قایش و پەتێکی لەوێ دۆزییەوەو پەیدا کرد، هێدی هێدی بۆ شوێنەکەی خۆی گەڕایەوە. ئەوسا بە پارێزەوە هەردوو لاقی کوڕەی تاینی توند بەست. ئەوجا کەوتە هەوڵی ئەوە کە دەستەکانیشی ببەستێت. لێ شازادە هەموو جارێ بە حوکمی غەریزەی بەرگری و پاراستنی گیان، جوڵەیەکی دەکردو دەستەکانی لێکدی دوور دەخستنەوە. کابرای رەبەن لەزگ بوو کۆڵ بدات کە بە رێکەوت شازادە هەردوو دەستی جووتکردن و کابرای رەبەن زوو فریا کەوت و هەردوو دەستی توندو مکوم بەستن. ئەوسا پیرەمێرد بەکاوەخۆ پەڕۆکۆنەکەی خستە ژێر چەناگەی شازادەو هەردوو سەرەکەی لەسەر سەریا گرێداو ئەوجا پەڕۆکەی تاسەر دەمی هێناو بە جۆرێ توندی کرد کە ئیدی ئیدوارد تودور نەیدەتوانی دەم بکاتەوە.

((٢١))

## مايلز هندن دەهانايەوە دێت!

کابرای رەبەن، بە هەمان نەرمیو بێدەنگی پشیلە لە جێگاکەی شازادە دوور کەوتەوە، کورسیەکەی هەڵگرتو گەڕایەوە بۆ جێگاکەی خۆیو لە پاڵ ئاگرەکە دانیشت. گڕی ئاگری ئاورگەکە دەیدا لە چارەیو چاوە زەقەکانی، کە بڕی بوونیە منداڵە نووستوەکە، روناک دەکردەوە. کابرای رەبەن ئاگای لە تێپەڕ بوونی کات بڕا بوو، شوێنەواری خەندەیەکی درێو نیشتبووە سەر سیمایو شێوەی حەیوانێکی ناشیرینی پێ بەخشی بوو، لە بەشەری کەوتبوو. بەو حاڵەوە دەیڕوانییە نێچرەکەی خۆیو بە کاوەخۆ درێژەی بە تیژکردنی چەقۆکەی دەستی دەدا. رێک لە جاڵجاڵۆکەیەکی ترسناک دەچوو کە مێروویەکی داماوی بەگیرهێنابێو بیەوێ بەچاو قووتی بدات.

دوای سەعاتێك، کابرای رەبەن تەمەشای کرد کە منداڵەکە چاوی کردووەتەوەو بەترسو نیگەرانیەوە دەڕوانێتە چەقۆکەی دەستی ئەو. پیرەمێرد بێئەوەی لە جێی خۆی بجوڵێ یان دەست لە کارەکەی هەڵگرێ، بە دەم بزەیەکی شەیتانیەوە رووی تێکردو گوتی:

"کوڕەکەی هنری هەشتەم، ئایا دوا نوێژو دوعاو نزای خۆت کردووە؟"

شازادە ویستی دەستو لاقی بکاتەوە، هەرچەندە دەمی بەسترا بوو، بەڵام توانی، هەرچۆنێ بێ ناڵەیەك لە دەمیەوە دەربێنێ. کابرای رەبەن ئەو ناڵەیەی بە وەڵام زانیو گوتی:

"زۆر باشە، نوێژی تریش بکە، چونکە بەم زووانە دەچیتە بەر دادگای خوا!"

منداڵەی داماو راچڵەکیو رەنگی زەرد هەڵگەڕا. دیسان کەوتە هەوڵی ئەوەی دەستو پێی بکاتەوە، بەڵام بێهودە.. پیرەمێری نەعلەتی سەری دەلەقاندو بە هەمان بزەی شەیتانییەوە دەیڕوانیە نێچیرەکەی خۆیو هەر خەریکی تیژ کردنی چەقۆکەی بوو. هەر سا نا ساتێ بە شازادەی دەگوت:

"نوێژ بکە، نوێژی مردوو، هەر ئێستا دەچیتە بەر بارەگای خوا، بارەگای قازی داد!"

شازادە پاش ئەوەی دوا ناڵەی بێهودەی خۆی کرد، ئیدی دەستی لە هەوڵو تەقەلا هەڵگرت. روندك وەکو دانەی مرواری بە چاویا دەهاتە خوارێ، بەڵام دڵی رەقی کابرای رەبەن هەر نەرم نەبوو. چونکە بۆ نەرمکردنی دڵی جەلادێکی وەها شتێکی دیکە پێویست بوو نەك فرمێسك!

کاتێ یەکەمین تیشکی سپێدە لە پەنجەرەکەوە دای لە ناو کوختەکە، کابرای رەبەن بە دەنگێك کە توڕەییو ترسی لێدەباری دەستی بە قسان کردو گوتی:

"چیتر ئەم دیمەنە بەردەوام نابێت. ئەوەتا بەیان ئەنگاوتووەو کات بە پەلە تێپەڕیوە. ئەی کوڕی جەلادی کڵێسا، ئامادە بە! ئەگەر زاتی دیتنت نیە چاوانت بنوقێنە!"

رەبەنەکە بەدەم ئەو قسانەوە دەستی بەرز کردبوو و بە ئەسپایی دەمی چەقۆکەی لە ئەستۆی نێچیرەکەی خۆی نزیك دەکردەوە.

لەم کاتەدا دەنگێك لە دەرەوە هات. کابرای رەبەن هەستا، چەقۆکەی توڕ دایە پەنایەکەوە، ئەوسا پۆستینە هاودامانەکەی خۆی دا بەسەر شازادەداو بەدەم ترسو لەرزەوە لە شوێنی خۆی

وەستا. دەنگەکە نزیکتر دەبووەوە، و دیار بوو تورەیە. بە دەنگەکەدا دیار بوو کە قەرقەشەیەك کەوتووەتە بەینی چەند کەسێکەوەو یەکێك داوای یارمەتی دەکات. دوای تۆزێك دەنگی پێیەك کە ڕای دەکرد هاتە گوێ. یەکسەر بە توندی لە دەرکەی کوختەکە دراو یەکێك هاواری کرد:

"بیکەوە، دەرگا بکەوە!"

خودایا، چ خۆشییەکە! دەنگەکە دەنگی مایلز هندن بوو. شازادە دڵنیا بوو کە تازە رزگاری بووە.

کابرای رەبەن کە لە توڕەیی دا داگیرسابوو و نەیدەتوانی هیچ بکات، لە کوختەکە وەدەرکەوتو دەرگاکەی لە دووی خۆیەوە داخست. دوای تۆزێك دەنگی گفتوگۆیەك گەییە گوێی شازادەو گوێی لیّ بوو کە مایلز هندن دەڵێت:

"بابی مبارەك. سلاّوت لیّ بیّ، ڕێزو حورمەتم بۆتان هەیە. پێم بڵیّ منداڵەکە کوا؟ منداڵەکەم لە کوێیە؟"

رەبەنەکە پرسی:

"منداڵی چی برا، کام منداڵ؟"

"کام منداڵ؟ هەی... بابە گیان، درۆمەکە، مەکەوە فەندەڵ فێڵان، من تاقەتی درۆیانم نیە. دوو دزی جەربەزە منداڵەکەیان دزی بوومو من لە نزیکی ئێرەدا گرتمنو ئەوانیش بۆ ئێرەیان ناردم. تکایە چاوو ڕاوم لیّ مەکە، لەوەی پتر عەزابی روحم مەدە ئەگینا... خێراکە پێم بڵیّ منداڵەکە کوا؟"

"ئەگەر مەبەستت ئەو منداڵە وێڵەیە کە دوێشەو لەماڵەکەی خۆمدا جێم کردەوە، ئەوا ئەم بەیانیە بە دووی کارێکمدا نارد."

"باشە کەی دەگەڕێتەوە؟ دەتوانم بە پیریەوە بچم؟"

"پێویست ناکات، ئێستا خۆی دەگەڕێتەوە."

"زۆر باشە، من لێرە چاوەڕوانی دەکەم. ئا دەی تۆ چیت گوت؟ بە دویو کارێکتدا ناردووە؟ ئەمە درۆیەکی باڵدارە، باوکە، ئەگەر تۆ ئەو دەستوورە نا بەجێیەت پیّ دابا یان ردێنی دەردێنای، یان بەلای کەمەوە بە قسەی نەدەکردیت. شتی وا مەحاڵە، من چاکی دەناسمو دەزانم کە لەم دنیایەدا ناچێتە ژێر باری هیچ بەشەرێك. بۆیە، بابۆ، بێگومان راست ناکەی."

"گوتت ناچێتە ژێر باری هیچ بەشەرێك؟ رەنگە هەق بە تۆ بیّ، چونکە من بەشەر نیم."

"تۆ بەشەر نیت؟ ئەدی چیت؟"

"ئەمە نهێنییەکە کە نابیّ بە کەسی بڵێم، لیّ لەوانەیە متمانە بە نهێنی پارێزی تۆ بکەمو پێتی بڵێم... من... فریشتەم."

مایلز هندن کە گوێی لەم قسەیە بوو، زۆری پیّ سەیر بوو، کەمێك لەفکران ڕاچوو و گوتی:

"کەواتە شتەکە سەیر نیە، کوڕەکەی من هەرگیز نەدەچووە ژێر باری بەشەر، لیّ پاشا لەگینە بە گوێی فریشتە بکات. وانیە؟ لەم حاڵەدا... گویّ بگرە، گویّ بگرە! گوێت لەم دەنگە بوو؟"

لە کاتێکا کە ئەو دووانە سەرقاڵی گفتوگۆ بوون، شازادە کە لە ترس‌و لە خۆشیا دەلەرزی، زۆری هاوار کرد کە دەنگی گیراوی بگاتە مایلز هندن، لێ بۆ نەگبەتی نەیتوانی پەڕۆ کۆنەکە لە زاری بکاتەوەو پڕ بە زار هاواربکات. کاتێ مایلز هندن پرسی: "گوێ بگرە، گوێت لەو دەنگە بوو؟"

ئەو زیاتر گوڕی دایە خۆی‌و زیاتری ناڵاند.

رەبەنەکە گوتی:

"دەنگ؟ ئەوە دەنگی بایە."

مایلز هندن گوتی:

"بەڵێ، بێگومان دەنگی بایە... لێ، نا، بابە، ئەمە دەنگی با نیە. گوێ بگرە، چ دەنگێکی سەیرە! دەمەوێ بزانم ئەم دەنگە چییە."

شازادە کە گوێی لەو قسانە بوو، دڵی خۆش بوو، لێ ئیدی پرزەی لەبەر بڕا بوو. چونکە دەمی بەسترا بوو بە ئاستەم دەنگی لێوە دەهات. بەلەنگازە بە جارێ ئومێد بڕ بوو کە گوێی لە رەبەنەکە بوو دەڵێت:

"بەڵێ، من ئەو دەنگە دەژنەوم، بە هەرحاڵ ئەو دەنگە لە لێرەوارەکەوە دێ، وەرە با رێی ئەوێندەرت پێنیشان بدەم."

بە دوو قۆڵی لە کوختەکە دوورکەوتنەوە، و کە دەنگیان لە نێو دەنگی بایەکەدا نقوم بوو، شازادە هەستی بە بێدەنگیەکی قورس‌و ترسناک کرد.

کات، نە دەڕۆیی. لە تۆ وایە عەمری ئەزەلی‌و ئەبەدیەو نابڕێتەوە. جارێکی دی شازادە گوێی بە چەند دەنگێك زرینگایەوە، و وای هەست کرد کە دەنگی سمی ئەسپ دێت.

هەمدیس دەنگی مایلز هندن بەرز بووەوەو گوتی:

"من ناتوانم لەوەی پتر چاوەڕوان بکەم. کوڕەکەم لەکوێوە رۆیی؟ خێرا پێم بڵێ!"

"کوڕەکەت لێرەوە... لێ سەبرکە منیش دەمەوێ لەگەڵتا بێم."

"ئافەرین، وادیارە زۆر لەو باشتری کە رواڵەتت نیشانی دەدات، رەنگە لە تێکڕای فریشتەکانیش باشتر بیت. دەی ئێستا بفەرموو بزانم! من ئەم گوێدرێژەم بۆیە هێناوە کە کوڕەکەم سواری بێ‌و ئەم قاترەش بۆ خۆمە. تۆ سواری کەرەکە دەبیت یان قاترەکە؟"

"تۆ سواری قاتری خۆت بەو هەوساری کەرەکەش بە دەستەوە بگرە، من بە پێیان دێم. هێشتا توانای رۆییشتنم هەیە.

"کەواتە تۆ جارێ رەشمەی ئەم کەرەم بۆ بگرە تا بزانم دەتوانم ئەم قاترە چەموشە ڕام بکەم‌و سواری بم یان نا، ئەگەر دەزانی چەند حەیوانێکی ناڕەسەنە!"

چەندین جار دەنگی سمکۆڵان‌و جووتە هاویشتنی قاترەکەو جنێوی مایلز هندن گەییشتنە گوێی شازادەی گیرۆدەو یەخسیر. ئەوسا شەڕو سەرسەختی قاترەکەو سوارەکەی کۆتایی هات‌و هەردوو پیاو کەوتنە رێ. شازادەی بەلەنگاز بە کۆڵێك نا ئومێدی‌و بێ هیواییەوە لە دوورەوە دەنگیانی دەبیست‌و بە خۆی دەگوت:

"مخابن كە تاقە دۆستە ئازیزەكەم فریوی خواردو ڕەبەنی شەیتان توانی لەم دەوروبەرەی دوور بخاتەوە. بەڵام من دڵنیام كە جارێكی دی بۆ ئێرە دەگەڕێتەوە!"

شازادە بەو ئومێدەوە جارێكی دی كەوتە لەقەفرتیّو تەنانەت توانی پۆستینەكەش كە لە ژێریا هەناسەی سوار بوو بوو، لەسەر خۆی لابدات.

لەم كاتەدا دەرگای ژوورەكە كرایەوە. شازادە خەریك بوو لە ترسا زراوی بتۆقیّو بە خەیاڵ هەستی بە ساردیو تیژی دەمی چەقۆكە، لەسەر ملی خۆی دەكرد. بەلەنگازە چاوی نوقاندنو خۆی رادەستی قەزاو قەدەر كرد. كاتیّ دوای چەند چركەیەك كە چاوی كردنەوە سەیری كرد جۆن كانتیو هۆگۆ بە دیار سەرییەوە وەستاون.

ئەو بەلەنگازە ئەگەر توانیبای زار هەڵێنیّ، بە دیتنی ئەوان سوپاسی خودای دەكرد.

جووتە دز لە چاو تروكانێكدا دەستو لاقیان كردەوەو هەریەكە دەستێكیان گرتو بەغار بەرەو لێرەوار بكێشیان كرد.

((٢٢))

## خیانەت

بەڵێ. جارێكی دی (بالولی یەكەم) خۆی لە نێو دزانو یاغیانو شەقیان دا بینییەوە. هەر كاتیّ ماتامور رووی دەكردە كەسێكی دیو چاوی لەو غافڵ دەبوو، جۆن كانتیو هۆگۆ كە تاقە دژمنانی سەرسەختی شازادە بوون، بەر تەوسو توانجیان دەداو عەزابی روحیان دەدا. لە نێو دزەكاندا هەندێك هەبوون كە خۆشیان دەویست، و بگرە تێكڕا ستایشی هۆشو زیرەكیو بوێریو شەهامەتی ئەویان دەكرد.

دوو رۆژی یەكەم، هۆگۆ خەریك بوو ژیانی لە شازادە تاڵ دەكردو ئەزیەتی دەدا. ئەم هەتیوە ناڕەسەنە، چەندین جار لەو كاتەدا كە هەمووان لە دەوری ئاگرەكە خڕ دەبووەنەوەو دەكەوتنە شێو خواردن، بە ئانقەست لە جێی خۆی هەڵدەستاو پیّ بە پێی شازادەدا دەناو پێشێلی دەكرد.

شازادە لە هەوەڵەوە، خۆی لەم رەفتارە دژمنانەیە گێل دەكردو هیچ وەڵامێكی نەدەدایەوە، لیّ جاری چوارەم لەم رەفتارانەی هۆگۆی بیّ ئەدەب دەهری بوو، دەستی دایە گۆپاڵێكو تێی بەربووو تەختی عاردی كرد. دزەكان لە دڵی خۆدا بەم زاتو جورئەتە خۆشحاڵ بوون، بە تایبەتی چونكە حەزیان لە چارەی هۆگۆ نەدەكرد. هۆگۆ كە لە تەریقیو شەرمەزاریدا دەلەرزی، هەستا گۆپاڵێكی هەڵگرتو بەرەو حەریفە تووڕەكەی كە لە خۆی بچووكتر بوو چوو. یەكسەر كۆمەڵێك لە دزەكان دەوریان دان. هەموو هاواریان دەكردو گرەویان لەسەر ئەوە دەكرد كە كیّ زاڵ دەبیّو كیّ دەدۆڕیّ. زۆربەیان لەو باوەڕەدا بوون كە هۆگۆ لە حەریفەكەی بەهێزترەو دەی بەزێنیّ، لیّ هۆگۆی داماو هەرگیز تەسەوری نەدەكرد كە رەقیبەكەی لەلای گەورەترین مامۆستایانی ئەوروپایی فێری گۆبازیو قاشوانیّو شمشێربازی كراوەو زۆر لەو چالاكو چەلەنگترو مەعلاتترە.

شازادە بەوپەڕی نەرمیو هێمنی هەڵوێستی بەرگری وەرگرتو جەزرەبەكانی یەكەمی حەریفەكەی رەت كردەوەو بە چالاكی خۆی لە جەزرەبەكانی دواتری پاراست. ئەوجا لە كاتێكا

کە ئامادەبووان هورای شادیان دەکێشا، هێرشی بێ ئامانی خۆی دەست پێکرد. هەمووی چارەکێکی پێ نەچوو کە هۆگۆی داماو لە پەلوپۆکەوتو بەوپەڕی شەرمەزاریو بەزیوی گۆپاڵەکەی داناو لە مەیدانی شەڕ هەڵات. شازادەی زاڵ بە دەمڕێژی قاقای پێکەنینێکی شادی بەخش پێشوازی کراو دزەکان خستیانە سەرشان، ئەوسا لە تەنیشت ماتامۆرەوە لەسەر کورسی شەرەف دایان نیشاندو شەرەفی لەقەبی (پاشای کەڵەبابانی جەنگی)یان پێ بەخشی. لە ئەنجام دا بڕیاردرا کە لەقەبی یەکەمی واتا (بالولی یەکەم، سوڵتانی گەوجان)ی لەسەر لابرێو هەر کەسێك بەو ناوە بانگی بکات، یەکسەر لەگروپەکەی خۆیان دەری بکەن.

کۆڕی دزان هەرچیان کردو کۆشا کە شازادە وادار بکەن کە بەگەڵ ئەوان بکەوێو خزمەتی جەماعەت بکە، ملی نەداو نەدا. ئەم کوڕێژگەیە هیچ کارێکی نەدەکردو هەمیشە لە هەوڵی ئەوەدا بوو هەڵێ. رۆژی یەکەم بە خورتی بۆ ئاشخانەیان نارد کە ئاشچیو شاگردانی لەوێندەر نەبوون، تا شتێکیان بۆ حازر بکات، کەچی بە دەستی بەتاڵ هاتە دەرێ،و هیچ کارێکی نەکرد، پاشان ویستیان وەکو شاگردو یارمەتیدەر بەگەڵ کابرای مزگەری بخەن. شازادە خۆی لەم کارەش بواردو دەستی دایە شیشی لەحیم کاریەکەو هەڕەشەی لە کابرای مزگەر کرد کە ئەگەر زۆری لێبکات بەو شیشە سەری دەشکێنێت: شازادە زۆر بە توندی بە گژ هەر کەسێك دا دەچووەوە کە ئازادی لێ زەوت کردبا یان هەوڵی دابا بیخاتە ژێر کارەوە. ئەنجام جماعەت لێبڕان کە بە سەرپەرشتیو چاودێری هۆگۆ، دەگەڵ ژنێکی بەلەنگازدا کە منداڵێکی نەخۆشی بە بەرەوە بوو، بە گەدایی بۆ گوندانی بنێرن.

شازادە، ملی بۆ ئەو کارەش نەداو گوتی:

"من لە ئێوە نیمو ئێوە ناناسم، بە خۆڕایی خۆتان بە منەوە ماندوو مەکەنو چاوەڕوانی هیچ شتێك لە من مەبن!"

رۆژان بەو جۆرە بورین، ژیانی شازادە بە جۆرێ بە گەندەڵیو لاتیو هەژاری لەوتا بوو کە ئەو داماوە زۆرجار بە خۆی دەگوت:

"خراپم کرد کە لە ژێر تیغی کابرای ڕەبەن هەڵاتم. ئەگەر ئەو بیکوشتبام، بەلای کەمەوە ئێستا بۆ خۆم لەم دەردو مەینەتیە رزگار بوو بووم."

لێ کە شەو دادەهاتو دەکەوتە دنیای خەو و خەیاڵو خەونانی خۆشەوە، دەردو مەینەتیەکانی ژیانی لە بیر دەچووەوە. داماوە لە دنیای خەیاڵدا دەی بینی کە لەسەر تەختی سەڵتەنەت دانیشتووەو ئاغاو گەورەی خۆیەتی لە تەمەشای شکۆو جەلالی عەجایەبی دەربارو کۆشکەکەی خۆیدا نقوم دەبوو. بەڵام کە خەبەری دەبووەوەو دەهاتەوە دنیای حەقیقەتو واقیع هێندەی دی دەردی گرانتر دەبوو.

هۆگۆ، بۆ سبەینێی ئەو رۆژەی کە لە شەڕە دوو قۆڵیەکەیاندا بەزی بوو، بە نیازی تۆڵەکردنەوە، لە خەو رابوو و بە خۆی گوت:

"بۆ ئەوەی تۆڵەی خۆ بکەمەوە دوو رێگەم لەبەرە، یەکەمیان ئەوەیە کە شێوازێك بدۆزمەوەو تێر گاڵتە بەو خەیاڵ پڵاوانەی بکەم تا لەبەر چاوی خەڵکەکە تەریق ببێتەوەو شەرمەزار بێت، دووەم

ئەوەیە کە ئەگەر ئەم کارەم بۆ نەچووە سەر، لە تاوانێکییەوە بگلێنم کە بگیرێتو بدرێتە دادگا".

هۆگۆ بۆ ئەنجامدانی نەخشەی یەکەم بڕیاری دا کە زامێکی دەستکرد بەڕانی شازادەوە بنێو بە یارمەتی جۆن کانتی بۆ سەر شاڕێگاکانی بنێرن تا بە نیشاندانی ئەو زامە سۆزی خەڵکی ببزوێنێو گەدایی بکات. گەدایان بەزۆری ئەم جۆرە زامانە بەوە دروست دەکەن کە دێن ئاهەکی وشکو سابوونو ژەنگی ئاسن تێکەڵ دەکەنو لەسەر رانی خۆیانی دەنەنو بە قایشێك دەیبەستنو کاتێ شوێنەکەی بە تەواوەتی سوور بووەوە خوێنی حەیوانی لێ دەدەنو ئەوجا پەڕۆ کۆنێکی چڵکنی ناشیرینی لەسەر دەبەستن تا بەزەیی رێبواران بجوڵێننو وایان لێ حاڵی بکەن کە گەدای زامدار تووشی زامی سەرەتان بووەو زامەکەی زۆر بە ئازارە.

هۆگۆ بە ئاسانی کابرای مزگەری بەلای خۆیدا راکیشا کە لەو کارەدا یارمەتی بدات، چونکە یارۆی مزگەر هێشتا ئەو رقەی لە دڵ دەرنەچوو بوو کە (پاشای کەڵەبابانی جەنگی) چەند رۆژێك لەوە پێش هەڕەشەی لێکردبوو کە ئەگەر زۆری لێبکات بە شیشی لەحیم کاریەکە سەری دەشکێنێ. بە دوو قۆڵی منداڵەکەیان لە ئۆردوگاکەیان دوور خستەوە. ئەوسا دایان بە عاردیدا، کابرای مزگەر توند گرتیو هۆگۆ، ئەو ماجومە پیسەی لەڕانی هەڵسوو. شازادەی نەگبەت بە تورەیی دەستو لاقی دەهاویشتو هاواری دەکردو دەیگوت:

"با ئەمجارە بچمەوە سەر تەخت بزانە چۆن هەردووکتان لە سێدارە دەدەم!"

ئەم دووانە، لە بری وەڵام تا توانیان لێیان داو جنێویان پێ دا. لە ماوەی چەند دەقیقەیەك دا گۆشتی رانی شازادە، لەو شوێنەدا کە ماجوومەکەیان لێ دابوو، سوور بووەوەو کاری زامسازیەکەی ئەو جووتە دزە بێ ئابڕووە، بەرەو تەواو بوون، دەچوو. لێ هاتنی لە ناکاوی ئەو غوڵامەی کە داغمەی (غ)یان بە گۆنایەوە نابوو، ریسەکەی لێکردنەوە بە خوری. غوڵامەکە کە زۆر بەهێز بوو هۆگۆو مزگەرەکەی لەسەر شازادە لادان، ئەوسا قایشە چەرمەکەی لە رانی کردەوەو ماجوومەکەی لێ سڕی.

ئیدوارد تودور، ویستی گۆپاڵەکە لە کابرای خولام وەربگرێتو بکەوێتە وێزەی جووتە دزەکەو تۆڵەی خۆی بکاتەوە، لێ غوڵامەکە نەیهێشتو گوتی:

"نا. تا شەوێ خۆت بگرە! جماعەت کۆبوونەوە دەکەنو لەمە بە دوا هیچکەسێك لە یاغیان زات ناکات خۆی لە کاری تۆ هەڵقورتێنێ."

یارۆی غوڵام هەموویانی بۆ ئوردوگاکە هێنایەوەو حاڵو حیکایەتەکەی بۆ ماتامۆر گێڕایەوە. ماتامۆر دوای کەمێك بیرکردنەوە گوتی:

"ئەم منداڵە زۆر بە هۆشو بەغیرەتەو گەدایی لێ ناوەشێتەوە. لە ئێستا بە دواوە دەبێ دزی بکات!"

هۆگۆ، لە خۆشی ئەم دەستورە لە پێستی خۆی نەدەهێوری. ئیدی لەلای مەعلوم بوو کە شازادە ناتوانێ سەرپێچی لە دزی بکات، چونکە ئەمە دەستورو، فەرمانی سەر گەورەی گروپەکەیان بوو. هەتیوەی نارەسەن یەکسەر نەخشەیەکی خێرای بۆ دوای نیوەڕۆ کێشا کە بەڵکو بتوانێ رەقیبەکەی بخاتە داوی قانونەوە، بەڵام دەبوایە ئەم نەخشەیە بە جۆرێ دابڕێژرێ کە تەواو

ئاسایی و ڕێکەوتەکی بێتە بەرچاوان و نەبێتە مایەی هیچ گومانێك، چونکە ماوەیەك بوو کە (پاشای کەڵەبابانی جەنگی) لە دڵی هاوڕێیانی دزو گەدای دا زۆر شیرین بوو بوو و هەر کەسێك داوی بۆ ناباوە، بە توندی سەرکۆنەو تەمێیان دەکرد.

هۆگۆ، دوا نیوەڕۆیەکی زوو ئیدوارد تودوری دەگەڵ خۆیدا بۆ ئاواییەکی نزیك برد. هەردووکیان هێدی و هێمن بەکوچەو کۆڵانەکاندا دەسوڕانەوە. هۆگۆ بۆ دەرفەتێکی لەبار دەگەڕا کە نەخشەکەی خۆی پراکتیزە بکات، و شازادەش چاوە چاوی ئەوەی بوو کە هاوڕێکەی غافڵگیر بکات و بە یەکجارەکی خۆی لە ژێر باری گرانی زەلیلی و ریسوایی یارە نەیارەکانی نەجات بدات.

هۆگۆ، لەپڕ چاوی بە ژنێك کەوت کە زەمیلەیەکی گەورەی بە بن دەستەوە بوو، و زەمیلەکە بوخچەیەکی تێدا بوو. ژنە بەرەو رووی ئەوان دەهات. هۆگۆ کە لە خۆشیا چاوانی پرشنگیان دەدا لە فکران ڕاچوو و لە دڵی خۆیدا گوتی:

"ئەی پاشای کەڵەبابانی جەنگی، ئەگەر نەخشەکەم سەر بگرێ، بە چاوی خۆت دەبینی کە کارت کراوە!"

هۆگۆ، راوەستا تا ژنەکە لەوان تێپەڕی. ئەوسا بە ئەسپایی روویکردە شازادەو گوتی:

"یەك دەققە لێرە بوەستە، من هەر ئێستا دەگەڕێمەوە!"

و یەکسەر کەوتە دووی نێچیرەکەی خۆی.

شازادە هەستیکرد رزگار بوونی مسۆگەرە،و لە دڵی خۆیدا گوتی:

"ئەگەر ئەم کوڕە ماتەڵ بێت، بە دڵنیایی دەرەڤم!"

لێ تەگبیر لەگەڵ تەقدیرا تێکی نەکردەوە. هۆگۆ بە ئەسپایی دووی ژنەی تاین کەوت، لە ناکاو پڕی دایە بوخچەکەی نێو زەمیلەکەو لە کۆنە لێفەیەکی بن باخەڵی خۆیەوەی پێچاو بە هەشتاو خۆی گەیاندەوە جێگاکەی خۆی. ژنەکە کە هەوەڵجار هەستی پێنەکرد بوو لە پڕ هەستی کرد زەمیلەکەی بن دەستی سووك بووە. کاتێ روانیە ناو زەمیلەکەو زانی بوخچەکەیان لێ دزیوە هاواری کردو گوتی: "ئەهای دز! ئەهای دز!" هۆگۆ بەلەز بوخچەکەی فڕیدایە باوەشی شزادەو گوتی:

"یەکسەر دوای من بکەوەو هەوڵبدە بکەوە رێ گومکێ لەوانەی دوامان دەکەون!"

دوای تۆزێك خۆی لە پێچی یەکێك لە کۆڵانە چۆڵەکاندا شاردەوە، لێ زۆری پێنەچوو، کەمێك لە دووری شەڕەکەو لە نێو خەڵکەکەوە سەری دەرهێنا. ئەو نارەسەنە، لەبەر ماڵێکدا پشتی بە دیوارێکەوە دابوو، و خۆی فەقیر کردبوو، و وەکو هەموو خەڵکەکە سەیری فەرتەنەکەی دەکرد.

شازادە، بەوپەڕی بێزاری بوخچەکەی دا بە عاردیدا، لەو دەمەدا ژنەی تاین لەگەڵ دە دوانزە کەسی بێکاری گەڕەکدا گەییشتە جێ، توند دەستی شازادەی گرت و دەستی بە جنێودان و دادو بێداد کرد.

هۆگۆ، کە لەلایەوە وەستا بوو، لە دڵی خۆیدا پێدەکەنی، و بە خۆی دەگوت:

"سوپاس بۆ خوا نەخشەکەم سەری گرت، ئیدی باڵیش بگرێ ناتوانێ لە چنگی ئەو خەڵکە دەربچێت." و ئەوسا بە خۆشی و شادی بەرەو ئۆردوگا گەڕایەوە. بەدەم ڕێگەوە بیری لەوە دەکردەوە درۆو سیناریۆیەکی قەناعەتبەخش ئامادە بکات و ماتامۆری پێ قاییل بکات.

شازادەی بەدبەخت بە هەموو هێزو توانایەکییەوە خۆی رادەپسکاندو دەیگوت:

"ژنۆکەی گەوج، دەستم بەردە! من دز نیم، ئەوەی بوخچەکەی تۆی دزی من نەبووم!"

ئەڵقەی بێکارەکان سات بە سات لە دەوری شازادە تەنگترو ترسناکتر دەبوو. ئاسنگەرێك بە بەر کۆشەیەکی چەرمینەوە، قۆڵی لێ هەڵماڵێ بوو، و دەستە بەهێزو گۆشتنەکانی بۆ شازادە درێژ کردو گوتی:

"هەتیوەی دز! ئێستا دەرسێکی وات دا دەدەم کە هەرگیز لە بیری نەکەی!"

لێ ڕێك لەم ساتەدا دەمی شمشێرێکی درێژ بریقایەوەو لەسەر پانی داهاتەوەو بەسەر دەستی کابرای ئاسنگەردا کەوت. خاوەنی شمشێرەکە یەکسەر گوتی:

"هێواش! برادەری ئازیز، هێواش! تۆ هەقی ئەوەت نیە جنێو بەم منداڵە بدەی و هەڕەشەی لێ بکەی و لێی بدەی! ئەمە کاری یاسایە، تۆش خانمی بەڕێز، واز لەم منداڵە بێنە، دەستی بەر بدە، ئەگەر شتێکت هەیە شکاتی لێبکە!"

کابرای ئاسنگەر کە ئازار بە دەستی گەیی بوو، دوای ئەوەی نیگایەکی قەدو باڵای خاوەن دەنگەکەی کرد، برۆکانی وێکهێنانەوەو بە پەستی لەوێندەر دوور کەوتەوە. ژنەش بە نە بەدڵی دەستی ئیدوارد تودوری بەردا. شازادە ئۆخژنێکی لە دڵو دەروون گەرا، لە خۆشیان گەشایەوە، بە چاوانی پرشنگدار وگۆنای ئاڵەوە، بە هەشتاو خۆی گەیاندە فریارەسەکەی و بە دەنگی بەرز گوتی:

"ئاه... سێر مایلز هندن، چەندم چاوەڕوان کردیت، باش بوو لە کاتی خۆیدا گەییشتی.. حەز دەکەم ئەم پەتیارە بێ شەرمەم بە شمشێر بۆ لەت بکەی!"

((٢٣))

## ئایا شازادە دەکەوێتە زندان

مایلز هندن زۆر بە زەحمەت جڵەوی پێکەنینەکەی خۆی گرت، ئەوسا سەری وەپەنا گوێی شازادە ناو بە ئەسپایی گوتی:

"ئەزبەنی، تکا لە خاوەنشکۆ دەکەم کەمێك ئارام بیت، تەنانەت عەرزی باخزمەتت دەکەم کە ئەگەر دەکرێ بێدەنگ بیت. تۆ باوەڕ بە من بفەرموو، بزانە چۆن کارەکان بە دڵی خۆمان جێبەجێ دەکەم!".

ئەوسا لە دڵی خۆیدا گوتی: "عەجایەب! خۆ پێم دەڵێ سیر مایلز! من هەر لە بیرم نەما بوو کە پایەی شاسواری پێداوم. دیارە بەستەزمانە هێشتا هەر لە خەیاڵ پڵاوی شێتایەتیەکانی خۆیدایە! بێگومان ئەم لەقەب و پایەیەی کە بە منی داوە لە هیچ شتێکی من نایەت، بەلاّم چ

قەیدیه؟ ئەگەر پیاو هەندێجار لە مەملەكەتی وەهمو خەیاڵدا شاسوار بێ لەوە باشتر نیه كە لە دنیای واقیع دا كونت بێت؟"

لەم كاتەدا ئاپۆڕای خەڵكەكە دڕیان داو ڕێگەیان بۆ ئەو گەزمەیەی (حەسحەس) كە دەیویست شازادە بە تاوانی دزی بگرێت، كردەوە. مایلز هندن كەوتە بەینەوەو گوتی:

"برادەر، تۆزێك سەبركە، ئەم منداڵە بە خۆی دێت، تۆ تەنیا ڕێگەكەی پێ نیشان بدە كە بۆ كوێ بێت، خۆی دێت!"

گەزمەكە شان بە شانی ژنەی بوخچە دزراو وەڕێكەوت، شازادەو مایلز هندن دوویان كەوتن، خەڵكە بێكارەكەش لە دوایانەوە كەوتنە ڕێ. مایلز هندن هەركە ڕوانییە سیمای شازادەو هەستی كرد كە ناڕەحەتەو بە نیازە یاخی بێ، دەمی وەپەنا گوێی ناو بە ئەسپایی گوتی:

"قوربان، كەمێك بیربكەوە، زاكونیو زەبتو ڕەبتو سەقامگیری بارودۆخی ئێستای مەملەكەت زادەی ئەو یاسایانەیە كە ئێوە داتان ناوەو خودی خاوەنشكۆتان جێبەجێكارو پاسەوانی ئەو ئەو یاسایانەن. جا ئێستا داوا لەخۆتان دەكەن ڕێزی ئەو یاسایانە بگرنو پابەندی بن، ئایا دروستە یاخی بنو نا فەرمانی نیشان بدەن؟ جا ئەوەی گومانی تێدا نیە ئەمەیە كە حاڵی حازر یەكێك لەو یاسایانەی خۆتان داتان ناوە پێشێل كراوە. ئایا كاتێ كە چوویتەوە سەر تەختو وەبیرت هێنایەوە كە ڕۆژێ لە ڕۆژان پلەو پایەی خۆت فەرامۆش فەرمووەو وەكو هەر هاووڵاتیەكی ئاسایی، ملت بۆ یاساو ڕێسایەك داوە كە خۆت جێبەجێكارو دانەریت، شانازی بەو هەڵوێستەتەوە ناكەیت؟"

كوڕیژگەكە گوتی:

"هەق بە تۆیەو ئێستا پاشای ئینگلیستان پێتی نیشان دەدا كە دەتوانێت وەكو هەر هاووڵاتیەكی ئاسایی ملكەچو پابەندی ئەو یاسایانە بێت كە بە خۆی بۆ میللەتو ڕەعیەتی خۆی داناوە."

كاتێ ژنەی تاین بۆ پرسوجۆ برایە بەردەم قازی، سوێندی خوارد كە ئەم منداڵە بوخچەكەی دزیوەو جگە لەو گومانی لە هیچكەسێكی دی نیە. ژنە دوای ئەوە بوخچەكەی كردەوە. ئامادەبووانی دادگا زۆریان سەر سوڕما. چونكە بوخچەكە بێچوە بەرازێكی قوتو قەڵەوی تیا بوو هەر قابیلی برژان بوو. قازی برۆی وێكهێنانەوە. مایلز هندن ڕەنگی لە ڕووا نەما، لێ شازادە كە ئاگای لە مەحمودی بێ زەواد نەبوو، خوێنساردو بێ خەم ڕاوەستا بوو، قازی مودەتێك لە فكران ڕاچوو، و پاشان ڕووی كردە ژنەی سكاڵاكەرو پرسی:

"خانم، ئەم بەرازەی تۆ بایی چەندە؟"

ژنەی تاین ئیكلامێكی كردو گوتی:

"ئەزبەنی، سێ شیلینگ و هەشت پنس، باوەڕ بفەرموون كە بڕبەنگی لێ بدەی لەوە كەمتری نیە."

قازی نیگایەكی ئەو بێكارانەی كرد كە ڕژابوونە نێو دادگاو پاشان بە ئاماژەی سەر دەستوری بە گەزمەكە دا كە لێی بچێتە پێشەوە. كە كابرای گەزمە (حەسحەس) چووە حوزوری، پێی گوت:

"ئەو خەڵکە لە دادگا بکە دەرێ‌و دەرگاکان دابخە!"

یەکسەر ئەمری قازی جێبەجێ کرا. لە چاوتروکانێکدا دادگا چۆڵ بوو، چۆل بوو، جگە لە قازی‌و گەزمەو خاوەن شکات‌و تاوانبارەکەو مایلز هندن چ کەسێك لە ژوورەوە نەما. مایلز هندن سات بە سات پتر رەنگی تێکدەچوو، ئارەقەیەکی سارد نیشتبووە سەر تەوێڵی، قازی جارێکی دی روویکردە ژنەکەو بە دەنگێك کە بەزەیی‌و رەحمی پێوە دیار بوو گوتی:

"خانم، ئەم منداڵە، کەسێکی نەگبەتەو، لەگینە برسیەتی ئەو کارەی پێ کردبێت، چونکە بە خۆت دەزانی هەژاران لەم دەوروزەمانەدا حاڵیان بێ حاڵە. تۆ باش تەماشای بکە! بەستەمانە چەند باریك‌و بنێسە،و بە سیماشدا لە منداڵێکی خراپ ناچێت. جا خانمی بەڕێز دەمویست شتێکی دیکەشت عەرز بکەم، ئایا دەزانی بە گوێرەی قانون هەر کەسێك ماڵێك بدزێ کە نرخی لە سیانزە پنس‌و نیو پتر بێت‌و تاوانەکەی لەسەر ساغ ببێتەوە، دەبێ لە سێدارە بدرێت؟"

شازادە، ڕاچڵەکی، لە ترسا چاوانی ئەبڵەق بوون. لێ یەکسەر بەسەر خۆیدا زاڵ بوو، و ئاسایی بووەوە. ژنە کە گوێی لە روونکردنەوەکانی قازی بوو داچڵەکی‌و بەدەنگێکی لەرزۆك هاواری کردو گوتی:

"واوەیلا! خودایا، چیم بە خۆم کرد؟ چ هەڵەیەکم کرد! من هەرگیز قاییل نیم کە ئەم منداڵە کلۆڵە لەبەر خاتری من لە سێدارە بدرێ. واوەیلا! ئەیەڕۆ جەنابی قازی، دەستم بە داوێنت، ئێستا من تەگبیرم چیە، چی بکەم تا نەجاتی بدەم؟"

قازی بێئەوەی خۆی شێلو بکات گوتی:

"خانم، ئێستاش نەچووە بچێت، و دەتوانی نرخی بەرازەکەت کەم بکەیتەوە"

"زۆر چاکە، ئەگەر وایە من دەڵێم بەرازەکەم هەر بایی هەشت پنسە،و زۆر خۆشحاڵم کە دەستم بەم تاوانە نەنگینە نالەوەتێ‌و ویژدانی خۆم رەحەت‌و ئاسوودە دەکەم."

مایڵز هندن، بە قسەکانی ژنەی تاین، هێندە شاد بوو کە لەزگ بوو لە کەیفان شێت بێت. ئەم پیاوە دلۆڤانە خۆی پێنەگیراو باوەشی بە شازادەدا کرد. قازی بۆ ئەوەی سۆزو بەزەیی خۆی بشارێتەوە سەری بەسەر مێزەکەدا دانەواند بوو و تەمەشای فایلەکەی دەکرد. ژنە پاش ئەوەی ئیکلامێکی بۆ قازی کرد، بێچووە بەرازەکەی لە بن هەنگڵی ناو بەرەو دەرگا رۆیی کە بچێتە دەرێ. کابرای گەزمە (حەسحەس) دەرگاکەی بۆ ڤەکردو تا ڕاڕەوی دادگاکە بە دوویا رۆیی. مایلز هندن گومانی لە رەفتاری گەزمەکە کردو لە دڵی خۆیدا گوتی:

"خودایا، ئەم پیاوە چی لەو ژنە دەویست‌و بۆچی دووی کەوت؟" چونکە نیگەران بوو بوو، ئەویش لە دوای ئەوانەوە چوو بۆ ڕاڕەوکە،و خۆی لە سوچێك دا مەلاس داو گوێی هەڵخست. کابرای گەزمە لە دەرێی دادگادا، پێشی لە ژنە گرتبوو و دەیگوت:

"دایکە، بەڕاستی بێچوە بەرازێکی قەڵەوت هەیە! من ئامادەم لێتی بکڕم! فەرموو ئەمە هەشت پنس‌و بەرازەکەم وێدە!"

"هەشت پنس؟ ئەوە بەڕاستتە، دەترسم گاڵتە بکەی. من بە خۆم بە سێ شلینگ و هەشت پنس-م کڕیوە. پارەی خۆت بۆ خۆت، من فرۆشیار نیم!"

"دایکە، مەگەر بیرت چوو کە لە مەحزەری دادگادا سوێندت خوارد ئەم بێچووە بەرازە هەر بایی هەشت پنسە. ئەگەر لە قسەکەت پەشیمانی بۆ دادگات دەبەمەوە... ئیدی بە خۆت دەزانی کە منداڵەکە لە سێدارە دەدەن."

"نا، نا، حەزناکەم گوێم لە باسی سێدارەو ئیعدام ببێ، زۆر چاکە، کە شتەکە وای لێهات کوا هەشت پنسەکەم وێدەو بێچوە بەرازی خۆت بەرە، حەز دەکەم بە خۆشی یەخەمان لە یەخەی یەك ببێتەوە."

ژنە بە چاوانی تەژی روندکەوە ملی رێگای گرت و رۆیی. مایڵز هندن، بە هەشتاو خۆی بە دادگادا کردەوە، گەزمەکە پاش ئەوەی بەرازەکەی لە شوێنێکی ئەمیندا کە هەر خۆی پێی دەزانی تاقەت کرد، بۆ دادگا گەڕایەوە. قازی هەمدیس چەند دێڕێکی لە فایلەکەدا نووسی و ئەوجا رووی کردە ئیدوارد تودورو بە دەنگێکی باوکانە پێی گوت کە ناچارە، هەر بۆ رێزو حورمەتی یاسا بە چەند رۆژ زیندانی و دوانزە جەڵدە بە بەرچاوی خەڵکییەوە حوکمی بدات.

شازادە کە تەواو حەپەسا بوو، دەمی کردەوەو لەوە دەچوو بیەوێ ئەمر بدات کە یەکسەر قازی سەر بڕن، لێ کە چاوی بە مایلز هندن کەوت و بینی هاوڕێکەی بە ئیشارەتێن نائومێدانە داوای بێدەنگی لێدەکات، ناچار بێدەنگ بوو.

مایلز هندن دەستی گرت و لە دوای گەزمەکەوە بەرەو زندان رۆیی. هەر کە گەیشتنە ناو کۆڵانەکان، شازادە دەستی راپسکاندو لە دەستی مایلز هندنی دەرهێناو بەوپەڕی تووڕەیی هاواری کرد:

"ئەحمەق، ئەوە ئەقڵە بۆ تۆ کە من زندوو بمو بە پێی خۆم بۆ زندان بڕۆم؟"

مایڵز هندن، بەوپەڕی زبری وەڵامی دایەوەو گوتی:

"تو ئەو خوایە، تۆ بە من پشت گەرم بەو هەقت نەبێ، بێدەنگ بە! تۆ بەم بۆڵە بۆڵە کارەکەت خراپتر دەکەی. ئێستا هیچ چارێکت نیە جگە لەوەی خۆت بەقەزاو قەدەر بسپێری و مل بۆ ویست و ئیرادەی خوا بدەی. تۆ ناتوانی رێ لە ویستی خوا بگریت، یان ئەنجامی مقەدەر دوا بخەی. واز بێنە ئەوەی لە چارەت نووسراوە بێتە پێشێ و رۆژگار ئەسپی خۆی تاو بدات، ئەوسا نۆرەی خۆشحاڵی، یان جنێوو گلەیی تۆش دێت!"

((٢٤))

## هەلاتن

رۆژگاری زستان کورتن، بۆیە زۆری پێنەچوو کە شەو داهات. کوچەو کۆڵانەکان نیمچە چۆڵ بوون. تاك و تەرا رێبواران، بێئەوەی ئاور بدەنەوەو تەمەشایەکی ئەو دوو هاوڕێ کلۆڵەو گەزمەکە بکەن، بە هەشتاو بەرەو ماڵی خۆ دەڕۆییشتن تا خۆ لەو بایە ساردو تەزییە کە دەگەڵ دەستپێکی شەودا هەڵی کردبوو، دەرباز بکەن. ئیدوارد تودور بەدەم رێوە بیری دەکردەوەو لە دڵی خۆیدا

دەیگوت: "بێگومان تا ئێستا روی نەداوە پاشایەك بەرەو زیندان ببرێ‌و میللەتەکەی بەم خەمساردی‌و بێ موبالاتیە بەلایا تێبپەڕن! بێگومان ئەمە یەکەمجارە شتی وا روو بدات!"

یارۆی گەزمە (حەسحەس) بەرەو مەیدانی بازاڕ دەڕۆیی. کە گەییشتنە ناوەندی مەیدان، مایلز هندن دەستی خستە سەر شانی‌و گوتی:

"هاوڕێ، کەمێك بوەستە! ئێستا کەس لەم ناوە نیە، دەمەوێ شتێکت عەرزبکەم."

گەزمەکە گوتی:

"من ماق ئەوەم نیە قسە دەگەڵ تۆدا بکەم. ئەدی نازانی من ئێستا لەسەر کارم؟ ماتەڵم مەکەن‌و خێرا بە دووما وەرن. دنیا خەریکە تاریك دەبێت."

"قەیدی نیە. قسەکەم پەیوەندی بە تۆوە هەیە. تکات لێدەکەم پشتمان تێبکەو وا بزانە هیچ شتێك نابینی، خۆت لە گێلی بدە، وازبێنە با ئەم منداڵە کلۆڵە هەڵێ."

"چۆن؟ یانی تۆ زات دەکەی شتی وا بە من بڵێی؟ دەتەوێ تۆش بگرم؟"

"تکایە لە کەری شەیتان وەرە خوارێ‌و قسەی فەرمی مەکە!"

ئەوجا دەنگی نزمتر کردو گوتی:

"باشە تۆ لە بیرت چوو کە ئێستا ئەو ژنە داماوەت ناچار کرد بە پارەیەکی زۆر کەم، بە هەشت پنس بەرازەکەیت پێ بفرۆشێت؟ خۆ ئەگەر من بچم ئەمە بە دادگا بڵێم‌و شکاتت لێبکەم، تۆش لە سێدارە دەدەن!"

یارۆی گەزمە بۆ چەند چرکەیەك لە جێی خۆی وشك بوو، لە سەرسامیا دەمی داچەقی. ئەوسا ئاسایی بووەوەو دەستی بە جنێودان‌و بۆڵەبۆڵ کرد. مایلز هندن کەمێك سەبری کرد تا توڕەییەکەی نیشتەوە، ئەوجا بە هەمان نەرمی‌و سادەیی گوتی:

"هاوڕێ، من دڵم بە حاڵی تۆ دەسووتێ‌و نامەوێ خوا نەکەران شتێکی ناخۆشت بەسەر بێت. بەڵام ئەوە بزانە کە من گوێم لە هەموو قسەکانت بوو کە لە ڕاڕەوی دادگادا دەگەڵ ژنەکەدا کردت‌و بە چاوی خۆم دیتم کە هەشت پنست پێی داو بە خورتی بەرازەکەت لێی کڕی. ئایا ڕاست دەکەم یان نا؟"

"نا، من گاڵتەم دەگەڵ ئەو ژنەدا کرد."

"یانی ئەو بەرازە کۆرپەیەت بە گاڵتە لای خۆت گل داوەتەوە؟"

"بێگومان."

"زۆر چاکە، کەواتە من دەچم قازی‌و دادگا لە چەندو چوونی ئەو گاڵتەیە ئاگادار دەکەمەوە. قازی پیاوێکی بە ئەزموون‌و دنیا دیدەو لێزانە و هەڵبەتە ناشێت ئەم جۆرە گاڵتە خۆشانەی لێ بشاردرێتەوە. ئێوە لێرە بوەستن، من هەر ئێستا دەگەڕێمەوە."

مایلز هندن، بە هەنگاوی هەڕاو بەرەو دادگا دەڕۆیی، لێ یارۆی گەزمە پاش هەندێك ڕاراییی‌و دوو دڵی بانگی کردو گوتی:

"کاکۆ، سەبرکە. قازی پیاوێکی وشكو ساردو سڕەو ئەم گاڵتانەی بە مێشکا ناچیٚ. بگەڕێوە با زیاتر قسان بکەین. منی بەدبەختی خودان عەیال تازە بۆم دەردەکەویٚ کە چ قوڕێکم بۆ خۆ گرتووەتەوە. وەرە ڕێكو ڕاست پێم بڵیٚ بزانم تۆ چیت لە من دەویٚ؟"

"من تەنیا ئەوەندەم دەویٚ کە تۆ رووی خۆت وەربگێڕیو چاوت بنوقێنیو هێدی هێدی لە یەکەوە تا هەزار بژمێری".

"ئەی بابە، مەگەر شێتی؟ لەسەر گاڵتەیەکی چکۆلەو ئاسایی کە دەگەڵ ئەو ژنەم کردووە دەتەویٚ ماڵ وێرانم بکەی؟"

مایلز هندن، بە دەنگێکی ساردو زبر گوتی:

"بەڵیٚ، گاڵتەیەکی بچووك کە دەشێت گران لەسەرت بکەویٚ."

"چۆن؟"

"بۆ نموونە ببێتە مایەی تیا چوونت."

"ئەی بابا!"

"بەڵیٚ، ئەدی چی؟ تۆ کەسێکی ناچارت بەگیرهێناوەو بەخورتی وادارت کردووە کە ماڵەکەیت بە پارەیەکی ناچیز پیٚ بفرۆشێت، و لە کاتی ئەنجامدانی وەزیفەدا خیانەتت بە قانونو مەقامی خۆت کردووە.".

"کاکۆ، تکایە رەحمم پێدا بکە. باوەڕ بکە لاقم دەلەرزن.چ بکەم، لەوە دەچیٚ ناچار بم سازشت دەگەڵ بکەم!"

"زۆر چاکە، خەریکە ئاقڵ دەبیت. جا من تکایەکی تریشم لە تۆ هەیە، بەڵکو یەکسەر ئەو بەرازە کۆرپەیە دەدەیتەوە بە خاوەنەکەیو پارەکەتی لێوەربگرەوە."

"بە چاوان، بە چاوان، بەڵێن بیٚ ئەو کارە بکەم. وەعدی پیاو بیٚ کە ئەگەر فریشتەیەکیش لەو ئاسمانەوە بەرازە کۆرپەیەکم بۆ بنێریٚ وەری نەگرمو دەستی تێوە نەدەم. من دەڵێم کە ئێوە دەرگای زندانەکەتان شکاندووەو زندانیەکەتان بە خورتی رفاندووە. دەرگای زندانەکەش کۆنو رزیوەو خۆم دەتوانم تا سبەی بەیانی بیشکێنم."

هندن گوتی:

"جا تۆش دڵنیابە کە هیچ ئاسیوێکت ناگاتیٚ. قازی بە خۆیشی دڵی بە حاڵی ئەم منداڵە سووتا بوو، و رەفتاری دەگەڵیا تەواو باوکانە بوو. دڵنیام کە هەواڵەکەی پیٚ بگات نەك هەر هیچ بە تۆ ناڵێت، بەڵکو لە دڵیشەوە خۆشحاڵ دەبێتو دوعای خێرت بۆ دەکات کە رێگەت داوە بۆ خۆی بڕوات."

## ((٢٥))

## هندن هول

هەرکە جووتە هاوڕێی گیانی بە گیانی ماوەیەك لە یارۆی گەزمە دوور کەوتنەوە، مایلز هندن رووی کردە شازادەو گوتی:

"تۆ بڕۆ لە دەرێی گوندی، لەسەر جادەکە چاوەڕوانم بکە، تا من بڕۆم هەق‌و حیسابی میوانخانەکە بدەم‌و بێمەوە."

دوای نیو سەعاتێك، ئیدوارد تودورو فریاڕەسەکەی، بە سواری دوو ولاّخ، شادو دڵخۆش بەرەو رۆژ هەلاّت دەڕۆییشتن. مایلز هندن سواری قاترێك‌و شازادە سواری کەرێك بوو کە هاوڕێکەی بۆی پەیدا کرد بوو. شازادە گەرمی بوو بووەوەو جلە کۆن‌و شڕەکانی خۆی لەبەر نەبوو، چونکە فرێی دا بوون‌و ئەو بەدلە نیو داشتەی لەبەر بوو کە هاوڕێکەی لە لەندەن بۆی کڕی بوو.

مایڵز هندن بەدەم رێگاوە لەفکران ڕاچوو بوو و لە دڵی خۆیدا دەیگوت: "نابێ ئەم منداڵە بێ گوناحە ماندوو بکەم. بەلای کەمەوە دەبێ رۆژی سێ جاران ئیسراحەت بکات، ئەمە جگە لەوەی دەبێ تێر خەویش بێت. بێگومان ژیانێکی ئاسایی‌و ئارام‌و بێ کێشەو سەریەشە لەگینە لەم نەخۆشییە دەروونیەی رزگار بکات‌و شیفای بدات. ئێمە دەبێ قۆناغ بە قۆناغ بڕۆین‌و ئیسراحەت کردنمان لە رێکردنمان زۆرتر بێت. هەرچەندە من بەو شێوەیە درەنگ دەگەمەوە نیشتمانە ئازیزەکەم، بەلاّم چارنیە!"

دوای قۆناغە رێیەکی دە میلی گەییشتنە باژێرۆکێك‌و لە میوانخانەیەك لایاندا. لەوێ هەردوو هاوڕێ رۆڵە ئەسڵیەکەی خۆیان وەرگرتەوە، یانی کوڕیژگەکە بووەوە بە شاو بە کەش‌و فشەوە لە پشت مێزی نانخواردن دانیشت‌و مایڵز هندن-ش دەست لە سەر سینگ لە پشتییەوە ئامادەی خزمەتگوزاری بوو. پاش شێوی ئێواری مایڵز هندن پاشای چکۆلەی بردە ژووری نووستن‌و جلەکانی لەبەر داکەند، پاش ئەوەی ئەوی خەواند، خۆیشی لێفەیەکی بە خۆداداو لەبەر دەرگای ژوورەکەدا راکشا.

سبەی و دوو سبەیش هەر بەڕێوەبوون. بەدەم رێگاوە قسەیان دەکردو پێدەکەنین‌و بەسەرهاتی ئەو رۆژانەیان بۆ یەکدی دەگێڕایەوە کە لێکدی دابڕابوون.

لە دوا رۆژی سەفەرەکەیاندا، کە مایڵز هندن لە زاگەو نیشتمانە ئازیزەکەی نزیك بوو بووەوە، یەکجار خۆشحاڵ بوو و هەر قسەی دەکردو دەمی لێك نەدەنا. مایڵز بەردەوام وەسفی بابە پیرەکەی‌و (ئارتەر)ی برا گەورەی دەکردو نموونەی جوامێری‌و کەرەم‌و دلاّوایی‌و نەفسبەرزی‌و نەجابەتی ئەوانی دەگێڕایەوە. بەدەم قسە کردنەوە ئەوەندە شادو شەنگوڵ بوو کە چەند جارێکیش ئامارژەی بۆ ڤیان‌و ئەویندارى خۆی دەرهەق بە( لەیدی ئەدیت) کردو تەنانەت دەربارەی (هیو)ی برا بچووکیشی لە سنووری ئەدەب‌و نەزاکەتی نەبەزاند. ئەم گەڕانەوەیە بۆ زێدو نیشتمان، بۆ مایڵز هندن، دوای ئەو هەموو دوورییە یەجگار خۆش بوو، و لەو بارەیەوە دەیگوت:

"ئەگەر دەبینی چەند بە دیتنی من خۆشحاڵ دەبن! من لێرەوە هەست بە ڕادەی خۆشی‌و شادیان دەکەم‌و وا لە بەرچاوەمە کە چۆن سوپاس‌و ستایشی خودا دەکەن!"

ئەو شوێنەی کە جووتە هاوڕێ پێیدا تێدەپەڕین، یەکجار دەڤەرێکی جوان‌و خۆش‌و دڵگیر بوو. تا چاو بڕی دەکرد لە هەموو لایەکەوە هەر خانووی هاوینەی دڵگیرو باخچەێن رێك‌و پێك‌و سەوزو چیمەنی بەربلاّوو بە دیمەن بوو کە بەدەم شەپۆلی سازگاری باوە دەکەوتنە کەروێشکەو

شەپۆلدان، و شەپۆلی دەریایان وەبیر پیاو دێنایەوە. لە نیوەڕۆ بە دواوە مایلز هندن چەندین جار لە جادەکە لایداو بە گردۆلکە سەر سەوز خۆشەکانی ئەم بەرو ئەوبەری جادەکەدا هەڵگەڕا تا بەڵکو لە دوورەوە چاوی بە دیتنی زێدو زاگەکەی خۆی روون ببێتەوە. ئەنجام بەو ئاواتە گەیی و هاوڕێکەی گازکردو گوتی:

"خاوەنشکۆ، بفەرموو تەماشا بکە! ئەوە گوندەکەمانە کە لێرەوە دیارە. ئەمە ئەو (هندن هول)ەیە عەرزم کردیت. هۆوە بورجەکانی قەڵایەو، باخەکەی بابم لە خوارەوەیدایە. خانووەکەی بابم لە ناو ئەم باخەدایە. هەفتا ژووری تیایە، و بیست و حەوت خزمەتکار خزمەتی تیادەکەن. ئەلهەقی ئەم خانوو و باخە شایستەی بنەماڵەی ئێمەیە. وا نیە ئەزبەنی؟"

خێرا باژۆ بازوو بگەین، باوەڕ بکە تەواو بێ سەبر بووم!"

بە دوو قۆڵی درێژەیان بە رێگای خۆدا، وتا هێزی بزووتن لە وڵاخەکانیاندا بە گوڕ بوو، تاویان دان. ئەنجام دوای سێ سەعاتە رێ خۆیان بە ئاواییدا کرد. مایلز هندن هەموو شوێنەکانی بە شازادە نیشان دەداو دەیگوت:

"ئێرە کڵێسایە. تەمەشا! هێشتا دەرو دیوارەکەی بە گوڵی لاولاو پۆشراوە. هۆوە ئوتێلی شێری سوورە. ئەوێ مەیدانی بازاڕە... هۆ وەش درەختی مانگی ئایارە... ئەوێ سەرچاوەیە... بەڕاستی سەیرە! من دە ساڵە لێرە دوورم، بە درێژایی ئەو دە ساڵە هیچ شتێك نەگۆڕاوە، تەنیا خەڵکەکە گۆڕاون. هەڵبەتە من هەندێ لە خەڵکەکە دەناسمەوە، بەڵام ئەوان بە هیچ جۆرێ نازانن من کێم!".

جووتە رێبوار پاش ئەوەی بەناو ئاواییدا ڕەت بوون، بە باریکە رێیەکی پێچاو پێچدا، کە ئەم بەرو ئەوبەری پەرژین بوو، کەوتنە رێ. نیو میلێکی دیکەیان تەی کردو گەیینە دەروازەیەکی گەورە کە ناونیشانی خانەوادەییان لەسەر پایە بەردینەکانی نەخشاندبوو. هەردووکیان لەو دەروازەیەوە خۆیان وە باخێکی گەورەو خۆشدا کردو کۆشکێکی گەورەیان لەبەردەم خۆدا بینی. مایلز هندن روویکردە ئیدواردو گوتی:

"خاوەنشکۆ، خێرهاتی! پێ و قدومتان موبارەك بێ! ئاه... بەڕاستی رۆژێکی خۆش و گەورەیە. هەڵبەتە لە سەرەتاوە، باوکم و براکەم و لەیدی ئەدیت، تەنیا سەیری من دەکەن، بەڵام تۆ گوێ مەدەیە، چونکە هەرکە زانیان تۆ لە ژێر باڵی منداڵ و من زۆرم خۆش دەوێی، هەنگێ لە ئامێزت دەگرن و بە گەرمی خێرهاتنت دەکەن و پێت دەڵێن ماڵ ماڵی خۆتە. پێت دەڵێن کە ئەم ماڵە لە ئەمڕۆوە تا ئەو رۆژەی حەز دەکەی لە خزمەتی تۆدا دەبێ و کەس لە ئاستی تۆدا خاوەن ماڵ نیە!".

دوای تۆزێك مایلز هندن خۆی لەسەر قاترەکەوە هەڵدایە خوارێ و یارمەتی شازادەشی داو دای بەزاند. ئەوجا دەستی گرت و بە هەشتاو دەگەڵ خۆیدا بردییە ناو کۆشکەکەوە. لە نێو کۆشکەکەدا، مایلز هندن دەرگای یەکێك لە ژوورەکانی خستە سەر گازی پشت و بێ هیچ هەڵوەستەیەك شازادەی لەسەر کورسیەکی دەسکداری گەورە دانیشاند، ئەوسا بەرەو رووی

گەنجێك كە لەبەر ئاگری سۆپایەكی داری دانیشتبوو و مژولی نووستن بوو باڵی گرتو هاواری كرد:

"هیو، هەستە، لە باوەشم بگرەو بڵێ كە بە گەڕانەوەت خۆشحاڵم. ئەوجا بڕۆ خەبەر بۆ بابم ببەو بۆ ئێرەی بێنە ئەگینا بەبێ ئەو شادی و خۆشیەكەم نوقستان دەبێ. من دەمەوێ دەستی بابم بگوشمو دەموچاوی بدینمو دەنگی بژنەوم!"

لێ هیو نەك هەر لە باوەشی نەگرت، بەڵكو لە سەرەتاوە بە قیافەت و هەیئەتێكی ساردو گرژەوە خۆی دایە لاوەو ئەوسا بە كونجكاوییەكی بەزەیی ئامێزەوە، ئەبڵەقو حەپەساو لە سەراپای مایڵز هندنی روانیو ئەوسا بە دەنگێكی نەرمو هێمن گوتی:

"پێم وا نیە تەواو بیت، لەوە ناچێ هۆشو حەواست لە جێی خۆی بێت. بە جلو بەرگەكەشت دا وای دەبینم كە دەبێ ناخۆشیو نامرادیو هەژاریەكی زۆرت بەسەر هاتبێ. ببورە تۆ من بەكێ تێ گەییوی؟"

"بە كێت تێ گەییووم؟ عەجایەب! ئەمە چ پرسیارێكە؟ هەڵبەتە بەكەست تێ نەگەییووم. مەگەر تۆ هیو هندن نیت؟"

"ئێ باشە، ئەدی تۆ كێی؟"

"یانی دەتەوێ بڵێی (مایلز هندن)ی برات ناناسیتەوە؟"

بزەیەكی تاڵ رووی گرژی (هیو هندن)ی كردەوە، هیو هاوارێكی كردو گوتی: "بەڕاست؟ گاڵتە ناكەی؟ باشە لەگینە مردووان زندوو ببنەوە؟ ئەگەر وابێ دەبێ لە كانگەی دڵەوە مەمنونی قاپی خودابم، ئایا راستە كە خوا برا داماوەكەمانی، مایلزی، دوای چەندین ساڵ بۆ گەڕانبینەوە؟ نا، نا باوەڕ ناكەم، ئەمە راست نیە. توخوا وازبێنە، پێم رامەبویرە! ئادەی وەرە بەر روناكییەكە تا بەباشی تەمەشات بكەم!".

هیو، سەری قۆڵی مایلزی گرت، رایكێشایە بەر پەنجەرەكەو لە سەراپای ورد بووەوە. مایڵز پێدەكەنیو دەیگوت:

"زۆر باشە، برا، كاری خۆت بكە، بە كەیفی دڵی خۆت لێم ورد ببەوە. ئایا من هەمان مایڵزەكەی برات نیم؟ ئاه... ئاه... چ رۆژێكی خۆشە. هیو، برا ئازیزەكەم، دەست بێنە تەوقەم دەگەڵ بكە، رووت بێنە پێشێ با ماچت بكەم. بە زاتی خوا خەریكە لە خۆشی دیداری ئێوە شا مەرگ دەبم!".

كە جارێكی دی باوەشی بۆ براكەی گرتەوە، هیو بە شێوەیەكی وشكو ناشیرین دایە دواوە، ئەوجا سەری داخستو بە دەنگێكی شپرزەو لەرزۆك گوتی:

"بڕۆ، بڕۆ، خوا لەم فێڵو تەڵەكەیەم بە دوور بكات!"

مایڵز كە لەم رەفتارەی براكەی سەرسامو ناڕەحەت بوو بوو لە سەرەتاوە بێدەنگ بوو، لێ پاشان بە هەمان هێمنی پێشوو لەسەری رۆییو گوتی:

"فێڵی چی؟ و تەڵەكەی چی؟ مەگەر من برای تۆ نیم؟"

"مخابن. نا. من بچووكترین لێكچوون لە نێوان تۆو مایڵزدا نابینم. ئێستا بۆم بە دیاركەوتووە كە ئەو نامەیە فریوی نەدابووین."

"کام نامە؟"

"شەش حەوت ساڵێك لەمەپێش نامەیەکمان پێگەیی دەڵێت کە برایەکەمان لە یەکێك لە شەڕەکاندا کوژراوە."

"کوڕە بۆ خاتری خوا، ئەمە درۆیەکی رووتە! بڕۆ بابم ئاگادار بکەوە، ئەو یەکسەر دەمناسێتەوە!".

"مخابن، مردوو، ناتوانێ شایەدی بدات."

"چی؟ بابم مردووە؟ ئاه... حەیفێ! دەبوایە بە مەزەندە بمزانیبا. ئەم چاوە ڕەشەشم کاڵ بووەوە! باشە کە بابم مردووە بڕۆ (ئارتەر)ی برام ئاگادار بکەوە. ئەو نەك هەر دەمناسێتەوە بەڵکو دڵخۆشیشم دەداتەوە."

"ئەویش مردووە."

"ئەویش مردووە؟ وایش، کە پیاوێکی بێ بەختو چارە ڕەشم. خودایا، ئەمە چ حاڵێکە؟ بۆچی هەمیشە خەڵکانی باش تیا دەچن؟ باشە، هیو تکات لێدەکەم باسی لەیدی ئەدیت-م بۆ بکە. ناشی بڵێی ئەویش مردووە؟"

"نا، ئەو زندووە."

"شوکر بۆ خوا. ئاقیبەت دەرکەوت کە شتێك بۆ من ماوەتەوەو شادیو بەختەوەریم بە تەواوەتی لە دەست نەچووە. بڕۆ برا، بڕۆ ئەو ئاگادار بکەوە. ئەگەر ئەو گوتی من مایڵز هندن نیم، قەبووڵمە. لێ ئەسەح ئەو دەمناسێتەوە. خێرا بڕۆ خەبەر بەو بدە، خزمەتکارە پیرەکانیشمان ئاگادار بکەوە. بێگومان ئەوان منیان لە بیر نەکردووەو دەمناسنەوە."

"تەنیا پێنج کەسیان ماونەتەوە."

هیو دوای ئەو قسەیە لە ژوورەکە وەدەرکەوت. مایڵز بۆ چەند ساتێك نقومی گێژاوی بیرە تاڵەکانی خۆی بوو، ئەوجا بە پانیو درێژی ژوورەکەدا کەوتە هاتوچۆ، لە بن لێوانەوە گوتی:

"سەیرە! بەڕاستی سەیرە! ئێمە بیستو حەوت خزمەتکارمان هەبوو، و ئێستا تەنیا پێنجیان ماونەتەوە. دیارە ئەو پێنجەش هەر خوێڕیو بێ شەرەفەکانی ئەو جماعەتەن".

شازادە کە لە سەرەتای دەستپێکی ئەم دیمەنەوە بینی بووی کەس گوێی ناداتێ، لە پڕ هاتە قسەو گوتی:

"هاوڕێ، دڵ لە دڵ مەدە. لەم دنیایەدا هەر تۆ هەق خوراونیت، هەر تۆ گومان لە بوونو مانات نەکراوە!"

مایڵز هندن هاواری کردو گوتی:

"وای خاوەنشکۆ! تۆش گومانم لێدەکەی؟ بە زاتی خودا من کلاوچیو درۆزن نیم. دڵنیابە کە ئێستا لە حوزوری تۆدا راستگۆترین بەشەری ئینگلیستان شایەتیم بۆ دەدات. ئاخر ئەگەر من کلاوچیو درۆزن بام لە کوێ دەمتوانی ئەم ماڵەو ئەم باخەو ئەم دەرودیوارو ئەم وێنانەو ئەم هەموو شتانە بناسمەوە. من لێرەدا لە دایك بووم، تەمەنی لاویم لەم ماڵەدا قەتاندووە. نەخێر،

خاوەنشکۆ، من تۆ ناخەڵەتێنم و ئەگەر یەکێکی دیکەش باوەڕی پێنەکردم، تکات لێدەکەم بەلای کەمەوە تۆم باوەڕم پێ بفەرموو! بەلای کەمەوە تۆ باوەڕم پێبکە!"

ئیدوارد تودور، بە هەمان سەفاو سادەیی منداڵانەی خۆی گوتی:

"من گومانم لە قسەکانی تۆ نیەو باوەڕی تەواوم پێت هەیە."

مایڵز بە خۆشی و شادییەکی لە رادەبەدەر گوتی:

"ئاه... خاوەنشکۆ، یەك دنیا مەمنوونم."

ئیدوارد دیسان گوتی:

"ئەدی تۆ؟ ئایا تۆ باوەڕ بە قسەکانی من دەکەی؟"

مایڵز هندن، کە گوێی لەو پرسیارە بوو رەنگی سوور هەڵگەڕا، دەیویست هەر چۆنێ بووە وەڵامێکی هاوڕێکەی بداتەوە، کە لە ناکاو دەرگاکە ڤەبوو، و لەو هەڵوێستە دژوارە رزگار بوو. ژنێکی یەجگار جوان و خشیك کە جلێکی زۆر جوانی لەبەر بوو وەژوورکەوت، لە دوای ئەوەوە هیوو چەند خزمەتکارێك کە هەر هەموویان جلی یەك شێوەیان لەبەردا بوو، وەژوورکەوتن. خانم بەلەنجەولار چاوی بڕی بووە عەردی ژوورەکە، شوێنەواری خەم و پەژارەیەکی نهێنی بە سیمایەوە دەبینرا. مایڵز هندن هەرکە چاوی پێکەوت، گورجێ راپەڕی و بەرەو پیری چوو، و هاواری کردو گوتی:

"ئاه... ئەدیت-ی ئازیزم، مەحبوبی دلۆڤانم!"

لێ هیو، دەستی هەڵبڕی و پێشی گرت، ئەوسا رووی کردە خانم و گوتی:

"باش تەمەشای ئەم پیاوە بکە! ئایا دەیناسیت؟"

خانمی نازدار هەوەڵجار کە گوێی لە دەنگی مایڵز بوو، ڕاچڵەکی، دڵی کەوتە لێدان و دەموچاوی سوور هەڵگەڕا، بەڵام ئێستا دەلەرزی. بەلەنگازە ماوەیەکی زۆر جوڵەی نەکرد، ئەوجا سەری هەڵبڕی و نیگایەکی وشك و پەژمردەی سەروچاوی مایڵزی کرد. ئەنجام لە حاڵێکا کە رەنگی بوو بوو بە جاوی سپی، بە ئەسپایی و لە بن لێوانەوە گوتی:

"نەخێر، من نایناسم."

ئەوسا دەنگی گریانی بەرز بووەوەو بە هەنگاوی لەرزۆکەوە بەرەو دەرگا رۆیی. مایڵز هندن لە داخا خۆی بە کۆڵی کورسیەکی دەسکداردا داو تا ماوەیەك دەموچاوی لە نێو هەردوو دەستیا شاردەوە. دوای بێدەنگیەکی زۆر، هیو رووی کردە خزمەکارەکانی خۆی و گوتی:

"ئێوەش بەشی خۆتان تەمەشاتان کرد. بڵێن بزانم دەیناسن؟"

هەموو سەریان بادا کە نەخێر. هیو ئاوڕی لای مایڵزی دایەوەو گوتی:

"خزمەکارەکانم ناتناسن. بۆیە پێم وایە دەبێ بەدحاڵی بوونێکت بۆ پێشهاتبێ. ئەمە جگە لەوەی... وەکو خۆت دیتت، ژنەکەشم تۆی نەناسییەوە."

مایڵز نەڕەیەکی کردو گوتی: "ژنی تۆ؟"

مایڵز هەر هەستاو قورتمی (هیو)ی گرت و گوتی:

"ئاه... نەگبەت! ئێستا پەی بە کەڵەکبازی‌و دەسیسەکانت دەبەم. ئەو نامەیەی کەباست کرد خۆت نووسیوتەو بە پشتیوانی ئەو نامەیە دەزگیرانە ئازیزەکەم‌و سەروەت‌و سامانەکەت دزیوم. بڕۆ گوم بە لەبەر چاوم، بڕۆ تا شەرەفی سەربازی خۆم بە کوشتنی قەرەقۆزێکی وەکو تۆ لەکەدار نەکەم، بڕۆ گوم بە لەبەر چاوم!"

هیو کە خەریك بوو دەخنکا خۆی بەسەر کورسیەکدا داو فەرمانی بەخزمەتکارەکانی دا کە یەکسەر مایڵز بگرن‌و قۆڵبەستی بکەن. خزمەتکارەکان سڵەمینەوەو یەکێکیان گوتی:

"ئاخر، سێرهیو، ئەو شمشێری پێیەو ئێمە بێ چەکین."

هیو گوتی:

"جا چیە، ئێوە پێنج کەسن‌و ئەو بە تەنیایە. پێتان دەڵێم بیگرن."

مایڵز لە خزمەکارەکان چووە پێشێ‌و گوتی:

"ئێوە زۆر دەمێکە من دەناسن، وا نیە؟ من هەر مایڵزەکەی جارانم‌و نەگۆڕاوم، فەرموو ئەگەر پیاون پەلامارم بدەن!"

خزمەکارەکان نەك هەر پەلاماریان نەدا، بەڵکو شەقاوێکیش هاتنە دواوە.

هیو هاواری بەسەردا کردن‌و گوتی:

"هەی نامەردینە، هەی ترسنۆکینە، کەواتە بڕۆن چەك هەڵگرن‌و بەر دەرگاکانی دەرەوە بگرن، تا دەنێرم بە دووی دوو سێ گەزمەدا."

هیو، دوای ئەم هەڕەشەیە بەرەو دەرگا رۆیی. لەناو دەرگاکەوە ئاوڕی دایەوەو بە مایڵزی گوت:

"هەڵبەتە من بۆ خوا پێت دەڵێم کە هەڵێ، دەنا خۆت دەزانی؟"

مایڵز گوتی:

"من هەڵێم؟ خاترجەم بە کە ناڕەقم. من خاوەن‌و ئاغای ئێرەم‌و بەجێی ناهێڵم. تۆش لەمە دڵنیابە!"

((٢٦))

## دەرکراو

لەماوەی ئەو چەند دەقیقەیەدا شازادە بیری دەکردەوە. ئەنجام سەری هەڵبڕی‌و گوتی:

"بەڕاستی زۆر سەیرە! من لەمە حاڵی نابم."

مایڵز گوتی:

"نەخێر خاوەنشکۆ، زۆریش سەیر نیە. من لە منداڵیەوە هیو دەناسم. هەمیشە بەشەرێکی هیچ‌و پووچ بووەو بۆیە ئەم رەفتارەی ئەمڕۆی زۆر ئاساییە."

"سێر مایڵز، من مەبەستم تۆو براکەتان نەبوو. شتێکی دیکەم مەبەست بوو."

"مەبەستت ئێمە نەبوو؟ ئەدی چ شتێك بەلای خاوەنشکۆتانەوە سەیر بوو."

"سەیرم لەمە دێ کە دیار نەمانی پاشا تا ئێستا هیچ جۆرە دەنگدانەوەیەکی نەبووە."

"ئەزبەنی لە مەبەستت تێناگەم".

"بەڕاست؟ ئایا بەڕای تۆ ئەمە سەیر نیە کە بۆچی تا نهو قاسیدانی دەرباریو مامورانی دەوڵەتی، سەرانسەری وڵاتیان بە دووی پاشای گوم بووی خۆدا نەداوەتە ژێر پێوە؟ ئایا دیارنەمانی پاشای مەملەکەتێکی گەورەو گران بەڕای تۆ گرینگ نیە؟"

"ئەزبەنی، ببورە، من هیچ ئەم شتەم لە یاد نەبوو. هەق بە جەنابتە."

ئەوجا لەدڵی خۆیدا گوتی:

"بەستەزمانە، هێشتا بەو خەیاڵ پڵاوە دەژی!"

شازادە، درێژەی پێداو گوتی:

"من نەخشەیەکم کێشاوە، پێموایە بۆ هەردووکمان زۆر باش دەبێت. واچاکە نامەیەك بە هەر سێ زمانی لاتینیو یونانیو ئینگیزی بنووسمو تۆ سبەی بەیانی بۆ لەندەنی ببەیتو بیگەیەنیتە دەستی خاڵە (لۆرد هرتفورد)م. هەڵبەتە دەبێ بیدەتە دەست خۆی، نابێ بە هیچ کەسێکی دیکەی بدەی. یەکسەر دەستخەتەکەم دەناسێتەوەو بە دووما دەنێرێت."

"خاوەنشکۆ، ئایا باشتر نیە جارێ سەبرێ بکەین تا من لێرە هەقو هقوقی خۆم یەك لایی بکەمەوە؟ بێگومان ئەوسا یەك دڵ دەبمو بە دڵێکی خۆشترو ورەیەکی بەرزترەوە ماموریەتەکەی خاوەنشکۆتان جێبەجێ دەکەمو..."

لێ شازادە قسەکەی پێ بڕیو بە دەنگێکی ئامیرانە تێی خوڕیو گوتی:

"بێدەنگ بە! هەقو هقوقو موڵكو بەرژەوەندیو داوای تۆ لە ئاستی بەرژەوەندیو هقوقی بێ چەندو چوونی مەملەکەتێكو لە ئاستی سەلامەتیو پاراستنی تەختو تاجی پاشادا دەکاتە چیْ!".

ئەوسا وەك بڵێی لە هەڵچوونو توڕە بوونەکەی خۆی کەمێك ژێوان بووبێتەوە. بە دەنگێکی نەرمتر گوتی:

"بەگوێم بکەو مەترسە. سەبارەت بە موڵكو ماڵو داراییەکانتان کارێکی وەها دەکەم تا دوا دیناری خۆت وەربگریتەوەو پاداشتی هەموو خزمەتەکانیشت دەدەمەوە."

ئەوسا، پەڕەموچێکی بەمەرەکەبدا کردو دەستی بە نووسینو کرد. هندن بەدەم تەمەشا کردنی ئەوەوە، بزەیەکی میهرو بەزەیی ئامێزی کەوتە سەر لێوانو لە دڵی خۆیدا دەیگوت:

"خودایا، چ سامو تواناو هەیبەتێکی هەیە! خۆ ئەگەر ژوورەکە تاریك باو بە چاوی خۆم نەمدیبا، وام خەیاڵ دەکرد، دەنگی قەڵەمی پاشایەکی راستەقینە لەسەر کاغەزەکە دەژنەوم. ئەم منداڵە چ خەیاڵێکی بە بڕشتی هەیە! بەلەنگازە ئێستا وا خەیاڵ دەکات کە بەڕاستی یونانی یان لاتینی دەنووسێت. خۆ ئەگەر بیانویەك نەدۆزمەوە کە ئەم خەیاڵەی لەسەر دەربکەم، ناچارم سبەینێ وا بنوێنم کە دەمەوێ بە سۆراخی ئیشەکەی ئەوەوە بۆ لەندەن بڕۆم."

مایڵز هندن، ئەوسا ئەو دیمەنەی وەبیر کەوتەوە کە چەند دەقیقەیەك لەمەپێش لە ژوورەکەدا رووی دابوو. لەم کاتەدا هەرکە شازادە نامەکەی بۆ درێژ کرد، بە جۆرێ لە هزرو بیرەکانی خۆیدا نقوم بوو بوو کە بێئەوەی سەیرێکی نامەکە بکات، قەدی کردو بە کەماڵی بێ موبالاتی لە بەرکی نا.

مایلز له بیری کارەکەی خۆیدا بوو و له دڵی خۆیدا دەیگوت:
"بەڕاستی سەیره! من ئەرخایەن بووم کە (ئەدیت) دەمناسێتەوە. بەڵام کە گوێی لە دەنگی من بوو ڕاچڵەکی، ئاخر چۆن دەبێ منی لە بیر چووبێتەوە؟ ئاخر چۆن دەشێت هەم دەنگی منو هەم قیافەتو بیچمی منی لە بیر چووبێتەوە؟ باشە کە لە دەنگی من ڕاچڵەکی، ئەدی چۆن گوتی کە من ناناسێت؟ خۆ کەسێکی درۆزن نەبوو. خودایا، ئێستا خەریکە لە شتەکە تێدەگەم. هیو، زۆری لێکردووەو ناچاری کردووە درۆبکات. خۆ بە ئاشکرا دیار بوو کە (لەیدی ئەدیت) لە ترسا خۆی بە پێوە نەدەگرت. ئێستا کە هیو چووەتە دەرێ فرسەتێکی باشە، وا چاکە بڕۆم بیدۆزمەوەو بیهێنمە قسە، دەمو دووی تاقی بکەمەوەو ئەگەر بیدینم دەتوانم کارێکی وا بکەم کە ڕاستی بڵێت. هەڵبەتە ڕۆژگاری منداڵیمانی وەبیر دێتەوەو ئەو ڕۆژانەی بیردەکەونەوە کە پێکڤە لە باخی کۆشکەکەدا گەمەمان دەکرد. بێگومان دڵی بە حاڵم دەسووتێ‌و چیتر خیانەتم لێناکات. ئەسەح گرێی دڵی خۆیم بۆ دەکاتەوەو ڕازەکانم پێدەڵێت. ئێمە جاران یەکترمان زۆر خۆش دەویست، چۆن دەشێت ئەو ڕۆژانەی فەرامۆش کردبێت؟"
مایڵز هندن، دوای ئەم بیرە گەشبینانە، بە هەشتاو بەرەو دەرگا ڕۆیی، هێشتا پێی نەنابووە ناو چوارچێوەی دەرگاکە، کە دەرگا کرایەوەو لەیدی ئەدیت وەژوورکەوت. ئەو خانمە جوانە ڕەنگ لە ڕوویا نەمابوو، دیار بوو وەکو ئەو چەند ساتەی پێشووتر تەواو خەمبارو خەمینە. دەگەڵ ئەوەشدا ماکێکی جدیەت لە سیمای خۆش‌و نەجیبی دا دەخوێنرایەوە.
مایڵز کە لە خۆشیاندا لە پێستی خۆی نەدەهێوری بەلەز بەرەو پیری چوو. ئەدیت، بە ئاماژەیەکی ئامیرانە لە جێی خۆی ڕایگرت. ئەوسا بە خۆی دانیشت، و داوای لەویش کرد کە لەلایەوە دانیشێت. (مایڵز هندن)ی بەلەنگاز وای هەست دەکرد کە لەوێدا میوانەو تەنانەت بۆ (ئەدیت)ش بێگانەیە، بۆیە لە دڵی خۆیدا دەیپرسی: "ئایا، لە سوعبەت دەرچێ، من بەڕاستی مایڵز هندن-م؟"
لەیدی ئەدیت هاتە قسەو گوتی:
"من هاتووم لە مەترسیەکی گەورەت ئاگادار بکەمەوە. هەڵبەتە تۆ هەقی خۆتە ئەو خەون‌و خەیاڵەت بەڕاست بزانی، لێ من ئامۆژگاریت دەکەم کە لەوەی پتر لێرە مەمێنەوە. بە تایبەتی کە لێکچوونێکی فرە لە نێوان تۆو ئەو ئازیزەمدا کە دەمێ ساڵە لە دەستم داوە، دەبینم‌و خۆ ئەگەر ئەو تا ئێستا مابا، خۆشەویست تریش دەبوو."
مایڵز هاوارێکی کردو گوتی:
"ئەی خودا، کچێ من هەمان ئەو کەسەم کە تۆ لە دەستت داوە، من پورزاکەی خۆتم!"
"پێم گوتیت تۆ هەقی خۆتە ئەو خەون‌و خەیاڵەی خۆت بەراست بزانیت، من گومانم لەمە نیە، گومان لە شەرافەت‌و نەجابەتی تۆ ناکەم، بەڵام وێڕای ئەمەش ئاگات لە خۆ بێت! مێردەکەی من لەمە دەڤەرەدا فەرمانڕەوای بێ هەڤرکەو تواناو دەسەڵاتی بێ سنوورە. خەڵکی ئەم دەڤەرە هەموو شۆربا خۆری ئەون‌و مان‌و نەمانیان بە دەستی ئەوە. خۆ ئەگەر لە مایڵز هندن نەچووبای، ئەم ئیدیعایەی تۆ لەلای هیو دەبوو بە شۆخی‌و سوعبەتێکی خۆش‌و بە سوعبەتی وەردەگرت‌و

هەموو شتێك دەبڕایەوە، بەڵام من دەماری دەناسمو دەزانم بە تەمایە چ بكات. دەچێ دەڵێت كە تۆ كابرایەكی كلاوچیو تەڵەكەبازی بێشەرمو بوختانكەرو درۆزنیتو هەمووش باوەڕی پێدەكەن. لەوەش دڵنیابە كە ئەگەر بەڕاستی خودی مایڵز هندن-ش بوایەی هەر ئەم ڕەفتارەی دەگەڵ دەكردیتو كەسیش نەیدەوێرا فزە بكات."

مایڵز هندن، ورتە ورتێكی تاڵی كردو گوتی:

"بەڵێ، دەزانم. تێدەگەم. ئەو پیاوەی كە تۆی لە من زەوت كردووەو سەروەتو دارایی تالان كردووم، هێندە بێ شەرەفە، كە تاوانی خراتر لەمەشی لێدەوەشێتەوە."

ژنەی گەنج سەری داخستو دەموچاوی سوور هەڵگەڕا، ئەوجا بە دەنگێكی خۆشو نەرم گوتی:

"بە هەرحاڵ من وا ئاگادارم كردیتەوە، ئیتر ئوباڵی خۆت لە ئەستۆی خۆتە، بیكە بە خاتری خودا بڕۆ، بە پەلە بڕۆ، دەنا هیو، ڕەحمت پێناكات. هیو. بنیادەمێكی ستەمكارو زاڵمەو من لەم ماڵەدا دەوری كەنیزەك دەبینم. سیر ریچاردی بابیو هەردوو براكەی، ئارتەرو مایڵز، بۆ خۆ مردنو لە دەستی ڕزگار بوون، بۆ ئێوەش مردن خۆشترە لەوەی بكەونە دەستی ئەم ئەشقیا زاڵمە. ئەو داوایەی تۆ هەڕەشەیە لە پلەو پایەو سەروەتو سامانی ئەو.... تۆ تاقە كەسی كە زاتت كردووە بە خورتی خۆت بە ماڵەكەیدا بكەی، بۆیە ئەگەر فریا نەكەویو لێرە وەمێنی تیا دەچیت. بڕۆ،و مەوەستە، ئەگەر پارەشت نیە، هانێ ئەم كیسە زێڕە بگرەو شتێكی لێ بدە بە نۆكەرەكانی تا ڕێگەت بدەن بڕۆی، بەڵام تو زاتی خودا لەوەی پتر ماتەڵ مەبە، ئەگینا فریاناكەویو كار لە كار دەترازێت!"

مایڵز، بە ئاماژەی دەست كیسە زێڕەكەی ڕەت كردەوە، ئەوسا هەستاو گوتی:

"من یەك تكام لە تۆ هەیە، ئەویش ئەوەیە كە بە وردی بڕوانە دوڕ چاوانی من بزانە ئایا من مایڵز هندن-م یان نا!"

"نەخێر، من تۆ ناناسم."

"سوێند دەخۆی!"

ژنەی گەنج بە دەنگێكی هێواشو نووساو كە شپرزەییو پەشێوی پێوە دیار بوو گوتی:

"سوێند دەخۆم".

"بەڕاستی سەیرە! چاوەڕوانی شتی وا نەبووم."

"هەڵێ، بۆچی كاتی گرانبەهای خۆت بە فیڕۆ دەدەی؟ گوتم هەڵێ."

بەڵام لەو كاتەدا چەند گەزمەیەك وەژووركەوتن، مایڵز هندن بە جۆرێ غافڵگیر بوو كە تەنانەت نەی پەرژا شمشێرەكەی لەكێلان دەركێشێ، سووكە شەڕێك بەرپا بوو، و دوای چەند دەقیقەیەك مایڵز هندنو شازادەی چكۆڵە، قۆڵ بەست كرانو بەرەو زندان بران.

((٢٧))

## لە زندان دا

چونکە سالول‌و تاکژوورەکانی زندان هەر هەموو پڕ بوون لە زندانی، ناچار جووتە هاوڕێکەی ئێمەیان بۆ قاوشێکی گەورە برد کە زیاتر ئەو زندانیانەیان لەوێ دادەنا کە تاوانەکانیان سووک بوو. بۆیە تەنیا نەبوون‌و تا حەزبکەی هاودەمیان هەبوو. نزیکەی بیست کەسیان، لە ژن‌و لە پیاو بە دەورەوە بوون کە هەندێکیان دەست بە کۆت‌و هەندێکیان پێ بە زنجیر دەسوڕانەوە. دەنگی شۆخی‌و سوعبەت‌و تەوس‌و توانجی ئەم کۆمەڵە تێکەڵ بوو بوو، کردبوویان بە دەنگە دەنگ‌و غەڵبە غەڵبێکی ئەوتۆ لە تۆ وایە قیامەت ڕابووە. شازادەی بچووک ئەم ئاشوب‌و هەرایەی بە "سوکایەتیەکی گەورە بۆ پایەو مەقام‌و کەسایەتی شاهانەی" خۆی دەزانی‌و، بۆیە زۆر بە توندی بەگژیاندا دەچووەوە، لێ مایلز هندن پەست‌و خەمگین دانیشتبوو و متەقی نەدەکرد. داماوە حەپەساو ودڵتەنگی ئەو پێشهاتە بوو کە بەسەری هاتبوو، و لە دڵی خۆیدا دەیگوت:

"چۆن؟ من بۆ ماڵی خۆم بگەڕێمەوەو دڵنیابم کە کەسوکارو خزمانم بە باوەشی گەرم پێشوازیم بکەن، و ئەوان لە جیاتی ئەم نیازپاکیە نەك هەر بە کەڵەکچی‌و درۆزنم بزانن، بەڵکو بە حەپس کردنیشم بدەن؟ یانی چی، نازانم بگریم یان پێبکەنم؟ من رێك وەکو ئەو کەسەم لێهاتووە کە لە خۆشی تەمەشای پەلکەرەنگینە بەتاسەوە لە ماڵ وەدەر دەکەوێ، بەڵام لە رێگەو بەر لەوەی سەر هەڵبڕێ، گێرۆدەی چەخماخەو هەورە تریشقە دەبێت‌و لە جێی خۆی وشك دەبێت!"

وێڕای ئەمەش بەرە بەرە بیری پەشێوی مایلز، هاتەوە دۆخ‌و تایمی خۆی‌و جگە لە وێنەی لەیدی ئەدیت هیچ شتێك لە ویژدان‌و نیهادیا نەما. مایلز کەوتە بیرکردنەوە لەو ژنە بەمەکرو نازەو لە دڵی خۆیدا گوتی:

"بەڕاستی رەفتاری دەگەڵ مندا سەیر بوو، هۆی ئەمەم نەزانی، ئایا بەڕاستی ناسیمیەوە یان نا؟"

مایلز پاش ئەوەی ماوەیەك بیری لەم کێشەیە کردەوەو چەندین جار لە مێشکی خۆیدا هەڵیسەنگاندو لێکی دایەوە، گەییە ئەم قەناعەتەی کە لەیدی ئەدیت ئەوی ناسیوەتەوە، بەڵام لەبەر کۆمەڵێك هۆی گرینگ خۆی لێ نەناس کردووە. مایلز دەیویست هەرچی جنێوێکی لە بیرە بەو ژنەی بدات‌و نەفرەت ونەعلەتی دنیای بۆ بنێرێت،بەڵام چۆن دڵی دەهات و دەیتوانی ناوی خۆشەویستێك کە ساڵانێکی دوورو درێژ بۆ ئەو،و بەلای ئەوەوە ئازیزو موبارەك بووە، بە جنێوەوە وەیاد بێنێ؟

شازادەو مایلز، کە لە ژێر لێفەشڕێکی چڵکندا تلیان دەدا، شەوێکی زۆر ناخۆشیان رابوارد. زندانیەکانی دی لە ناویەکدا ناکۆك بوون‌و لە قەرقەشەو شەڕدا بوون، جاری وا هەبوو بە جۆرێ بەگژ یەکدا دەچوون‌و بەسەرو پۆتەلاکی یەکیاندا دەدا، کە دەبوایە زندانەوانەکان بکەونە بەینەوەو بە کوتەك لێکدیان جیا بکەنەوە. ئەنجام ئیدوارد تودورو هاوڕێکەی خەویان لێکەوت، لێ هەموو جارێ لە پرخەی خەوو ناڵەو هاواری زندانیەکانی دی، لە خەو رادەپەڕین.

یەك هەفتەی ناخۆش‌و تاقەتبەر بەسەر جووتە هاوڕێدا تێپەڕی. ناو بە ناو چەند دێهاتیەکیان، کە سیمایان لای مایلز بێگانە نەبوو، بۆ ژووری زندانەکە دێنان، ئەوانیش نێگایەکی نەفرەت

ئامێزو فزوڵیانەی (کەڵەکچی)یەکەیان دەکرد، دەمرێژێك جنێویان پێدەداو دەڕۆییشتن. بەیانیەك، کابرای زیندانەوان، پیرەمێرێکی هێنایە ژووریێو پێی گوت:

"ئەو گەنجەی کە باسیان دەکرد لەم ژوورەدا حەپسە، وەرە بیدۆزەوەو پێمی نیشان بدە!"

هندن سەری هەڵبڕی، بۆ یەکەمجار لەو ڕۆژەوە کە کەوتبووە ئەم زندانە هەستی بە خۆشی کرد. مایڵز هندنی لاو کە چاوی بە پیرەمێردەکە کەوت، لە دڵی خۆیدا گوتی:

"ئەم پیاوە (بلیك ئاندریون)ە کە ماوەیەکی زۆر خزمەتکاری ماڵی بابم بوو. پیاوێکی یەجگار بەشەرەف و بەڕێزو حورمەت و بە دڵو دەروونە، یان بەلای کەمەوە ڕۆژگارێك وابووە، لە کاتێکا هەموو خزمەکارەکانی دیکەی بابم گۆڕاون، زەڕەیەك بە هاوشەرەفیان لەلا نەماوە، بێگومان بلیك- ش دەمناسێت، بەڵام ئەگەر وەکو ئەوانەی دی خۆیم لێ نەناس نەکات باشە."

پیرەمێرد، ڕوانیە سەروچاوی یەك بە یەکی زندانیەکان و ئەنجام گوتی:

"من لێرەدا، لەم قاوشەدا جگە لە دزو ڕێگر کەسی دی نابینم. باشە ئەو پیاوەی کە دەیەوێ خۆی بخاتە پێستی (مایڵز هندن)ەوە کوا؟"

زندانەوانەکە دەستی بە پێکەنین کردو گوتی:

"هۆوە تا لەو سووچەدا دانیشتووە، تەمەشای بکەو بزانە چی لێ حاڵی دەبیت."

پیرەمێرد لە مایڵز هندن نزیك بووەوەو بە وردی ڕوانییە سەروچاویو پاشان سەری لەقاندو گوتی:

"ئەم پیاوەو بنەماڵەی هندن؟ نا، نەخێرا!"

زندانەوانەکە گوتی:

"باوکە، هەق بە تۆیە ئەمە هەرگیز لە بنەماڵەی هندن نیەو ئەگەر من لە جێی (سێر هیو) بام دەمزانی چی لەم درۆزنە دەکەم."

مێردەك(بۆرەپیاو) دەستی بۆ گەروی خۆی بردو ویستی بەو جۆرە بڵێ ئەگەر لە جێی (سێر هیو) بوایە، ئەم کەڵەکبازەی لە سێدارە دەدا، لێ پیرەمێردەکە گوتی:

"لێ ئەگەر من لە جێی (سێر هیو) بام لە سێدارەم نەدەدا، بەڵکو بە زندوویەتی دەمخستە ئاگرەوە."

زندانەوانەکە جارێکی دی لە قاقای پێکەنینی داو گوتی:

"باوکە گیان، تۆش وەکو دێهاتیەکانی دی ڕەفتاری دەگەڵ بکەو تا دەمت دەگرێ جنێو بارانی بکە، دەبینی چەند خۆشە!"

زاندانەوانەکە ئەو قسەیەی کردو بەرەو ڕاڕەوی زندانەکە ڕۆیی. پیرەمێردەکە هەر کە دڵنیا بوو زندانەوانەکە لەو ناوە نەماوە، لە بەردەم مایڵزدا بە چۆکا هات و بە ئەسپایی گوتی:

"ئاه، ئاغای ئازیزم، زۆر شوکر بۆ خوا کە ئاقیبەت گەڕایتەوەو چاوم، کە تەسەورم دەکرد حەوت ساڵە لە دنیا ڕۆییوی، بە جەماڵت ڕوون بووەوە. شوکر بۆ خودا کە نەمردویت و ئەوەتا ساغو سەلامەت لە بەردەم مندا دانیشتوویت. من هەر لە یەکەم نیگادا ناسیمیتەوە، مەگەر هەر خوا بزانێ بە چ زەحمەتێك هەستی شادمانی خۆم شاردەوە! سێر مایڵزی ئازیزم، من کابرایەکی پیری

کلۆڵم‌و هیچ زەمانەتێکی گیانیم نیە، لێ ئەگەر تۆ ئیجازە بفەرمووی، ئەگەر سەریشم داناوە هاوار دەکەم‌و راستی مەسەلەکە ئاشکرا دەکەم."

مایڵز گوتی:

"نا، باوکە، بە پێچەوانەوە، من دەمەوێ تۆ زاری خۆت بگریت‌و قسە نەکەی. چونکە مردنی تۆ هیچ سوودێکی بۆ وەزع‌و حاڵی من نابێت. من مەمنوونی تۆم چونکە لە سایەی سەری تۆدا کەمێك سوکناییم پێدا هات‌و متمانەم بە خۆم پەیدا کردەوە."

لەو رۆژە بە دواوە، کابرای پیرەمێرد بۆ مایڵز هندن‌و شازادەی چکۆلە بوو بە خێرو بەرەکەت، چونکە رۆژی چەندین جار بەو بیانووەی کە جنێو بە (کەڵەکبازی درۆزن) بدات‌و (داخی دڵی) بەسەر ئەودا برێژێ دەهات بۆ زندان‌و بەدزییەوە خۆراك‌و شیرینییەکی دەگەیاندنێ، و دەنگوباسی دەرێی بۆ دێناو هەر چییەك زەروری بوایە پێی دەگوت. مایڵز خۆراك‌و کێك‌و شیرینیەکانی دەدایە شازادەی چکۆلە، چونکە ئەو بەسزمانە بێزی نەدەهات خواردنی زندان بخوات. ئاندریوز لە ترسی ئەمەی نەبادا کابرای زندانەوان گومانی لێبکات، زۆر لەلای مایڵز ماتەڵ نەدەبوو، لێ ئەگەر هەواڵێکی گرینگی لابوایە، دەرفەتی دێناو ناوکێشی جنێوە رواڵەتیەکانی دەکردو پێی رادەگەیاند.

مایڵز هندن، بەرە بەرە بەسەرهاتی بنەماڵەکەی خۆی، لە ماوەی ئەو حەوت ساڵەدا کە لەوێندەر نەبوو بوو، لە زمانی پیرەمێردەوە ژنەوت‌و زانی کە ئارتەر، برا گەورەکەی شەش ساڵ لەوە پێش مردووە. سێر ریچاردی پیرە بابیشی دوای مردنی ئارتەرو بێ سەرو شوێنی مایڵز، لە ژیان نا ئومێد دەبێت‌و کە دەبینێ پێی بە لێوار قەبرەوەیە، دەستور، بە کورە بچووکەکەی، هیو و بەلەیدی ئەدیت دەدات کە بە زووترین کات زەماوەند بکەن. لەیدی ئەدیت بەو هیوایەی کە مایڵز هەر دەگەڕێتەوە، داوای مۆڵەت لە پیرەمێرد دەکات. لەم ماوەیەدا کاغەزێك دێت کە هەواڵی مردنی مایڵزی تیا دەبێت. ئەم هەواڵە دڵتەزێنە زۆر کار لە سێر ریچارد دەکات‌و تەواو نیگەران‌و بێتاقەتی دەکات، بۆیە دەگەڵ (هیو)دا گوشار لە کیژەی بەدبەخت دەکات کە تا زووەو بەر لە مردنی ئەو، شوو بە کوڕەکەی بکات. لەیدی ئەدیت، داوای مۆڵەتی یەك مانگی دی دەکات،و سێ جار ئەم مۆڵەتە تازە دەکاتەوە.

ئەنجام زەماوەندی ئەو دووە لە ژوورەکەی تەنیشت ئەو ژوورەی کە پیرەمێرد گیانی تیا دەدات، سەر دەگرێت، لێ بەزم‌و هەڵپەرکێ ساز ناکرێ، چونکە لەو کاتانەدا پیرەمێرد کۆچی دوایی دەکاو دەمرێت. هەفتەیەك دوای زەماوەندەکە، دەنگۆیەك لە نێو خەڵکی دا بڵاودەبێتەوە کە لەیدی ئەدیت لە نێو کاغەزەکانی مێردەکەیدا، رەشنووسی نامەیەك، کە هەواڵی مەرگی مایڵزی تیا بووە، دەدۆزێتەوە، لەبەر ئەوە مێردەکەی بەوە تاوانبار دەکات کە بە هۆی کاغەزێکی ساختەوە نەك هەر لە زەماوەندەکەدا پەلەی کردووە بەڵکو کردویەتیە کارێك کە باوکیشی سوێی ببێتەوەو زووتر بمرێت. هەروەها باسی ئەوە دەکات کە ئاغای تازەی هندن هول. دەگەڵ ژنەکەیدا زۆر خراپەو دەگەڵ ئەو داماوانەشدا کە لەسەر مولکەکانی کاردەکەن‌و بە رەنجی شان نان‌و بژێوی خۆ پەیدا دەکەن، زۆر توندو سەختگیرە، زۆر ئەزیەت‌و زەحمەتیان دەدات.

ئیدوارد تودور، هەرچەندە هیچ قازانج و سوودێکی خۆی لە بیستن و زانینی ئەم هەواڵانەدا نەدەبینی، لێ بە کەماڵی دیقەت گوێی دەگرت. شەوێك کابرای پیرەمێرد، بە دەم قسانی ترەوە بە مایڵزی گوت:

"لە هەموو شوێنێکدا قاو داکەوتووە کە پاشا شێت بووە لێ بۆ خاتری خوا ئەم نهێنییە بپارێزە، چونکە هەرکەسێك بە ئاستەمیش باسی شتی وا بکات، یەکسەر ئیعدام دەکرێت."

شازادەی چکۆلە، نیگایەکی ئاگرینی پیرەمێردی کردو گوتی:

"نەخێر، پاشا شێت نەبووە، و ئەمە درۆیەکی شاخدارە. بەڵام منیش ئامۆژگاری تۆ دەکەم کە تۆش لەبەر خۆت ئەم رازە لای کەس مەدرکێنە!"

ئاندریوز، مات بوو، و لە منداڵەکەی پرسی:

"کوڕۆ، تۆ هەقت چیە بەسەر ئەم قسانەوە؟"

لێ مایڵز هندن ئاماژەیەکی بۆ کرد، ئەویش وازی لە کوریژگەکە هێناو درێژەی بە قسەکەی داو گوتی:

"دەڵێن لە شازدەی ئەم مانگەی کە تیایداین، تەرمی شای رەحمەتی بە خاك دەسپێردرێت. درۆم نەکردبێ ئەم رێوڕەسم و تەشریفاتە سبەینێ یان دوو سبەی ئەنجام دەدرێ و لە رۆژی بیستەمی مانگدا، پاشای تازە لە کۆشکی ویستمینستەردا، دێتە سەر تەخت و تاج لەسەر دەنێ."

شازادە بۆڵاندی و گوتی:

"تەشریفاتی تاجگوزاری وەختێ دەکرێ کە پاشای تازە بدۆزنەوەو من دڵنیام کە هێشتا بە دوویدا دەگەڕێن."

پیرەمێردەکە دیسان بە شازادەدا هەڵشاخی و گوتی:

"کوڕۆ، تۆ بێدەنگ بە."

لێ مایڵز، ئاماژەیەکی تری بۆ کردو ئەویش ناچار بوو وازی هێناو لەسەر قسەکەی خۆی بەردەوام بوو و گوتی:

"سێر هیو، لە ئاهەنگی تاجگوزارییەکەدا بەشداری دەکات و بە تەمایە لەم بۆنەیەدا پۆستی ئەشرافی (پڕ)ی بدرێتێ بە تایبەتی کە دەزانێ لەلای (لۆرد وەسی) قەدرو رێزی هەیەو ئەو پایە بەرزە بە چاوی لوتفەوە تەمەشای دەکات."

ئیدوارد پرسی:

"لۆرد وەسی کێیە؟"

"سەیرە! مەبەست (دۆك دوسامرست)ە."

"کام دۆك دوسامرست؟"

"لاحەولەوەلا، ئێمە هەر یەك دۆك سامرست-مان هەیە، و ئەویش کۆنت هرتفوردە."

"لەکەیەوە پلەو پایەی دۆکی و لۆردی وەسی وەرگرتووە؟"

"لە دوا رۆژی مانگی یەکی ئەمساڵەوە."

"کێ کردوویەتی بە لۆردی وەسی؟"

"خۆی‌و ئەنجوومەنی باڵا. هەڵبەتە بە کۆمەکی پاشا."

ئیدوارد، ڕاچڵەکی‌و گوتی:

"بە کۆمەکی پاشا؟ کام پاشا؟ بیڵێ بزانم!"

ئاندریوز، هاواری کردو گوتی:

"ئەمە چە پرسیارێکە؟ ئێمە هەر یەك پاشامان هەیە، و ئەویش خاوەنشکۆ ئیدواردی شەشەمە، پاشاکەمان منداڵێکە لە تەمەنی تۆدا... جا ئەم پاشایە شێت بێت یان نا دەبێ دوعا بکەین کە ساڵەهای ساڵ فەرمانڕەوایی ئینگلیستان بکات، چونکە یەکەمین کاری ئەمە بووە کە دۆك نورفولك–ی بەلەنگازی لە چنگی مەرگ رزگار کردووەو بەوپەڕی جوامێری‌و لێبوردەیی بەخشیویەتی گوایە بە مەعلومیش، حاڵی حازر سەرقاڵی گۆڕین‌و ریفۆرمی یاسا زاڵمانەکانی رابردووە."

ئەم هەواڵانە، ئیدواردیان شپرزە کرد. بەسەزمانە زۆر خەمبار بوو، و لە دڵی خۆیدا دەیگوت:

"ئاخۆ ئەم منداڵەی کە ئەم پیرەمێردە باسی دەکات هەمان منداڵە گەدا نیە کە من ڕێگەم دا بێتە کۆشکەکەمەوەو جلەکانی خۆم لەگەڵی گۆڕییەوە؟ نا، نا، مەحاڵە ئەوبێ چونکە تەرزی قسەکردن‌و کەموکوڕی تەربیەت‌و پەروەردەی ئەو لە ئاستێکی هەندە نزمدا بوو، کە بێگومان دەبێ دوای ماوەیەکی کەم پەیان بە ماهیەتی بردبێ‌و لە کۆشکەکەیان وەدەرنابێت، لەگینە دەربار بەدەم چاوەڕوانی گەڕانەوەی منەوە، منداڵی یەکێك لە نەجمیزادەکانیان، کە لە تەمەنی مندا بووبێ‌و زۆر لە من چووبێت، پەیدا کردبێ‌و بە شێوەیەکی کاتی لە جێی منیان دانا بێت. بەڵام ئەم بیرۆکەیەش ماقول نیە، چونکە خاڵم، لۆرد هرتفورد هەرگیز شتی وای قەبووڵ نەکردووە."

بەڕاستی مەسەلەکە ئەوەندە ئاڵۆز بوو کە شازادە سەرە داوەکانی بۆ نەدەبرایەوە سەریەك. بەلەنگازە تا زیاتر بیری لەم مەسەلەیە دەکردەوە، زیاتر لێی دەئاڵۆزکاو پتر شپرزە دەبوو. هێندە بیری کردبووەوە، سەری دابویە ژان‌و خەوی زڕا بوو. هێندە بەپەلە بوو کە بگاتەوە لەندەن، بە جارێ زندانەکەی لێ بوو بوو بەدۆزەخ.

مایلز هندن، زۆری هەوڵدا دڵخۆشی بداتەوە، بەڵام بێهودە. ئەوەی کە تۆزێ سوکنایی بە دڵی شازادەی چکۆلە دەدا، زیاتر دلۆڤانی‌و کارامەیی دوو ژنی زندانی بوو کە لەلای ئەوەوە بە زنجیرێك بەسترا بوونەوە. ژنە حەپسەکان، زۆریان دڵخۆشی دایەوەو ورەیان بەرز کردەوەو لەسەر سەبرو بەردەباریان ڕاهێنا. شازادە لە دڵی خۆیدا مەحەبەتی چووە سەریان. شازادە لێی پرسین:

"ئێوە بۆچی کەوتوونەتە زیندان؟"

ژنەکان گوتیان:

"چونکە ئێمە لە موریدانی تەریقەت‌و ڕێبازی ئانابابتیستین."

شازادە لە قاقای پێکەنینی داو گوتی:

"ئانابابتیست؟ ئەمە گوناحێکی گەورە نیەو من زۆر بە داخەوەم، چونکە پێموایە بەم زووانە لە ئێوە جیا دەبمەوە.بەڵام نازانم بۆچی دەبێ خەڵکانی بێوەی‌و پاکی وەکو ئێوە بخەنە زندانەوە."

چونکە ژنەکان سەریان داخستبوو قسەیان نەدەکرد، شازادە هەمدیس گوتی:

"باشە ئێوە بەڕاستتانە؟"

پێدەچوو، ئەو دوو ژنە لێبڕابن وەڵام نەدەنەوە، بۆیە دیسان متەقیان نەکرد. شازادە جارێکی دی گوتی:

"باشە جەڵدەتان لێ دەدەن؟ نا، نە، نە ئیشەڵلا، ئەوەندەش دڵڕەق نین، وانیە؟"

یەکێك لە ژنەکان، کە لە نیگەرانی و پەریشانیدا دەنگی گیرابوو گوتی:

"ئەی منداڵی دڵپاك تۆ باسی جەڵدە مەکە! دوعای ئەوەمان بۆ بکە خوا باشاری ئەوەمان بداتێ کە بەرگەی ئەو عەزابە بگرین!"

لێ شازادە قسەکەی پێ بڕی و گوتی:

"عەجایەب! کەواتە من بە هەڵە نەچوو بووم. ئەم هۆڤیانە بە تەمان، جەڵدەتان لێدەن! بەڵام مەگرین، ورەتان بەرز بێ! من سوێندتان بۆ دەخۆم کە گەڕامەوە شوێنی خۆم، لەم عەزاب و ئەشکەنجەیەتان رزگار دەکەم!"

شازادە کاتێ بەیانی لە خەو ڕابوو، ئەو دوو ژنەی نەبینی، بۆیە بە خۆشحاڵییەوە گوتی:

"بێگومان هەڵاتوون!، رزگاریان بوو."

بەڵام زوو خەم دایگرتەوەو گوتی:

"حەیفێ کە دۆستە خەمخۆرو خەمڕەوێنەکانی خۆم لە دەست دا!"

ژنەکان، هەر یەکەیان، بە سنجاقێك نەوارێکی وەکو یادگار بە جلەکانی شازادەوە کرد بوو. شازادە، کە ئەم مەحەبەتەی ئەوانی بینی، لە فکران ڕاچوو، و لە دڵی خۆیدا گوتی:

"من تا ماوەم ئەم یادگارانە هەڵدەگرم و هەرکە لە زندان دەرچووم دەگەڕێم و دەیاندۆزمەوە، چونکە ئەم ژنە میهربانانە بەڕاستی دۆستانی راستەقینەی من بوون و هەقە هەمیشە لە سایەی مندا بن."

لەم کاتەدا کابرای زندانەوان دەگەڵ دووان لە یاریدەدەرەکانیا، هاتە ژووری زندانەکەو بە دەنگی بەرز گوتی:

"یاڵلا هەموو بچنە حەوشەی زندان!"

شازادە خۆشحاڵ بوو، و لە دڵی خۆیدا گوتی:

"سوپاس بۆ خودا کە جارێکی دی ئاسمانی شین دەبینم و هەوای ئازاد هەڵدەمژم."

بەلەنگازە کاتێ دەیبینی کە زندانەوانەکان لە کردنەوەی کۆت و زنجیری دەست و پێی زندانییەکاندا خاوە خاو دەکەن تووڕە دەبوو، ئەنجام نۆرەی ئەو و مایلز هندن-ش هات و هەردووکیان چوونە حەساری زندانەکە.

حەساری زندان مەیدانێکی سەلبەندی(سەنگفەرش) لاکێشەیی بوو. زاندانیەکانیان لە بن دیوارێکدا بە یەك ریز ڕاگرت و تەنافێکیان لە بەردەمیاندا ڕاکێشا. دنیا ساردو ئاسمان کەوەیی بوو. شەوێ بەفرێکی کەم باری بوو، وەکو گەردو تۆز بەسەر سەنگفەرشی حەسارەکەوە مابوو، هەرکە بایەکی تونەدی هەڵدەکرد، بەفری سەر عاردەکەی لوول دەداو بە چواردەورا بڵاوی دەکردەوە.

له ناوەندی حەسارەکەدا دوو ژن بە عامودێکی دارینەوە بەسترا بوون. شازادە هەرکە چاوی بە دۆستە ئازیزەکانی خۆی کەوت، سەراپای هاتە لەرزین و لە دڵی خۆیدا گوتی:

"سڵاو لە ئەقڵی من، وامدەزانی هەڵاتوون! لەوە دەچێ جەڵدەیان لێبدەن، لەبەر چاوی کێش، لەبەر چاوی من کە پاشام. ئەگەر ئێستا لەم وەزع و حاڵەدا نەدەبووم، تەنیا ئەوەندە بەس بوو کە... بەڵام دەبێ سەبرم هەبێ، بەری تەنگانە کورتە، ئەو رۆژەی کە جەلادان دەبێ سزای تاوانی خۆ بدەن، نزیکە!"

لەم کاتەدا دەرگایەك کرایەوە، ژمارەیەکی زۆر لە دێهاتیان کە شوانکارەیەکیشیان تێدا بوو، هاتنە ناو حەسارەکە، ئەو خەڵکانە ماوەیەکی زۆر بە دەوری ئەو دوو ژنەدا سوڕانەوەو هەندێ کاریان ئەنجام دا. پاشان لاکەوتن، و ئیدوارد تودور چاوی بە دیمەنێك کەوت کە سەراپای بەدەنی لە ترسا سڕ بوو. دارو چیلکەیەکی زۆریان بە چواردەوری ئەو دوو ژنەدا هەڵچنی بوو. کابرایەك چۆکی نابووە سەر زەوی و خەریکی ئەوە بوو ئاگر لە دارو چیلکەکان بەربدات.

ژنە نەگبەتەکان، دەموچاوی خۆیان لە نێو هەردوو دەستیان نابوو. ئاگر کرایەوەو بەرە بەرە گڕی سوورو دوکەڵی شینباو بەرەو ژنەکان بڵێسەی دەسەند و بەرز دەبووەوە.

لەپڕ دوو کیژی گەنج، لە ئاستانەی دەرگای حەوشەوە وەژوورکەوتن و بەدەم هاوارو گریانی دڵتەزێنەوە خۆیان خستە بەرپێی ژنە مەحکومەکان. یەکسەر کۆمەڵێك لە پاسەوانانی زندانەکە بەسەریانا دابارین و لە قۆڵیان نەوین تا بە راکێش راکێش بەرەو دەرگایان ببەن، لێ یەکێك لە کیژەکان کە توانی بووی خۆی لە دەستی پاسەوان دەربێنێ دووبارە بەغار بەرەو بڵێسەی ئاگرەکە رۆیی و بەدەم گریەو زارییەوە گوتی:

"وازم لێبێنن با منیش دەگەڵ دایکما بمرم. من نامەوێ بە تەنیا لە دنیادا بمێنم!"

شازادە کە توانای تەمەشای ئەم دیمەنە سامناك و دڵتەزێنەی نەبوو، سەری وەرگێڕاو رووی کردە دیوارەکەو گوتی:

"ئەگەر سەد ساڵیش بژیم، هەرگیز ئەم تاوانانە فەرامۆش ناکەم. خودایا! بۆچی بە نابینایی نەت خوڵقاندم تا ئەم دیمەنە کارەساتبارە نەبینم؟

مایڵز هندن، کە تەمەشای ئەم حاڵەی شازادەی دەکرد، لە دڵی خۆیدا دەیگوت:

"ئەم کوڕە چەند گۆڕاوەو چەند هێورو کەوی بووە! ئەگەر چەند رۆژێ لەمەپێش پێشهاتێکی واهی رووی بدایە، بێگومان پەلاماری هەر هەموو ئەم خەڵکانەی دەداو قیامەتێکی بەرپا دەکردو یەکسەر فەرمانی ئازادی ئەم دوو ژنەی دەردەکرد. وای دەبینم کە لە ئایندەیەکی زۆر نزیکدا بە تەواوەتی چا دەبێتەوەو شێتییەکەی لە کۆڵ دەبێتەوە!"

هەمان شەو ژمارەیەکی زۆری زندانی ژن و پیاویان لە شوێنانی جیاوازی وڵاتدا گرتبوو، و بۆ ژوورەکەی شازادەو مایڵز هندن-یان هێنان و حەپسیان کردن. ئیدوارد تودور، ئەم دەرفەتەی لە کیس نەداو دەگەڵ هەموو ئەو زندانیانەدا قسەی کردو لێی پرسی بوون کە تۆمەتیان چیەو چ سزایەکیان بۆ دانراوە. یەکێك لەو ژنانە کە ژنێکی کلۆڵی نیمچە شێت بوو، بە گوناحی ئەمەی کە

پارچە قوماشێکی دزیوە، حوکمی خنکان و لە سێدارەدان درابوو. پیاوێك چیرۆکی تاوانەکەی خۆی گێڕایەوەو گوتی:

"من بەوە تاوانبار بووم کە ئەسپێکم دزیوە، بەڵام تاوانەکەم ساغ نەبووەوەو ئازادیان کردم. بۆ نەگبەتی هێشتا تازە ئازاد بوو بووم کە جارێکی دی بە تاوانی ئەمەی کە ئاسکێکی باخی پاشایەتیم کوشتووە گرتیانم. ئێستا حوکمی ئیعدامیان داوم".

لاوێکی دیکە گوتی:

"شەوێك لە باخەکەی خۆمدا بازێکم دۆزییەوەو پێموابوو دەتوانم بۆ خۆم ڕای بگرم، لێ پێیان گوتم ئەم کارەی تۆ دزییە و بێ ئەوەی گوێ بە وەڵام و داکۆکی من بدەن، حوکمی ئیعدامیان دام."

شازادە کە بە بیستنی ئەو بەسەرهاتە نامرۆڤانیانە قەڵس و توڕە بوو بوو، داوای لە مایڵز هندن کرد بە زووترین کات هەڵێن، و لەمبارەیەوە گوتی:

"سێر مایڵز، تۆ دەبێ دەگەڵ مندا بێی بۆ (ویستمینیستر)و هەرکە لەسەر تەختی پاشایەتی دانیشتم، کارێك دەکەم کە هەر هەموو ئەم کلۆڵانە لەم سزا نامرۆڤانیانە ڕزگاربن."

مایڵز هندن کە گوێی لەو قسەیە بوو، لە فکران ڕاچوو، لە دڵی خۆیدا گوتی: "بەستەزمانە، کە گوێی لەم بەسەرهاتە خەمناکانە بووە، لە داخا شێتێتییەکە سەری لێ هەڵداوەتەوە. سەلا لە ئەقڵی من، وامدەزانی چاك بووەتەوە."

کابرایەك لە نێو زندانیەکاندا هەبوو کە پێشتر کاری ئەوقاتی و پارێزەری هەبوو. ئەم سێ ساڵێك لەوەپێش وتارێکی نووسی بوو،ڕەخنەی لەسەرەك وەزیران گرتبوو کە کەسێکی زاڵم و ستەمکارە. دادگاییان کردبوو، و بەوە حوکمیان دابوو کە بە بڕی سێ هەزار لیرەی ئەستەرلینگ جەریمە بکرێ و هەردوو گوێشی ببڕدرێ، ئەنجام وتارێکی دیکەی لەعەلەیی لۆرد سەرەك وەزیران نووسی بوو، و ئەمجارە بە جەریمەی پێنج هەزار لیرەی ئەستەرلینگ و زیندانی ئەبەدی حوکم درا بوو، و لە پەراوێزی حوکمەکەیدا ئەوەشیان نووسی بوو کە هەردوو گونای بە ئاسنی سووڕەوە کراو داغ بکەن و هەرچیەکیش لە گوێی ماوەتەوە بیبڕن.

کابرا سەرو چاوی خۆی نیشان داو گوتی:

"تەمەشا، ئەم نیشان و میداڵی ئەو داغە پڕ شانازیانەیە کە من هەمە!"

ئەوسا قژە پڕەکەی لە هەردوو لاوە لابردو لە جیاتی گوێ دوو کونی گەورەو تاریکی میناکی زارکی ئەشکەوتی نیشان دا.

شازادە کە زۆر قەڵس بوو بوو، بە توڕەیی و گازاندەوە گوتی:

"من دەزانم کەس باوەڕم پێناکات، بەڵام هەمووتان شایەت بن کە تا مانگێکی دیکە هەمووتان ئازاد دەبن.هەروەها هەموو ئەو یاسایانەی کە ئەمڕۆ ئێوەیان پێ حوکم دراوە،و لە ڕاستیدا مایەی شەرزاری و ریسوایی ئینگلیستانە، لە تۆماری دەستووری ئەم وڵاتەدا دەسڕدرێتەوە. سیستەمی کۆمەڵایەتی یەجگار خراپەو سوڵتانان دەبێ جارجار، چاوپۆشی لەو یاسایانە بکەن کە حوکمی پێدەکەن، دەبێ جار جار ئەو یاسایانە بگۆڕن تا لەو ڕێگەیەوە پەی بە مانای سۆزو

بـــەزەیی و مرۆڤپـــەروەری و پیـــاوەتی بـــەرن و ســـۆزو بـــەزەیی دڵیـــان ئـــاوەدان بکاتـــەوە".

((٢٨))

## فیداکاری

مایلز هندن بەرە بەرە هەستی کرد کە زندان بۆ ئەو شوێنێکی ناخۆشەو خۆ بە قەزاو قەدەر سپاردن کارێکی قورس و تاقەتبەرە. بۆیە وەختێ خەبەریان دایە کە بەو نیزیکانە دادگایی دەکرێت زۆرخۆشحاڵ بوو. لە دڵی خۆیدا گوتی:

"لەوەیە بە سووکە جەریمەیەك وازم لێ بێنن. من بەمە رازیم، چونکە گرینگ ئەمەیە کە ئازادی خۆم بە دەست بێنمەوە."

بەڵام کاتێ زانی کە بە تاوانی دەست درێژی بۆ سەر ماڵی "سێر هیو هندن" بە دوو سەعات فەلاقەو ئەشکەنجە حوکم دراوە، زۆری پێ سەیر بوو. لە حوکمەکەی قازی دادگادا بە هیچ کلۆجێ ئاماژە بۆ خزمایەتی و کەسایەتی دوور یان نزیکی ئەو دەگەڵ سکاڵاکەردا نەکرابوو، هەروەها هیچ ئاماژەیەکیش بە هەق و هقوقی یاسایی و بە بەشە میراتی ئەو لە موڵك و ماڵی بنەماڵەی هندن و بەلەقەب و عینوانی خانەوادەی ئەو نەکرا بوو.

کاتێ کە بۆ قەساسگایان دەبرد، زۆر بە توندی ئیعترازی گرت، لێ ژمارەیەکی زۆر لە مامورانی ئەشکەنجە بە سەریا دابارین و بە پاڵ دایانە پێش. ئاپۆرای خەڵکی لە پێشیانەوە کەوتنە رێ. تەنیا شازادەی چکۆلە نەبێ کە لە دوای هەمووانەوە رێی دەکرد. فەقیرە لەزگ بوو خۆیشی میناکی هاوڕێکەی بە فەلاقەو ئەشکەنجە حوکم بدرێ، لێ لەبەر ئەوەی منداڵ بوو، چاوپۆشیان لێکرد. وەختێ گەیشتنە جێ و خەڵکەکە وەستان، شازادە دڕی بە ئاپۆڕای خەڵکەکە داو خۆی گەیاندە ریزی پێشەوە. لەوێ خولامە بێچارەکەیان، بەدەم جنێوو نەفرەت و تەوس و توانج و ڕیشخەنی دێهاتیانەوە، بە عامودی مەیدانی قەساسگاکەوە بەست.

بەڕاستی زۆر شورەیی بوو کە ئەو رەفتارەیان دەگەڵ مەحرەمی رازو هاودەمی پاشادا دەکرد! شازادە کە بە تەواوەتی هەڵچوو بوو و غیرەتی جولا بوو، پەلاماری سەرۆکی پاسەوانانی داو بە توندی تێی خوڕی و گوتی:

"ئەمە پیاوی منە. ئازادی بکەن! من..."

هندن هاواری کردو گوتی:

"بیدەنگ بە کوڕۆ! دەتەوێ ماڵی خۆت وێران بکەی و دەستت لە بنی هەنبانەکەوە دەربچێ!"

هەنگێ رووی کردە سەرۆکی پاسەوانان و گوتی:

"قوربان، گوێی مەدەیە، ئەم منداڵە شێتە."

سەرۆکی پاسەوانان گوتی:

" شێت بێ یان ئاقڵ فەرق ناکات، پێموایە ئەم منداڵە پێویستی بە سووکە گوێ ڕاکێشانێك هەیە، گوێ ڕاکێشان بۆ مجێزی خراپ نیە."

ئەوجا رووی کردە یەکێك لە ژێر دەستەکانی خۆی و گوتی:

"چەند شەلاخێك لەم مندڵە بدە تا لە ئێستا بە دواوە كاری خۆی بزانێت!"
سێر هیو، كە بۆ سەرپەرشتی جێبەجێكردنی حوكمی سزایەكەی مایلز هندن بە سواری ئەسپ بۆ قەساسگاكە هاتبوو گوتی:
"بەڵێ، شەش دانە شەلاخ بۆ ئەم مندالە لاپرەسەنە پێویستە!"
شازادە، كە گوێی لەو بێ ئەدەبیە بوو كە دەیانەوێ دەست لە رووی موبارەكی ئەو بەرز بكەنەوە، بەرادەیەك ترساو حەپەسا كە بیری لە بەرگری هەر نەكردەوە، ئەمە جگە لەوەی غیرەتو حیرسو سەنگینی زاتی ئەو لەو ئاستەدا نەبوو كە تەنازول بكاتو لە بەرانبەر پاسەوانەكاندا بكەوێتە پاڕانەوەو گریانو بادانەوە.
لەم كاتەدا مایلز هندن فریای كەوتو رووی كردە پاسەوانەكان و گوتی:
"واز لەو بێنن! مەگەر نابینن بە ستەزمانە ناتوانێ خۆی بە پێوە بگرێت؟ ئەگەر حەزتان لە شەلاخ وەشاندنەو پێتان خۆشە، لە جیاتی ئەو لە من بدەن."
سێر هیو، بزەیەكی تەوس ئامێزی كردو گوتی:
"بەهـ بەهـ! ئاغا چ سەخاوەتو كەرەمێكی هەیە! زۆرچاكە، كوڕینە ئەم گەدایە ئازاد بكەنو لە جیاتی ئەو دوازدە شەلاخی زیادە لەم كەڵەمێرە بدەن."
شازادە دەمی بە نارەزایی هەڵێنایەوە، لێ سێر هیو لێزانانە ناچاری كرد بێدەنگ بێو گوتی:
"زۆر باشە، قسە بكە،ن بەلام چاك بزانە لە بری هەر وشەیەك لە زارت بێتە دەرێ، دەڵێین شەش شەلاخی زیادە لە هاوڕێكەت بدەن. دەیسا ئێستا بە كەیفی دڵی خۆت قسە بكە!"
مایڵز هندن-یان لە عامودی قەساسگاكە كردەوەو كراسەكەیان لەبەری داكەند. لەو كاتەدا كە جەزرەبەی شەلاخ میناكی باران بەسەر لەشی رووتی ئەودا دادەباری، مندالەی كڵۆڵ، بەرگەی دیتنی ئەو دیمەنەی نەگرت، بۆیە رووی وەرگێڕاو لە كاتێكا گریان ئەوكی گرتبوو لە دڵی خۆیدا گوتی: "ئەی شێرە پیاو، ئەی مەردەمێر، بە زاتی خوا من هەرگیز فیداكاری تۆ فەرامۆش ناكەم. بەلام ئەم نامەردانەش دەبێ چاك بزانن كە من هەرگیز رەفتاری نامرۆڤانەی ئەوانیش لە یاد نابەم!".
مایڵز، بە هەمان شەهامەتو ئازایەتیو بەردەباری سەربازێكی راستەقینەوە، خۆی لەبەر جەزرەبەی شەلاخەكە راگرتو هەر ئۆفیشی نەكرد. ئەو خەڵكە بێكارو وێڵگەڕەی كە لەوێندەر خڕ بوو بوونەوە، كە چاویان بە ئازایەتیو دلاوەریو بەجەرگی ئەو كەوت، زۆر بە خۆدا شكانەوەو دەستیان لە قەشمەریو تەوسو توانجان هەڵگرتو ماتو حەیران بە زاری بەشەوە تەمەشای ئەویان دەكردو تاریفیان دەكرد. دوای جێبەجێكردنی حوكمی سزاكە، مایڵز-یان بۆ شوێنی یەكەمی گەڕاندەوە. ئیدوارد تودور لێی نزیك بووەوەو دەمی وەپەنا گوێی بردو گوتی:
"خواوەند نەجابەتو پیاوەتیو مەردایەتیەكی خۆڕسكی بە تۆ عەتا فەرمووە، بەلام من دەمەوێ گەورەیی تۆ بە رووی خەڵكی دا بدەمەوە، گەورەیی تۆ بۆ خەڵكی بسەلمێنم."
شازادە، دوای ئەو جوملە قسەیە، دانەوییەوەو ئەو شەلاخەی، كە بەدەنی هاوڕێكەیان پێ

بریندار کردبوو، لە عاردی هەڵگرتو کەوتە نەوازشتی شانە خوێناوییەکانیو بە ئەسپایی بە گوێیدا چپاندو گوتی:

"من کە ئیدوارد تودور، پاشای ئینگلیستانم، ئەوا لەقەبو پۆستی (کونت)م پێ بەخشیت".

هندن، کە ئەو قسەیە زۆری کار تێکردبوو، دەستی بە گریان کرد، ئەوسا لایەنە کۆمیدییەکەی ئەم لوتفو عینایەتەی هاوڕێکەی هێنایە بەرچاوی خۆیو لە دڵی خۆیدا گوتی:

"خۆ خراپ نیە، لەگەڵ تەحەمولکردنی هەر عەزابو ئەشکەنجەیەکدا پلەیەك بەرز دەکرێمەوە. بەم پێودانگە بێ زۆری پێ ناچێت دەگەمە پلەی (دۆکی). وێڕای ئەمەش ئەم لەقەبو عینوانو پۆستە خەیاڵیو تەشریفاتیانە بۆ من لە لوتفو خۆشی بەدەر نیە، و بۆ کەسێکی وەکو من بایەخێکی بێ ئەندازەی هەیە، چونکە لەلایەن کەسێکەوە پێم دەبەخشرێ کە زۆری خۆش دەوێم. پیاو راست بڕوات بایەخی ئەم لەقەبو عینوانە خەیاڵیانە بۆ من یەجگار لەو لەقەبو عینوانە راستەقینانە زیاترە کە لە رێگەی کڕنۆشو ملکەچیو کۆیلەیەتی بۆ سوڵتانێکی راستەقینە بە دەستی بێنم!"

کاتێ کە (سێر هیو هندن)ی خوێن مژ جڵەوی ئەسپەکەی بەرەو ماڵ بادایەوە، ئاپۆڕاکە رێگەیان بۆ چۆڵ کردو ئەویش بە کاوەخۆ، ئارامو بێ خەم بە سواری ئەسپ رۆیی. دوای رۆییشتنی ئەو حەشاماتەکە هەمدیس دەوری مایڵزو هاوڕێکەیان دا، بەڵام بێدەنگیەکی تەواو باڵی بەسەر مەیدانەکەدا کێشا بوو. دوای تۆزێك کابرایەکی دێهاتی لە رێگەوە هاتو چونکە فریای دیتنی چۆنیەتی ئەنجامدانی حوکمی سزاکە نەکەوتبوو و ئاگای لە باری دەروونی تەماشاڤانەکان نەبوو، کەوتە جنێودانو بێ حورمەتی بە مایڵزی ئەو گوتەنی (کەڵەکبازو سەختەچی)، و پشیلەیەکی تۆپیوی بە دەستەوە بوو، دەیویست بە (مایڵز)یا بکێشێت. بەڵام حەشاماتەکە دەستیان گرتو کەوتنە تێهەڵدانیو بە زەبری لەقەو شاپان لە مەیدانەکەیان دەرکرد.

((٢٩))

### بەرەو لەندەن

دوای ئەوەی مایڵز هندن حوکمەکەی، کە دوو سەعات فەلاقەو ئەشکەنجە بوو تەواو کرد، فەرمانی پێدرا کە یەکسەر ئەو دەڤەرە بەجێ بێڵێو بڕواتو ئاوڕ نەداتەوە. شمشێرو کەرو هێسترەکەیان دایەوە، دەگەڵ شازادەی بەستەزماندا کەوتە رێ. گوندییان بە نیگای پڕ سۆزو رێزو حورمەتەوە بەرێیان کردنو تا لە چاو ون نەبوون، لە مەیدانەکەدا مانەوەو بڵاوەیان لێنەکرد.

مایڵز ماوەیەکی زۆر لە رێگادا بێدەنگ بوو، ئەم لاوە دەربەدەرە بەدەم رێوە هەزاران پرسیاری گرینگی لە خۆی دەکردو دەیویست وەڵامیان بۆ بدۆزێتەوە. بۆ نموونە لە دڵی خۆیدا دەی پرسی:

"پێویستە چی بکەمو بۆ کوێ بڕۆم؟ هەڵبەتە دەبێ پشتیوانێکی بەهێز بۆ خۆم بدۆزمەوە، دەنا ناچارم بۆ هەتا هەتایە چاوپۆشی لە بەشە میراتیو لە عینوانو ئیمتیازاتی خانەوادەیی خۆم

بکەمو خەڵکی بە چاوی پیاوێکی کەڵەکبازو درۆزن تەمەشام بکەن. بەڵام من ئەم پشتو پەنا بەهێزو بە دەسەڵاتو دەسترۆیانە لە کوێ پەیدا بکەم؟"

مایلز لە پڕ قسەکانی پیرەمێردە دێهاتیەکە، واتا ئاندریوزی بیرکەوتەوە کە لە زنداندا باسی بە ئەخلاقیو باشیو دادپەروەری پاشای تازەی کرد بوو، و گوتبووی کە ئەم پاشایە لە هەموو شوێنێ پارێزەرو پشتیوانی هەژارانو بێکەسو زوڵم لێکراوانەو هەمیشە هەقی هەژارانو لاوازان، لە دەستدارانو زاڵمان دەسەنێ. مایلز لە دڵی خۆیدا گوتی:

"باشە ئەگەر من بڕۆم دادی خۆمی بەرمەلا، ئاخۆ پێشوازی هەژارێکی بەدبەختو نەگبەتی میناکی(وەکو) من دەکات؟ ئایا بە دادمدا دەگا؟ بەڵام چ قەیدییە، سیروان لێشت نەدەم هەر دەمبەی؟ بە هەرحاڵ پێویستە بڕۆمو وەزعو حاڵی خۆمی پێ بگەیەنم. من سەربازێکی بە ئەزموونمو فێری ئەوە بووم کە لە دژوارترین وەزعو حاڵدا بەرەی خۆم لە ژێر پێیان دەربێنم، بۆیە باشتر وایە جارێ بۆ لەندەن بڕۆم، لەوەیە لەوێندەر جەنابی پایەبەرز سێر همفری مارلوی دۆستی دێرینی بابم فریام بکەوێ، کە ئەوەندەی بیرم مابێ، لە لای پاشای رەحمەتی پلەو پایەیەکی گەورەو حورمەتو رێزێکی شایستەی هەبوو.

بەڵێ، مایلز هندن، دوای ئەوەی ئامانجێکی دیاری بۆ سەفەرەکەی دۆزییەوە، گەڕایەوە سەر خولقو خووە خۆشەکەی جارانی. ئەم لاوە بەرە بەرە ئەو ئەزابو ئەشکەنجەو حەقارەتو سووکایەتیەی کە لەلایەن براکەیەوە پێی کرابوو، فەرامۆش دەکردو دەگەڕایەوە سەر بارودۆخی ئاسایی خۆی. دوای ئەوەی ماوەیەك رۆییشتن لەنکاو مایلز وەئاگا هاتەوەو سەری هەڵبڕیو بینی ماوەیەکی زۆریان بڕیوە. شازادەش بە سواری کەرەکەی خۆی بە دوی مایلزدا رێی دەکرد. ئەویش چوو بووە قولایی هزرو بیرێکی بە گێژەنگو گێژاوەوە. مایلز هندن، جڵەوی ئەسپەکەی راکێشاو هێواشی کردەوە تا شازادە گەییە شان بە شانی ئەو، ئەوسا دەستی بە قسە کردو گوتی:

"ئەی خاوەنشکۆ، ئێستا ئێمە بەرەو کوێ دەچین؟ هیچ لە بیرم نەبوو ئەم پرسیارەت لێبکەم."

ئیدوارد تودور گوتی:

"بۆ لەندەن دەڕۆین!"

سەفەرەکە بێ هیچ رووداوێکی گرینگ کۆتایی هات، بەڵام کۆتاییەکەی چاوەڕوان نەکراو بوو. جووتە هاوڕێی گیانی بە گیانی ئێوارەی رۆژی نۆزدەی شوبات داخڵی شار بوونو سەعات دەی شەو گەیینە پردی لەندەن. قەرەباڵغییەکی سەیرو پڕ جۆشو خرۆش لەسەر پردەکە بوو، لە گۆشەو کەناران دا، مەشخەڵیان داگیرساند بوو لەبەر رۆشنایی مەشخەڵەکاندا رووی گەشو خەندانی خەڵکی دەبینرا. لە ناکاودا کەللە سەرێکی بڕاو وەکو ئەوەی لە ئاسمانەوە هەڵبدرێ، هاتە خوارێ، بەر ئانیشکی مایلز هندن کەوتو بە بەینی لاقی ئەو دوو رێبوارەدا غل بووەوە. بەڕاست کارێن بەشەڕان چەند کۆمیدیو لێکدژو هەڤدژو ناپایەدارە! هەمووی سێ هەفتە بوو هنری هەشتەم، پاشای ئینگلیستان کۆچی دوایی کردبوو و تەنیا سێ رۆژ بوو بە خاکیان سپارد بوو، و ئێستاش میللەتو رەعیەتە نەجیبەکەی ئەو گەمەیەیان بەسەری ئەو مەحکومانە دەکرد

کە بە تۆمەتو تاوانی سووکایەتی بە پایەو مەقامی موبارەکی ئەو دادگایی کرابوونو حوکمی ئیعدام درابوون.

پیاوێك بەدەم ڕێکردنەوە پێی لە کەللە سەرەکە هەڵنوتا، خزیو شانی بەرشانی کابرایەکی دی کەوت کە لە تەنیشتیا وەستا بوو، کابرای شان بەرکەوتوو گومانی خراپی لە کابرای یەکەم کردو مستێکی توندی بە سینگیدا کێشا. یەکێك لە دۆستانی کابرای لێدراو، لەسەر هاوڕێکەی هاتە جوابو پەلاماری کابرای دەستوەشێنی داو شەڕێکی سەیر قەوما. بە ڕێکەوت شوێنەکەش بۆ شەڕو هەرا لە بار بوو، چونکە سبەینێ ئاهەنگی تاجگوزاری سوڵتانی تازە دەگێڕدراو لافاوی مەیو شەراب لە دوێنێوە لە شارا دەستی پێکرد بوو و هەموو سەران گەرمی بادەی نایاب بوون.

خۆلاسە هەمووی پێنج دەقیقەی نەبرد کە شەڕو کێشماکێش لەم سەری پردەکەوە گەییە ئەوسەری پردەکەو خەڵکەکە کەوتنە گیانی یەکدی. مایڵز هندنو شازادە لەپڕ هەستیان کرد کە لە نێو لافاوی خرۆشاوی خەڵکەکەدا لێکدی جیا بوونەوەو گوشاری ئاپۆرا هەوسار پچڕیوەکە هەر یەکەیان بەرەو لایەك رادەماڵێ.

با جارێ ئەو دووە لە ئاستانەی بەسەرهاتو واریقاتێکی تازەدا بەجێ بێڵێنو بڕۆین بە سۆراخو سەروەختی تۆم کانتییەوە.

((٣٠))

## پێشکەوتنەکانی تۆم

لە کاتێکا کە پاشای راستەقینە، برسیو رووتو رەجاڵ هەر جارەی ڕێی دەکەوتە شوێنێکی وڵات، جارێ دەبوو بە هاوڕێی بەرەڵلاو بێکارانو مدەتێك دەبوو بە هاونشینی زندانیان، تۆم کانتی یان سوڵتانی درۆینە و ساختە، ڕۆژ بە ڕۆژ پتر بە تەختی دەسەڵاتدا سەر دەکەوتو پتر لە پلەو مەقامی خۆیدا جێگیردەبوو.

ئێمە کاتێ بە جێمان هێشت کە ڕۆژ بە ڕۆژ پتر خووی بە ژیانی پڕ شکۆو رازاوەی دەربارییەوە دەگرتو ئەو شتەی لە سەرەتاوە بەلایەوە ناخۆشو مایەی نیگەرانیو ناڕەحەتی بوو، بەرە بەرە خۆش دەبوو. تۆم ئێستا پایەی پاشایەتی بە مایەو سەرچاوەی شادیو بەختەوەری دەزانیو ئیدی ترسی ڕەوی بووەوەو لە هیچکەسێك نەدەترسا. ناڕەحەتی خەیاڵو پەشێوی هزرو بیر لە نیهادو ویژدانیدا باری کردبوو، و متمانەو ئارامی بیرو زاکونی کردار جێی گرتبووەوە. تۆم سوودێکی زۆری لە و هەواڵو زانیاریە جۆراو جۆرانە وەردەگرت کە همفری مارلو بۆی دێنان.

کاتێ کە بیویستایە کاتی خۆی بە گاڵتەو سوعبەتو گەمەو قسان بەسەر بەرێت، دەینارد بە شوێن لەیدی ئەلیزابتو لەیدی جینگری، و هەرکە لە هاونشینیو هاودەمی ئەوان تێر دەبوو، بێ هیچ دوو دڵییەك بە ئاماژەیەکی سەر مەرەخەسی دەکردن. ئەو شازادەخانمە سەلارو سەنگینانەش دەستی تومیان ماچ دەکردو بەوپەڕی نەزاکەتەوە لە ژوورەکەی وەدەردەکەوتن.

تۆم بە ڕادەیەك لە بەسەرهاتی پڕ بریقو باقو پڕ تەشریفاتی ژیانی خۆی رازی بوو، کە دەستووری دا ژمارەی پاسەوانانو خزمەتکارو دەستوپێوەندەکانی بکەنە دوو چەنانە. کە

دەنگی دەهۆڵ و شەیپوران لە ڕاڕەوەکانەوە بەرز دەبووەوەو دەرباریییان ناو بەناو بە دەنگی بەرز هاتنی موبارەکی ئەویان ڕادەگەیاند لە ڕادەبەدەر شادو شەنگوڵ و خۆشحاڵ دەبوو.
تۆم بەرە بەرە فێر بوو کە کۆڕو ئەنجوومەنە دەرباریەکان بەڕێوە بەرێت و لەو کاتانەدا کە لەسەر تەختی دەسەڵات دادەنیشت، پێشوازی سەفیرانی بیانی بکات. نێردراوان و شاندی بە نێوبانگترین و بە دەسەڵاتترین فەرمانڕەوایانی جیهان لە بەردەمیا کڕنۆشیان دەبردو ئیحتوبارنامەی خۆیان لە حوزوریا دەخوێندەوەو پەیام و نامەی پاشایانی خۆیان، کە ئەویان بە برا ناوزەد کرد بوو، عەرز دەکرد. بەڕاستی تۆم کانتی چەند بەختەوەرو کامەران بوو! وەزع و حاڵی ئێستای دەگەڵ ئەو زەمانەدا کە لە کەلاوەکانی ئوفال کورت دا دەژیا، چەندی فەرق بوو!
تۆم هەرگیز لە جل و بەرگی جوان و ڕازاوە تێر نەدەبوو و هەموو ڕۆژێ دەستوری دەدا کە جلکی نایاب تری بۆ بدرون. قسەی مەرایی ئامێزی دەربارییان لە گوێچکەی دا وەکو ئاوازی دڵنەوازی مۆزیقا دەنگی دەدایەوە، لێ ئەم ژیانە تازەیە، ئەم شکۆبازی و نازو نیعمەتپەروەرییە هیچ گۆڕانێکی لە ڕەفتارو ئەخلاقی ئەودا نەکردبوو، چونکە هەمان کوڕە میهرەبان و خۆشەویست و چاکەکارو دادپەروەرەکەی جاران بوو، و هەموو خەمێکی ئەوە بوو کە پشتیوانی لە مەزڵومان بکات، و جڵەوی ستەمکاران بگرێت و دژی یاساێن هەژارکوژو ناڕەوای وڵاتەکەی خۆی بخەبتێ.
کە یەکێك لە کۆنتەکان یان دۆکەکان پێی لە بەرەی خۆی درێژتر کردباو ویستبای لە هەنبەریا خۆی بنوێنێ، تۆم بە نیگایەکی تووڕە بێدەنگی دەکردو لە شوێنی خۆیدا فسی دەکردەوە، ڕۆژێك خۆشکە گەورەکەی، لەیدی مری یان (مری خوێن مژ) پێی گوت:
"تۆ لە گوناحی خەڵکانێکی زۆر خۆش دەبێت، کە هەقە بخرێنە زندانەوە، یان لە سێدارە بدرێن یان بە زندوویەتی بخرێنە ئاگرەوە، من ناچارم بیرت بخەمەوە کە بابی خاوەنشکۆمان زۆربەی کات شەست هەزار زندانی هەبووەو لەسەردەمی پاشایەتی پڕ شانازی ئەودا هەفتاو دوو هەزار دز بە دەستی جەلادان ئیعدام کراون"
تۆم کە لەم قسەیە پەست بوو بوو، بەرسڤی دایەوەو گوتی:
"بڕۆ لە خەڵوەتگەکەی خۆتا لە قاپی خودا بپاڕێوە تا لە جیاتی ئەو بەردەی لە سینگتدایە، دڵی ژنت عەتا بفەرمووێ!"
ئایا تۆم، قەت شازادەی واقیعی و پاشای ڕاستەقینەی مەملەکەتی بیردەکەوتەوە کە بەو هەموو نەجابەت و پیاوەتی و گەورەییە ڕێی دابوو بێتە ناو حەساری کۆشکەوە؟ لە ڕۆژان و شەوانی یەکەمەوە بە زۆری ڕێکدەکەوت کە تۆم بیری لێدەکردەوەو بە خۆی دەگوت:
"خودایا، شازادە چی لێهات؟ خۆزیا زوو دەگەڕایەوەو شوێنەکەی خۆی وەردەگرتەوە!" لێ زەمان بە خێرایی تێپەڕی بوو، و هیچ هەواڵێك لە شازادەوە بە دەست نەهاتبوو.
تۆم-ش ڕۆژ بە ڕۆژ پتر نقومی شکۆو جەلالی ژیانی تازەی خۆی بوو بوو و شازادەی خاوەن فەزڵ و چاکەی فەرامۆش کردبوو. کاری گەیی بووە ئاستێك کە هەندێجار وێنەی ئیدوارد تودوری دەهاتە بەرچاو، هەوڵی دەدا خەیاڵی ئەو لەسەری خۆی دەربکات، چونکە کە ئەوی بیر دەکەوتەوە، هەستی بە شەرمەزاری و گوناح دەکرد.

تۆم، بە یادو یادەوەری دایك و خوشكەكانیشی ئاسودە نەبوو. لە رۆژانی هەوەڵەوە زۆری بیردەكردن و بە رادەیەك غەریبی دەكردن كە لە كانگای دڵەوە حەزی دەكرد جارێكی دی بیانبینێ، بەڵام پاشان هەركاتێ ئەوەی بە بیرا هاتبا كە لەگینە دایكی و خوشكەكانی رۆژێك بە جل و بەرگی شڕۆ شەپرێویانەوە بێن و بۆ ماڵە دێرینەكەیان، بۆ هەواری نەگبەتی و هەژاری وداماویەكەی جارانی بەرنەوە، لە ترسا لەرزی لێدەهات. بۆیە تۆم یادو یادگاری كەس و كارەكەی خۆی بە یەكجاریەكی لە بیر خۆی بردەوەو بەرە بەرە وێنەی ئەوانی لە لەوحی نیهادو ویژدانی خۆیدا سڕییەوە. تۆم، بۆ خۆشی و ئاسوودەیی خۆی پێویستی بەم فەرامۆشكردنە بوو. چونكە، ئەگەر وای نەكردبا، هەركاتێ ئەوانی وەبیر هێناباوە هەستی دەكرد كەسێكی بەدبەخت و كلۆڵەو، كوڕی ئەم جۆرە خێزانە تەنانەت لە كرمیش بێ بایەخترە.

لە نیوە شەوی نۆزدەی شوباتدا، لە كاتێكا خولام و نۆكەرانی وەفادارو دڵسۆز، چاودێریان دەكردو بە دەوریا دەهاتن، تۆم كانتی بەوپەڕی شكۆو جەلالەوە، خەوت و لە خۆشی ئەوەی كە سبەینێ ئاهەنگی تاجگوزاریان بۆ بەرپا دەكرد، لە پێستی خۆی نەدەهێوری. لە هەمان كاتدا، ئیدوارد تودوری پاشای راستەقینەی وڵات، بە جلكی شڕو ورگی برسییەوە، پاش كۆتایی ئەو شەڕەی كە لەسەر پردی لەندەن لە نێو خەڵكەكەدا قەوما بوو، لێشاوی خەڵكەكە وەكو ئاوماڵكە رای ماڵی بوو، ئەنجام لەبەر دێری (ویستمنیستر)دا كە كرێكارێكی زۆر خەریكی نۆژەنكردنەوەی بوون، گیرسایەوە.

((٣١))

## ژنێ، من تۆ ناناسم

سبەینێ كاتێ تۆم كانتی بەیانی زوو لە خەو رابوو، سەیری كرد لە هەر چوارنكالی شاراوە، دەنگی هەراو هوریایەكی بەشكۆ بەرزبووەتەوە. تۆم كە گوێی لەم سەرو سەداو هەراو هوریایە بوو هەستی بە لەزەت و غرورێكی لە رادەبەدەر كرد، چونكە ئەم سەروسەدایە نیشانەی ئەوە بوو كە میللەتی ئینگلیز وەكو پێویست خۆی بۆ بەشداری لە ئاهەنگ و رێوڕەسمی تاجگوزاری ئەودا ئامادە دەكات.

دوای سەعاتێك تۆم كانتی. خۆی لە ریزی پێشەوەی كاروانێكی گەورەو بە شكۆی گاردو پاسەوانان و دەست و پێوەندان دا بینییەوە كە لە سەمتی روباری لەندەنەوە بەرێ كەوت، چونكە بە گوێرەی داب و نەریتی زۆر كۆنی باوی وڵاتی ئینگلیستان، پاشای تازە دەبێ هەمیشە لە ((بورجی لەندەن))ەوە حەرەكەت بكات و لە رێگەی روبارەوە بچێتە ناو پایتەختی خۆیەوە.

كاتێ كە حەشاماتەكە گەییە بورجی لەندەن، وا دەهاتە بەرچاو كە ئەو بورج و قەڵا كەونارایە لە حاڵی سووتان و تەقینەوەدایە. لە هەر هەموو كلاورۆژنەو دەلاقەو دەرودیوارانی قەڵاكەوە بڵێسەی ئاگر دەهاتە دەرێ. دوای تۆزێك دەنگی تەقینەوەیەكی گەورە بەرز بووەوە، دەنگەكە هێندە بەسام و گەورە بوو كە فریادو هاواری شادی و خۆشی جەماوەری خەڵكەكەی خستە ژێرەوەو ئەرزو ئاسمانی هێنایە لەرزە. دووكەڵێكی رەش و چڕ دەوری بورجی لەندەنی داو لەو قەڵا

گەورەو بە سامو مێژووییە جگە لە ئالای دەوڵەتی کە لەسەر ترۆپکی بورجەکە هەڵکرا بووو بەدەم شنەی باوە دەشەکایەوە چ شتێکی دیکە نەدەبینرا.

هەرکە تۆم لە بەلەمی پاشایەتی دابەزی، سواری ئەسپێکی چەلەنگو زریپۆش کرا کە زریی بەرۆکەکەی لە عاردی دەخشا. خاڵی، لۆرد هرتفورد کە بە (دۆك دوسامرست)و (لۆرد وەسی) ناسرا بوو لە دوایەوە وەستا.

"گاردی شاهی" کە سەراپا لە چەكو پۆڵادا نقوم بوون، چوار دەوری تۆم-یان گرت. لە دوای "خاڵی" شاوە، ژمارەیەکی زۆر لە نەجیبانی دەرەجە یەك دەگەڵ نۆکەرانو سوارانی خۆدا، و هەروەها لۆرد شارەوانی شاری لەندەنو ژمارەیەکی زۆر لە پایە بەرزانی شارەوانیو نوێنەرانی سەندیکای پیشە جیاوازەکانو سەرانی بەشە جۆراو جۆرەکانی پایتەخت، لەوانە بەشی تۆپخانە کە بە گوێرەی دابو نەریتی کۆنو دێرین نزیکەی سێسەد ساڵ بوو ئیمتیازاتی تایبەتیان هەبووو سەربەخۆیی خۆیان هەبوو، هەر هەموویان لە دوای (خاڵی) شاوە ریزیان بەست.

پیاو راست بڵێ دیمەنێکی جوانو مێژوویی بوو! پاسەوانانی کەژاوەو کاروانەکەی شا، بەم شکۆو شکۆمەندییەوە بە نێوان دوو ریزی تەنگەبەری خەڵکی شاردا کەوتنەرێ. لە هەموو لایەکەوە هاواری خۆشیو شادیو هورای خێرهاتنو دوعای میهر ئامێزو ئاوازی پڕ لە خۆشەویستی بۆ شای گەنج بەرزبووەوە.

تۆم، جارجارێ لە وەڵامی خەڵکەکەدا دەیگوت:

"خوا راوەستاوتان بکات". ئەم وەڵامە رەنگدانەوەی هەستی شای لاو بوو دەرهەق بەو هەموو میهرو لوتفەی کە هەمووانی هێنا بووە جۆشو فرمێسکی شادی زایاندبووە چاوی گەلێك لە نۆکەرانو دەستوپێوەندەکەی.

تۆم ناچار بوو لە شەقامی (فنچرچ ستریت) بوەستێت. لە سوچێکی شەقامەکەدا، منداڵێکی قژ زەرد چوو بووە سەر کورسییەکی نزمو وتارێکی بە بۆنەی خێر هاتنی شاوە دەخوێندەوە. تۆم دەیڕوانیە سیمای شەنگوڵی ئەو خەڵکە کە بە تاسەو خۆشییەوە تێیان دەڕوانی، و دڵی پڕ بوو لە خۆشیو شادی. بەستەزمانە لەو دەمەدا لەفکران ڕاچوو و لە دڵی خۆیدا گوتی:

"بێگومان لە دنیادا هیچ شتێك لەمە خۆشتر نیە، ئینسان خۆشەویستو ئازیزی میللەتێك بێ!"

کاتێ کەژاوەو کاروانەکەی شا جارێکی دی کەوتەوە ڕێ، تۆم لە ریزی پێشەوەی حەشاماتەکەدا، چاوی بە دوو کەس لە کۆنە هاوڕێکانی خۆی کەوت کە لە گەڕەکی ئوفال کورتدا هاووازی خۆی بوون. ئەم دووانە دوو منداڵی بێکارەی وێڵ بوون کە ئەوسا لە گەمەی منداڵانەدا یەکێکیان دەوری (دەریا سالار)و ئەویتریان رۆڵی (سەرەك وەزیران)ی لە دەربارە خەیاڵییەکەی تۆمدا دەبینی.

تۆم کە ئەوانی بینی هێندەی دی خۆشحاڵ بوو و باچووە کەوڵیەوەو لە دڵی خۆیدا گوتی:

"حەیفێ کە ئێستا بەم جلو بەرگەوە نامناسنەوە، بەستەزمانانە لە کوێ تەسەوری ئەوە دەکەن کە من ئێستا بووم بە پاشای راستەقینەو دەربارییانو شازادانی راستەقینەم لە خزمەتدانو هەر هەموو میللەتی ئینگلیز لەبەر پێی خۆمدا دەبینم؟"

بەلـەنگازە زۆری حـەزدەکرد ئاماژەیـەك بـۆ کۆنـە هاوڕێکـانی بکـاتو لـە وەزعو حـاڵی خـۆی ئاگاداریان بکات، لێ بەسەر هەستە سەرکێشەکانی خۆیدا زاڵ بوو و بە خۆی گوت: "نا، نا، ئەمە کارێکی زۆر مەترسیدارە."

ناچار رووی لەوان وەرگێڕاو چاوی بڕییە شوێنێکی دیکە. جارجارێ کە جاڕچیەکان، هاواریـان دەکردو دەسـتووریان بـە جـەماوەری خـەڵکی دەدا ڕێگـە چـۆڵ بکـەن، تـۆم چنگـێ دراوی زێـڕی لـە بەرکی دەردێنـاو بـە چـەپو راسـتدا بەسـەر حەشـاماتەکەیدا دەوەشـاند. بێکـاران هێرشـیان دێنـاو دراوەکانیان لە دەستی یەکتر دەڕفاند.

لـە کۆتـایی شـەقامی (گـریس چـرچ ستریت)دا، تـۆم بـە ژێـر (تـاقی پێشـوازی)یـەکی زۆر رازاوەو بەشـکۆدا تێپـەڕی کـە ژمارەیـەکی زۆر لـە ئەکتـەرانی ژنو پیـاوی شـیرینکار لەوێنـدەر خـڕ بـوو بوونـەوەو بـەنمایش لاسـایی (پێشـینانی) ئـەویان دەکـردەوە. ژنێـك خـۆی کردبـوو بـە ئـەلیزابت دیورك، یەکێك خۆی کردبوو بە هنری حەوتەم، یەکێك بە هنری هەشتەمو ژنێکیش خۆی کردبوو بە جین سیمور. پاشان بە ژێر کۆمەڵێك تاقی دیکەدا ڕەت بوو، و خەڵکانێکی زۆر چوو بوونە سەر کورسیانو هورایـان دەکێشـاو خێرهانینـان دەکـردو پیرۆزباییـان لێـدەکرد. پاشـان چـاوی بـە زۆر شانۆی دیکە کەوت کە شانۆنامانی کۆمیدیو مێـژوویيان لەسـەر نمـایش دەکـرد. تـۆم کـانتی کـە سەرمەستی دیتنی ئەم هەموو دیمەنە بەرزو نایابو شکۆدارانە بوو بوو، لە ژێر لێوانەوە بە خۆی دەگوت:

"کاتێ بیر دەکەمـەوە کـە هـەر هـەموو ئـەم ئاهـەنگو جـەژنو بەزمـە لەبـەر خـاتری مـن بـەرپاکراوە، هێندە بە خۆ دەنازم، هێندە شانازی بە خۆ دەکەم خەریکە لە خۆشیا باڵ بگرم!"

هـەر بەڕاسـتیش گۆناکـانی تـۆم بەڕادەیـەك سـوور هەڵگـەڕا بـوون،و بـە جـۆرێ پرشـنگی شـادیو لەزەت لە چاوانیا دەبریقایەوە، داماوە خەریك بوو شێت بێ.

لە کاتێکا کە تۆم جارێکی دیکەش دەیویست چنگـێ زێڕ بەسەر خەڵکەکەدا هەڵدا، لـەپڕ لـە نێو ئاپۆرای تەمەشاڤانەکانەوە، چاوی بە ژنێکی لاوازی رەنگو روو سیسەڵەو چرچـەڵە کـەوت کـە بـە تاسەو تامەزرۆییەکی تەواوەوە، بە سیمای ماتو حەیرانەوە نیگای ئەوی دەکرد. ئەو ژنە دایکـی بوو. تۆم بێ ئختیار دەسـتی خسـتە بـەردەم دەموچاوی خـۆی تـا نەناسـرێتەوە، لـێ مـەدام کـانتی دڕی بە قەرەباڵغییەکەی دەوروبەری داو بەپەلە خۆی گەیاندە شاو پێی راستی گـرتو کـەوتـە مـاچ بارانیو بە دەنگی لەرزۆكو ئەوکی تەژی گریانەوە، لێکدا لێکدا هاواری دەکردو دەیگوت:

"جەرگەکەم، کوڕە ئازیزەکەم؟"

تۆم گوتی: "ژنێ، تۆ کێی؟ من تۆ ناناسم!"

لەو کاتەدا، یەکێك لـە ئەفسـەرانی گـاردی شـاهی قـۆڵی ژنـەی تـایینی گـرتو بـە تونـدیو دڵرەقـی تەواوەوە توڕی دایە نێو ئاپۆراکە. دوای تۆزێك تۆم لە قسەکەی خۆی ژێوان بووەوەو لـەو سـاتەدا کە دایکی میناکی گیانلەبەرێکی پێکراو نیگای زەبوونی بڕی بووە ئەو، بـە جـۆرێ لـە خـۆی بێـزار بوو و لە ناخی دڵەوە شەرمەزار بوو کە دنیای لەبەر چاو تاریك بوو، و هەسـتی کـرد کـە هەرچیەك لە خۆیو لە دەوروبەری خۆیدا دەبینێ روو لە وێرانیو پوکانەوەو نەمانە.

کاروان و کەژاوەکەی شا بە نێو لافاوی خرۆشاوی هەراو هەنگامەی بەردەوام و شادی بەخشی خەڵکەکەدا درێژەی بە ڕێڕەوی خۆی دەدا، بەڵام تۆم ئیدی نە هیچی دەبینی و نە هیچی دەبیست، بەدبەختە لەم هەموو شکۆو جەلالە دەترسا و عەزابی ویژدان ئارامی لێ بڕی بوو. تۆم لە گەرمەی ئەو کودەتا روحی و دەرونیەدا لە دڵی خۆیدا دەگریاو دەیگوت:

"خودایا، ئایا ڕۆژێ دێ، ئازادی خۆمم وێدەیتەوە؟" داماوە لە کاتێکا کە سەری داخستبوو و بە هیچ جۆرێ تەمەشای لێشاوی خرۆشاوی ئاپۆراکەی نەدەکرد، هەستی دەکرد کە دایکە نەگبەتەکەی بە هەمان دەقەوە لەبەر چاویا وەستاوەو بە روخساری بێ ڕەنگ و سیمای پڕ کول و کۆڤانەوە تەمەشای ئەو دەکات.

خەڵکەکە بەردەوام دەیانگوت: "ڕێگە چۆڵ بکەن، ڕێگە بدەن... بژی ئیدوارد، پاشای ئینگلیستان!"

بەڵام تۆم کە هیچ شتێك لەو قسانە حاڵی نەدەبوو و هوراو هاوارو سەرو سەدای خەڵکەکە وەکو هاڕەو هاژەیەکی دوورە دەستی ئوقیانوسێکی خرۆشاوی کەف چەڕین لە گوێی دا دەنگی دەدایەوە، و جگە لەمە هیچی دیکە لەو هەموو جۆش و خرۆشە حاڵی نەدەبوو. ئەو قسە نەنگینانەی کە تۆزێ لەوە پێش بە دایکی گوتبوو، یانی :ژنێ، تۆ کێی؟ من تۆ ناناسم" بەردەوام لە گوێیدا دەزرینگایەوە، خەم و پەژارەی بەسەر روخساریا دەباراند.

بەرە بەرە، شەوق و زەوقی جەماوەرەکە لە کزی دەدا. ژمارەیەکی زۆر لەو خەڵکە بێکارە، بە نیگەرانی و پەشێویەکی زەق و دیارەوە بڕۆیان وێك دێنایەوەو دەستیان لە هەراو زەناو خۆشی و شادی هەڵدەگرت. هوراکێشانی خێرهانین و دروشمانی شادی بەخش بەرە بەرە دەنیشتەوە. لۆرد وەسی کە یەکەمجار هەستی بەم ساردبوونەوەیەی خەڵکەکە کرد بوو، ئەسپەکەی بەر مامێزان دا بوو، و خۆی گەیاندبووە تۆم و کلاوەکەی بەرەسمی ڕێز لەسەر دادەکەنێ و هەر لەسەر ئەسپەکەیەوە کڕنۆشێك دەبات و بەئەسپایی بەگوێیدا دەچپێنێ:

"خاوەنشکۆ، ئێستا بە هیچ کلۆجێ کاتی بیرکردنەوەو خەم خواردن نیە. میللەت هەر هەموو هەستیان بە خەمباری پاشا کردووەو ئەمە بە نیشانەی شوومی دەزانن. داوای بوردن دەکەم من حەدم نییە نەسیحەتی تۆ بکەم، هەوڵبدە ئەم خەم و پەژارە نابەجێیە لەدڵی خۆت بڕەوێنەوەو بزەی لوتف و مەرحەمەت بەرووی میللەتی تاسەمەندو ئومێدەواری خۆتا بدە!"

لۆرد دوای ئەو قسانە چنگێ دراوی زێڕی بە چەپ و راستی خۆیدا وەشاندو ئەوجا بۆ شوێنەکەی خۆی گەڕایەوە. تۆم ئامۆژگاریەکەی ئەوی وەرگرت و بزەیەکی کرد، بەڵام بزەکەی هیچ گەرمی و سەفایەکی نەبوو. داماوە جارەکی دی بە لوتف و میهرەبانی و بە ئاماژەی سەر سڵاوی لە ئاپۆراکە کردو بە سەخاوەت و کەرەمێکی بەڕاستی شاهانەوە کەوتە زێڕوەشان بەسەریاندا. ئاپۆراکە، نیگەرانی و پەشێوی خۆیان لە بیرکردو جارێکی دی هاواری شادی و خۆشی لە گەڕەك و بانانەوە بەرزبووەوە.

بە ماوەیەکی کەم بەر لە تەواو بوونی ڕێپێوانە شاهانەکە، لۆرد وەسی جارێکی دی ناچار بوو خۆی بگەیەنێتە شاو عەرزی بکات:

"خاوەنشکۆ، تکات لێدەکەم ئەم خەمو پەژارەیە لە خۆت بڕەوێنەوە. و لە بیر نەچێت کە میللەتەکەت خەمی تۆیانە. ئاخ لە دەست ئەم ژنە! بێگومان ئەو بووە مایەی خەمو پەژارەی خاوەنشکۆتان!"

تۆم، نیگایەکی ساردو سڕی سیمای شیرەتکارەکەی خۆی کردو گوتی: "ئەو ژنە دایکی من بوو!".

لۆرد وەسی کە جارێکی دی بە مەبەستی گەڕانەوە بۆ سەر شوێنەکەی خۆی، ئەسپەکەی بەرمامێز دەدا لە بن لێوانەوە گوتی: "وایش خودایا! دیسان شێتیەکە سەری لێ هەڵداوەتەوە!".

((٣٢))

## ئاهەنگی تاجگوزاری

جا با ئێستا بگەڕێینە دواوەو لە سەعات چواری بەرەبەیاندا بۆکلێساو دێری (ویستمنیستر) بڕۆین. هەڵبەتە هەر ئێمە بە تەنێ لەوێ نابین،و خەڵکانێکی دیکەش لەوێ دەبن. هەرچەندە سەعات چواری بەیانی هێشتا هەر شەوەکییەو دنیا روناك نەبووەتەوە، بەڵام شانشینو ڕاڕەوەکانی کلێساو دێرەکە کە مەشخەڵی تیا داگیرساوە، هێندە قەرەباڵغن، دەرزی هەڵبدەی ناکەوێتە عاردی. ئەم جەماوەرە زۆرە لێڕاون تا هەر سەعاتێ کە پێویست بێ چاوەڕوان بکەنو بە هەوای دیتنی دیمەنێکی جوانو بەشکۆ کە رەنگە لە عەمراتی خۆدا جارێکی دی دیمەنی وەها نەبیننەوە، دابنیشن.

بێدەنگییەکی قورس باڵی بەسەر کلێساکەدا کێشاوە. مەشخەڵەکان پرشنگ دەهاونو چاوبڕکێ دەکەنو میلی سەعات زەمەن دەبڕێ. ئەنجام بەیان دەداو ئەوجا هەتاو هەڵدێ.

مەشخەڵەکان دەکوژێننەوە، و داڵانو حەوشەی دێرەکە روناك دەبێتەوە.

لە سەعات حەوتی بەیانیدا، یەکەمین گەورەخانمی نەجیمزادەو خانەدانی وڵات. بە جلی ئاڵاو واڵاوە، تاوس ئاسا خۆی بە حەوشەی دێرەکەدا دەکات، یەکێك لە پەردەدارانی مەخمەلپۆش ڕێنوێنی دەکاتو بۆ سەر ئەو کورسییە دارینەی دەبات کە لە داڵانی دێرەکەیان داناوە. پەردەدارێکی دی کە لە دواوە چمکی کراسە درێژەکەی ئەو خانمە بەرێزەی هەڵگرتووە، لە دوایانەوە دێتو هەرکە خانم لەسەر کورسیەکە دانیشت، تەپڵەکێکی نرم دەخاتە ژێر پێیو تاجەکەی لە نزیکییەوە، کە دەستی بیگاتێ، دادەنێ. دوای تۆزێکی دی خانمانی خانەدانی تریش بە جلی ئاڵاو واڵای شپو شۆڕەوە دەگەنە جێ. هەموویان جلی ئاڵاو واڵای حەریرو ئەتڵەسیان لەبەرەو یەك لە یەکیان جوانترو بەشکۆتر دەنوێنێ. هەیوانی دێرەکە بەو خانمانەوە وەکو باخچەیەکی پڕ لە گوڵی گۆشتین دەنوێنێ.

سەعات نۆی بەیانییە، هەتاو داویە لە هەیوانو حەوشە سەلبەندەکەی دێری ناڤبری، سەفیرانی بیانی وەژووردەکەون. جا ئێستا با هەناسە لە خۆ بڕین، بێدەنگ ببینو چاوان بکەینەوەو نوقمی سەیرو تەمەشا بین. چونکە یەکێك لە سەفیرەکان لە وڵاتێکی دووری رۆژهەڵاتەوە هاتووەو هێندە

به شکۆو جەلالە کە سەراپای جلەکانی جەواهێراتی گرانبەهایە. سەفیری تاین، دەڵێی یەکپارچە ئاگرەو پرشنگ بە دەوری خۆیدا دەهاوێ.
جا ئێستا با گێڕانەوەی چیرۆکەکە لە حاڵی حازرەوە بۆ رابردوو بگوازینەوە، چونکە ئەم گۆڕینی زەمەنە بە باوەڕی ئێمە لە رووی دڵگیریی و جوانکاری چیرۆکەکەوە زۆر پێویستە.
بەڵێ، سەعاتێك بوری، دوای ئەوە سەعاتانی دیکەش تێپەڕین. لەم کاتەدا دەنگی تۆپ بەرز بووەوەو نزیکبوونەوەی هاتنی شاو دەستوپێوەندەکەی راگەیاند. لەو کاتەدا کە پاشایان بۆ رێورەسمو ئاهەنگی تاجگوزاری ئامادە دەکرد، ژمارەیەکی زۆر لە نە جیبانی دەرەجە یەکی مەملەکەت هاتنە دێرەکەوە. تەمەشاڤانان کە لە راڕەوو شانشینەکانی دێروکڵێساکەدا خڕ بووبوونەوە بە چاوێکی کونجکاوانە دەیانڕوانیە ئەم هەموو (دۆك، و کۆنت، و بارون)انە کە پێنج دانە سەدە بوو ناوی پڕ شانازیان بەڕێزو حورمەتەوە دەبراو لەسەر زاران بوو. دوای ئەوەی کە نەجیبانو پیاوماقولانی نمرە یەك لە جێی خۆیان دانیشتنو تاجەکانیان لە تەنیشت خۆوە دانا، ئەوجا رۆحانیانی پایەبەرزی کڵێسا بە کڵاوی درێژی ئەسقوفییەوە وەدیارکەوتن. لە دوای ئەوانەوە (لۆرد وەسی)و وەزیرانی وڵاتو دەستەیەك ئەفسەری نێزەدار وەژوورکەوتنو لە هەیوانێکدا کە هەمووی بە مافوری گرانبەها راخرابوو، جێگیر بوون. لەم کاتەدا دەنگی تەپڵو شەیپورو کەڕەنا بەرزبووەوە. تۆم کە شانێلێکی ئاڵدۆزی بەسەر شانەوە بوو، هاتە حەوشی کڵێساکەوەو لە هەیوانەکەوە تێپەڕیو چوو لەسەر تەختی پاشایەتی کە لە ناوەندی کڵێساکە دایان نابوو، دانیشت. شا بە رادەیەك پەستو غەمگین بوو، کە بایەخێکی ئەوتۆی بە ئاهەنگو رێوڕەسمی بەشکۆی بۆنەکە نەدا. رەنگی هەڵبزڕکا بوو. نا ئومێدی و دڵساردی باڵی بەسەر دڵو دەروونو روحیا کێشا بوو، و سەرزەنشتو عەزابی ویژدان چرای دەرونیان کوژاندبووەوە.
دوا بەرنامەی ئاهەنگەکە ئەنجام درا، یانی گەورە قەشەی کانتربوری تاجی پاشایەتی ئینگلیستانی، لەسەر نازباڵنجێك کە لەلایەوە دایان نابوو، هەڵگرتو نایە سەر سەری لەرزۆکی جێنشینی هنری هەشتەم. هەر هەموو نەجیبو پیاو ماقولەکان هەرکە ئەم دیمەنەیان بینی تاجەکانی خۆیان هەڵگرتو لەسەریان نانو لە جێی خۆ کڕو بێدەنگ بوون، بێدەنگیەکی قورسو قوڵو مانادار باڵی بەسەر کڵێساکەدا کێشا بوو.
بەڵام لەو دەمەدا منداڵێك کە کەس لە هاتنە ژوورەوەی لە ناکاوی ئەو ئاگادار نەبوو، و دەتگوت بەزەبری پەرجۆیەك لە ئاسمانەوە رێی کەوتبووە ئەوێ، لە حەوشەی کڵێساکەدا پەیدا بوو. منداڵەی تاین کڵاوی لەسەر نەبوو. جلەکانی شڕو پێڵاوەکانی کۆنو دڕاو بوون. منداڵی تاین، بە شێوەیەکی ئامیرانە کە لەسەرو وەزعی نالەباری ئەو نەدەوەشایەوە، دەستی بەرزکردەوەو بە دەنگێکی رەوان گوتی:
"ئێوە مافی ئەوەتان نیە تاجی پاشایەتی ئینگلیستان لەسەر ئەم خائینە بنەن. من پاشای ئێوە!"
یەکسەر دە کەس لە نەجیبانو پیاوماقولان، کە زۆر توڕە بوو بوون، بۆی هەستان، لە هەمان کاتدا تۆم کانتی-ش لەسەر تەختی پاشایەتی هەستاو چەند هەنگاوێکی بەرەو منداڵەکە ناو، رووی کردە پیاوماقولەکانو گوتی:

"وازی لیَ بێنن با بیَ، پاشای راستەقینە ئەوە!"
ترس‌و خۆفێکی نادیار کەوتە دڵی ئامادەبووانەوە. هەندێکیان لە جێی خۆ هەستان‌و سەرسام‌و حەیران چاویان بڕییە یەکتر، دەتگوت بە نیگا لێکدیان دەپرسی:
"ئەریَ ئێمە خەو دەبینین یان بێدارین!"
و یەکسەر روویان کردە ئەکتەرانی راستەقینەی ئەم شانۆگەرییە سەیرە. لۆرد وەسی کە سەرەتا لە هاوڕێکانی خۆی پتر مات‌و حەیران بوو بوو، بەرە بەرە هێور بووەوەو بە دەنگێکی ئامیرانە هاواری کردو گوتی:
"خەڵکینە ئەنگۆ، گویَ بە قسەکانی خاوەنشکۆ مەدەن. ئەم رەفتارە ناماقول‌و نابەجێیەی ئەو نیشانەی سەرهەڵدانەوەی نەخۆشیەکەیەتی، یەکسەر ئەم منداڵە بەرەڵلایە بگرن!"
کۆمەڵێك ڕابوون کە فەرمانەکەی لۆرد وەسی ئەنجام بدەن، لیَ تۆم تورە بوو، پێی بە عارديدا داو دیسان هاواری کردو گوتی:
"ئامان نەکەن دەست بۆ ئەم کوڕە درێژ بکەن! ئەو پاشای ئێوەیە!"
ئەوانە کە هەستا بوون بۆ گرتن‌و لێدانی کوڕە بەرەڵلاکە سارد بوونەوەو دەستیان داگرت، ئامادە بووان لە جێی خۆ وشك بوون. کەس نە جووڵەی دەکرد نە زاری هەڵدێنا. وەزعەکە بە رادەیەك سەیرو عەجایەب بوو کەس نەیدەزانی دەبیَ چ بکەن. عەزم‌و جەزم‌و متمانەو توانایەکی روحی‌و دەرونی بیَ وێنە بە سیمای کوڕەی بێکارەوە دیاربوو. کوڕەکە بە هەنگاوی بتەوەوە بەرەو تەختەکە رۆیی‌و بە پلەکانیا سەرکەوت. تۆم لێی چووە پێشیَ، لە بەردەمیا چۆکی داداو گوتی:
"پاشای من، خاوەن فەزڵ‌و وەلی نیعمەتی مەحبوبی من، یەکەم کەس کە وەفاداری‌و دڵسۆزی خۆی عەرزی تۆ دەکات منم. تکا لە زاتی موبارەکی شا دەکەم تاجی پاشایەتی کە حەڵاڵی خۆیەتی، لەسەر بنێت‌و ببێتەوە بە پاشا!"
لۆرد وەسی هەوەڵجار بە چاوێکی پڕ غەزەب و گلەیی و پاشان بە ستایش‌و دڵبەندییەوە روانییە سیمای کوڕەی بەرەڵلا، یارو یاوەرەکانیشی هەمان گۆڕانی ئەویان بەسەرهات. هەموو ئامادەبووان بە شێوەیەکی غەریزی هەنگاوێك کشانەوەو هاواریان کرد:
"خودایا، چەند لێکدی دەچن!"
لۆرد وەسی. بۆ ساتێك لەفکران راچوو. ئەوجا روویکردە کوریژگەکەو گوتی:
"دەمەویَ چەند پرسیارێکت لێبکەم".
منداڵە بەرەڵلاکە گوتی:
"زۆر چاکە، پرسیار لە تۆو وەڵام لە من!"
ئەوسا لۆرد هرتفورد چەند پرسیارێکی سەبارەت بە دەربارو خودی خاوەنشکۆی رەحمەتی هنری هەشتەم‌و شازادەی گاڵ‌و شازادەخانمانی دەرباری کرد.

کوڕیژگەی تاین. بێئەوەی هیچ گرێیەکی بێنێتەبەر یان هیچ شتێك لە بیربکات وەڵامی هەموو پرسیارەکانی دایەوەو کورتەیەکیشی لەمەڕ چۆنیەتی کۆشکی پاشایەتی تەلارەکەی هنری هەشتەمو ژوورەکەی شازادەی گالو شازادەخانمەکان بۆ شەرح کرد.

هەر هەموو حەیرانو سەراسیمە تەمەشای یەکتریان دەکرد. هەندێکیان سەریان وەپەنا گوێی یەکدی دەبردو دەیانگوت:

"بەڕاستی سەیرە! بەڕاستی عەنتیکەیە!" تۆم-ش لە دڵی خۆیدا دەیگوت: "شوکر بۆ خوا کە نەجام بوو!" بەڵام لۆرد هرتفورد سەری لەقاندو گوتی:

"بەڵێ، بەڕاستی سەیرە، بەڵام ئەم بەڵگانە بە تەنیا بۆ سەلماندنی ناسنامەی ئەم کوڕە بەس نین."

لۆرد وەسی جارێکی دی لە فکران ڕاچوو،و چەند جارێك سەری لەقاندو لە دڵی خۆیدا گوتی:

"پێویستە بە هەر شێوەیەك بووە ئەم مەتەڵە هەڵ بهێنرێ، دەنا دووبەرەکی دەکەوێتە نێو خەڵکییەوەو تەختو تاجی ئینگلیستان دەکەوێتە خەتەرەوە."

لەم کاتەدا لۆرد وەسی لەپڕ بڕیاری خۆی داو ڕووی کردە یەکێك لە ئامادە بووانو گوتی:

"سێر تۆماس، یەکسەر ئەم بەرەڵلایە بگر...."

لێ هێشتا قسەکەی تەواو نەکردبوو لە پڕ بیرێکی بە مێشکا هاتو گوتی:

"نا، نا، کەمێك سەبربکەن!"

گرژیو مۆنیەکەی سەرو چاوی ڕەوی بووەوە، بەو دەقەوە ڕووی کردە کوڕیژگەکەو گوتی:

"پێم بڵێ بزانم تەمغە گەورەکەی پاشایەتی لە کوێیە؟ ئەگەر وەڵامێکی دروست بدەیتەوە ، ئەوا مەسەلەکە چارەسەر دەبێ، چونکە تەنیا وەلیعادو شازادەی ڕاستەقینەی گال دەزانێ تەمغەکەی لە کوێ داناوە. بەڵام بەر لەوەی وەڵام بدەیتەوە کەمێك بیربکەوەو ئەوە بزانە کە حەیسیەتو ئیحتوباری تاجو تەختی ئینگلیستان و ماڵباتی پاشایەتی تودور لە ئارادایە، ئەمە گاڵتەی منداڵان نیە!"

هەموو بە تەما بوون کە کوڕەی تاین لە تەریقیو شەرمەزاریدا سەر دابخات، یان ڕێی هەڵاتن بگرێ، بەڵام بە پێچەوانەوە بە دەنگێکی هێمنو هێدی وەڵامی دایەوەو گوتی:

"ئەمە ئاسانە!"

ئەوسا بە سادەییو ویقارو کارامەیی کەسێکەوە کە ساڵانێك حوکمڕانی کردبێت ڕووی کردە لۆرد سان جۆنو گوتی:

"لۆرد سان جۆن، داوات لێدەکەم یەکسەر بڕۆ بۆ کۆشك. لە ژووره تایبەتیەکەی مندا کە تۆ زۆر جارت دیتووەو کون بە کونی شارەزایت، لە گۆشەی چەپی ژوورەکەدا، لەو شوێنەدا، کە لە دەرگای نێوان هەردوو ژوورەکەوە دەکاتە دوورترین خاڵ، مێخێکی مس بە دیوارەکەدا داکوتراوە. توند دەست بەو مێخەدا بنە، دەرکەی سەندوقێکی جەواهێر کە جگە لە منو ئەو وەستایەی دروستی کردووە کەسی تر پێی نازانێ، دەکرێتەوە. یەکەم شتێك کە دەکەوێتە بەرچاو ئەو تەمغە گەورەیەیە. یەکسەری دەستی بدەیەو بۆ ئێرەی بێنە!"

ئامادەبووان کە گوێیان لەم قسەیە بوو، لە دڵی خۆدا گوتیان: "بەڕاستی سەیرە! لەمەش سەیرتر ئەوەیە کە لۆرد سان جۆنی ناسی و بەناوی خۆیەوە گازی کردو میناکی کەسێك کە ساڵانێك گەورەی ئەو بووبێ، ئەمری پێکرد!".

لۆرد سان جۆن کە غەرقی حیرەت بوو بوو، لەزگ بوو بە گوێی بکات و بڕوا، لێ یەکسەر ڕەنگی سوور هەڵگەڕاو گەڕایەوە شوێنەکەی خۆی. تۆم کانتی لێی چووە پێشێ و گوتی:

"بۆ دوو دڵی؟ گوێت لە فەرمانەکەی خاوەنشکۆ نەبوو؟ یەکسەر بە گوێی بکەو بڕۆ!"

لۆرد سان جۆن، بۆ ئەوەی کێشە بۆ خۆی دروست نەکات ئیکلامێکی کرد، لێ ڕووی ئەم ئیکلامە پتر لە تەختی عاردی ژوورەکە بوو تا لە دوو منداڵەکە. ئەوسا بەرەو یەکێك لە دەرگاکانی کڵێساکە ڕۆیی.

هەرکە لۆرد سان جۆن لە کڵێساکە وەدەرکەوت، گۆڕانێکی سەیر ڕووی دا کە لە هەموو ڕوویەکەوە شایانی باسە. هەموو ئامادەبووان هێواش هێواش لە کوڕەی وێڵگەڕ نزیك بوونەوەو ئەڵقەیان لە دەوری بەست. سات بە سات خەڵکانێکی زیاتری لە دەور خڕدەبوونەوە. کار گەییە ئەوەی لە کاتێکا کە تۆم کانتی لە ژێر باری جەواهێرات و جل و بەرگی نایابی پاشایەتیدا دا تەپی بوو. لە پڕ دەوربەری بە ڕادەیەك چۆڵ بوو، وای هەست دەکرد بە تاقی تەنیا کەوتووەتە بیابانێکی چۆڵ و هۆڵەوە.

نیو سەعاتێك بەو شێوەیە تێپەڕی. دەرباریان بە ئەسپایی یەکتریان دەدواند. لەم کاتەدا سان جۆن گەڕایەوە. ورتە ورتەکە نەما. لۆرد بە بێدەنگییەکی سامناك خۆی بە حەوشەی کڵێساکەدا کرد. بە قاڵدرمەکانی هەیوانەکەدا سەرکەوت، ئیکلامێکی بۆ تۆم کانتی کردو گوتی:

"قوربان، تەمغە گەورەکە لە سەندوقی جەواهێراتەکەدا نەبوو!"

دەرباریەکان، هەرکە گوێیان لەو قسەیە بوو، بە جۆرێ لە کوڕیژگەی بەرەڵا دوورکەوتنەوە دەتگوت ئەو نەگبەتە نەخۆشی تاعونی گرتووە. جارێکی دی دەستوپێوەند کەوتنەوە دەڵەچەیی و ڕیایی و مەرایی بۆ تۆم. لۆرد وەسی، توڕە بوو و هاواری کردو گوتی:

"ئەم هەتیوە گەدایە فڕێ بدەنە کوڵان و بە شەلاق بە نێو شاریا بگێڕن. ئەم گەدای بێ حەیایە شایانی سزایەو دەبێ بکرێت بە عیبرەت بۆ خەڵکی؟"

هەندێك لە نیگابانانی گاردی شاهی پەلاماری کوریژگەکەیان دا، لێ تۆم، تێی خوڕین، ڕایگرتن و گوتی:

"ئەگەر یەك هەنگاوی تر لێی بچنە پێشێ هەمووتان لە سێدارە دەدەم!"

لۆرد وەسی، زۆر نیگەران و ناڕەحەت بوو، و نەیدەزانی چی بکات. ئەنجام بە دوو دڵی و پەشێوی لە لۆرد سان جۆنی پرسی:

"جەنابی لۆرد، تۆ باش گەڕایت؟ تەمغە گەورەکە، شتێکی گەورەی بەرجەستە، قورسێکی زێڕە، خۆ دەرزی نیە بەو ئاسانیە ون بێت!".

تۆم کە گوێی لەو قسانە بوو، چاوانی ئەبڵەق بوون و لە ناکاودا هاواری کردو گوتی:

"راوەستن! گوتتان چی؟ گوتتان قورسێکی گەورەی زێڕە؟ ئاها، ئێستا تێگەییشتم، تەمغەی گەورە ئەمەیە؟ ئێوە ئەگەر سێ هەفتە لەمەپێش لە کاتێکا پرسیاری تەمغە گەورەکەتان لە من دەکرد، ئەگەر ئاوا بۆتان روون بکردمایەتەوە، هەر ئەوسا پێم دەگوتن. من دەزانم تەمغە گەورەکە لە کوێیە. بەلاّم هەمووتان چاك ئەوە بزانن کە من تەمغەکەم لەو شوێنەدا دانەناوە."

لۆرد وەسی پرسی:

"خاوەنشکۆ، ئەدی کێ مۆرە گەورەکەی لەوێندەر داناوە؟"

"ئەم کوڕەی کە ئێستا دەگەلّ ئێمەدا وەستاوە، لەوێی داناوەو ئەمیش پاشای راستەقینەی ئینگلیستانە. هەر پرسیارێکی ترتان هەیە لە خۆی بپرسن، بێگومان بێ چەندوچوون وەلاّمتان دەداتەوە."

"خاوەنشکۆ، کەمێ بیربکەوە، بیرتە کاتێ ئەو رۆژە ویستت لە ژوورەکەت وەدەربکەوی، دوا کاری تۆ ئەمە بوو کە مۆرەکەت (تەمغە) لە شوێنێك دا شاردەوە. ئەو رۆژە دەلّێم کە جلە شڕەکانی منت لەبەر کردو بە مەبەستی تەمێ کردنی ئەو سەربازەی کە لە منی دابوو، بە حەوشی کۆشك دا وەدەرکەوتی."

جارێکی دی بێدەنگییەکی قوولّ باڵی بەسەر ئامادەبووانـدا کێشا. هەموو ئەوەندە نیگەران و شپرزە بوون دەتگوت خۆلّو دۆیان بەسەرا کراوە. گەدای چکۆلە سەری داخستبوو، بڕۆی وێکهێنابوونەوەو دیاربوو کونو کەلەبەری مێشکی خۆی دەپشکنی تا شتێکی وەبیربێتەوە، شتێك کە بە رواڵەت بچووك و منداڵانە بوو، بەلاّم لە راستیدا زۆر گرینگ بوو، و بەبێ ئەوە نەیدەتوانی تەخت و تاجەکەی خۆی وەربگرێتەوە. ئەگەر بیری نەکەوتبایەتەوە شکستی دێنا و کەوتنی مسۆگەرو یەکجارەکی بوو، و بۆ هەمیشە دەکەوتە هەلّدێری شکست و زەلکاوی هەژاری و بەدبەختییەوە. کات بەپەلە دەڕۆیی، ئەو داماوە دوای بیرکردنەوەیەکی قوولّ، ئەنجام ئاهێکی قولّی هەلّکێشاو بە ئەسپایی سەری لەقاندو بە دەنگێکی لەرزۆك گوتی:

"بەلّێ من ئەو قورسەم لە بیرە... وەکو ئەوەیە ئێستا لەبەر چاوم بێ، بەلاّم وام دێتە خەیالّ کە ئەو رۆژە تەمغە گەورەکەمان لەبەر دەستدا نەبوو."

گەدای بەدبەخت بێدەنگ بوو، لێ لەپڕ سەری هەلّبڕی و بەوپەڕی رەندی و مەردییەوە گوتی:

"بە هەر حالّ ئێستا کە ناتوانم ناسنامەی راستەقینەی خۆم لە حوزوری ئێوەدا بسەلمێنم،ئیدی هیچ کارێکی دیم لە دەست نایەت و ئێوە دەتوانن، من کە سولّتان و شای قانونی ئێوەم، لە هەقی رەوای خۆم مەحروم بکەن. وێڕای ئەوەش..."

تۆم، بە دەنگێکی پەشۆکاو قسەکەی پێ بڕی و گوتی:

"خاوەنشکۆ، ورە بەر مەدە، تۆزێکی دیکەش بیربکەوە! نەکەی مەیدان چۆلّ بکەی، کۆلّ مەدە. هەقی رەوای تۆ هێشتا نەفەوتاوە! تکا دەکەم گوێ لە من بگرە! چیرۆکەکەی من و تۆ بەمجۆرە بوو کە هەردووکمان لە ژوورە تایبەتیەکەی تۆدا دانیشتبووین. من باسی (نەن و بت)ی خوشکم و داپیرەم بۆ دەکردیت و باسی ئەو گەمەو وازییە جۆراوجۆرانەم بۆ دەکردیت کە دەگەلّ منداڵانی هەڤسالّی خۆدا لە گەڕەکی ئۆفال کورت دەمانکرد. قوربان تا ئێرەت لە بیرن، وانیە؟ ئەوجا تۆ

دەستورت فەرموو کە خواردن بۆ من بێنن و بەلێزانی و ئەتەکێتێکی بێ وێنەوە ئەمرت کرد کە هەموو نۆکەران و هاودەمان لە ژوورەکە وەدەربکەون تا من کە شارەزای نان خواردن لە حوزوری گەورە پیاواندا نەبووم، خەجاڵەت نەبم و شەرم نەکەم. قوربان بێگومان ئەمەشت لەیادە، وایە؟"

دەربارییان، بەچاوانی ئەبڵەق و پڕ لە حیرەت و سەرسامی تەمەشایان دەکردن. هەموو هەستیان دەکرد کە ئەم چیرۆکەی تۆم کانتی دەیگێڕێتەوە سەرڕێژە لە حەقیقەت و ڕاستی، بەڵام لەم خاڵەدا دوو دڵ و حەیران بوون کە چ ڕێکەوتێکی عەجیب و غەریب ئەم دوو منداڵەی لە کۆشکی پاشایەتیدا یەك خستووەو بەیەکی گەیاندوون.

تۆم لەسەری ڕۆیی و گوتی:

"خاوەنشکۆ، باش بیربکەوە، دوای نان خواردن، هەر بۆ سوعبەت و پێکەنین، هەردووکمان جلەکانمان گۆڕییەوەو شان بە شانی یەکتر لە بەردەم ئاوێنە بالانماکەدا وەستاین. تۆ بە منت فەرموو کە قژی تۆو چاوانی تۆو هەیئەت و شێوەو روخسارو تۆنی دەنگ و هێڵەکانی دەموچاوو رووی تۆ عەینەن، کوت و مت لە من دەچێت و ئەگەر هەردووکمان بە رووت و قووتی ببینن هیچکەسێك ناتوانێ جیامان بکاتەوەو بزانێ شازادەی گال کێیەو کوڕیژگە هەژارو گەداکە کێیە. ئەوسا تۆ زامەکەی سەر دەستی منت بینی. تەمەشا هێشتا شوینەوارەکەی ماوەو پەنجەکانم بە جۆرێ رەق بوون کە ناتوانم باش بنووسم. پاشان فەرمووت کە دەمەوێ بڕۆم ئەو سەربازەی کەوای لێکردوویت و ئازاری داویت تەمێ بکەم. لە کاتی چوونە دەرەوەدا بە تەنیشتی مێزێکدا تێپەڕیت کە تەمغە گەورەکەی سەڵتەنەتی لەسەر بوو. تۆ تەمغەکەت لەسەر مێزەکە هەڵگرت و بە وردی روانیتە دەوروبەری خۆت. پێدەچوو بۆ شوێنێکی ئەمین بگەڕێی تا تەمغەکەی تیا بشارێتەوە، پاشان چاوی تۆ بە..."

لێرەدا کوڕیژگەی وێڵگەرد قسەکەی تۆمی بڕی و گوتی:

"بەسە، سوپاس بۆ خودا کە ئەم زەینە روونەی بە تۆ عەتا فەرمووە!"

ئەوسا رووی کردە سان جۆن و گوتی:

"ئەمجارەش بچۆوە بۆ کۆشك و تەمغە گەورەکە لە ژێر زرێیەکی منەوە کە بە دیواری ژوورەکەوە هەڵواسراوە، دەربێنە و بیهێنە!"

تۆم کانتی، لە خۆشیا هاوارێکی کرد:

"ئافەرین، خاوەنشکۆ! راستت فەرموو، و تەخت و تاجەکەی خۆت وەرگرتەوە. ئیدی کەس حەدی نییە گومان لە دروستی قسەکەت بکات. تۆش، جەنابی لۆرد سان جۆن ماتەڵی چیت؟ بڕۆ! تا زووە بڕۆ، ئەگەر دەکرێ بفڕەو زوو بگەڕێوە!"

هەموو ئامادەبووان بە پێوە وەستا بوون. هەندێك موعەزەب دیار بوون، و هەندێکی دی نیگەران و پەشێو بوون و هەندێکی دی بە کونجکاوی و لاپەرەسەنی چاوەڕوانی ئاکامی کارەکە بوون. هەموو بە ئەسپایی قسەیان بۆ یەکتر دەکردو غەڵبە غەڵبێکی نامەفهووم لە نێو کڵێساکەدا بەرپا بوو بوو. نیو سەعاتێك بوری. لە ناکاودا بێدەنگی باڵی بەسەر ئاپۆڕاکەدا کێشا و لۆرد سان جۆن لەبەر دەرگای دالانی کڵێساکەدا دەرکەوت. هەرکە ئامادە بووان دیتیان لۆرد سان جۆن

تەمغە گەورەکەی دەگەڵ خۆیدا هێناوە، لە پڕ ساپیتەو دیواری کڵێساکە بە هاوارو هورایەکی سامناک هاتە لەرزەو هەموو بەیەك دەنگ هورایان کێشا:

"بژی پاشای راستەقینە!"

دەنگدانەوەی هاوارو هوراکێشانو سەرو سەدای شادی بەخشی ئامادەبووان تا پێنج دەقیقە بەردەوام بوو.

لە راڕەوو شانشینەکانی کڵێساکەوە هەر دەستەسڕی سپی بوو و بە سەر سەرانەوە دەشەکایەوە. ئیدوارد تودور لە ناوەندی حەوشی کڵێساکەدا بە سەنگو ویقارێکی شاهانەوە وەستا بوو و گەورەترین پیاوانی وڵات لە بەردەمیا کڕنۆشیان دەبردو چۆکیان بۆ دا دەدا.

ئەنجام ئامادەبووان هەموو هەستانە سەرپێ. تۆم کانتی گوتی:

"خاوەنشکۆ، ئێستا نۆرەی ئەوەیە کە ئەم جلکە جوانانەی خۆت وەربگریتەوەو ئەو جلکە شڕانەی خۆمم پێ بدەیتەوە!"

لۆرد وەسی، هاتە پێشەوەو رووی کردە ئەفسەرانی گاردی شاهی، و گوتی:

"یەکسەر جلکی پاشایەتی لەبەر ئەم دزی رێگرە داکەنو بیبەن لەزندانی بورجی لەندەن دا حەپسی بکەن!"

لێ پاشای چکۆلە دەستی هەڵبڕیو گوتی:

"نەخێر، قەبوڵم نیە کاری وا دەگەڵ تۆم دا بکرێ، چونکە ئەگەر ئەم دزە رێگرە نەبوایە من هەرگیز نەدەبوومەوە بە خاوەنی تەختو تاجی ڕەوای خۆم. تۆش جەنابی لۆرد وەسی، جەنابی خاڵی ئازیز، دیارە کە پیاوێکی زۆر سپڵەو پێنەزانو نمەك حەرامی، چونکە وەکو زانیومە تۆ لە سایەی لوتفو مەرحەمەتی ئەم دزی رێگرەوە پایەو پۆستی دۆکیت وەرگرتووە، بەڵام چونکە ئەو پاشای راستی مەملەکەت نەبووە، پۆستەکەی تۆش شەرعیەتی نیە. من ئەمرت پێدەکەم کە سبەینێ بێی بۆ لای منو داوای بوردن بکەیتو تکا بکەیت تا ئەم پۆستەت بدەمێ، دەنا هەر بە (کونت)ی دەمێنیتەوە."

لۆرد وەسی، کە لە شەرمو تەریقیدا سوور هەڵگەڕابوو پاشەوپاش کشایەوەو لە پشت دەربارییەکانی دیدا ون بوو. پاشای چکۆلە رووی بۆ لای تۆم کانتی وەرگێڕاو لێی پرسی:

"تۆ چۆن شوێنی تەمغە گەورەکەت بیرمابوو؟ کەچی من هەر بیریشم نەما بوو."

"قوربان، ئاخر من چەندین جار سوودم لەم تەمغە گەورەیە بینی بوو."

"تۆ سوودت لە تەمغە گەورەکە بینی بوو؟ کەواتە بۆچی زووتر شوێنەکەیت بە دەربارییەکان نەدەگوت؟"

"ئاخر من نەمدەزانی مەبەستیان لە تەمغەی گەورە چیە، چونکە وەکو ئەمڕۆ بە جوانیو روونی بۆیان وەسف نەکردبووم."

"ئێ، باشە پێم بڵێ چ سوودێکت لە تەمغە گەورەکە دەبینی".

تۆمی بێچارە چەندین جار زاری هەڵێنا کە شتێك بڵێت. بەڵام هەموو جارێك لە شەرما قسەکەی دەگێڕایەوە. ئەنجام بە دەنگێکی شپرزەو نووساو، کەوتە دەمەلاڵکێو گوتی:

"من... من... ئەو تەمغەیە..م، بۆ گوێز.. گوێز شکاندن بەکار دێنا!"

جەماوەرەکە کە گوێیان لەو قسەیە بوو، بەجۆرێ لە قاقای پێکەنینیان دا، کە منداڵەی داماو خەریك بوو لە تەریقیو شەرمەزاریدا بەربێتەوە. بەڵام وردە وردە هاماجەکە(جەوەکە) هێور بووەوەو خەڵکەکە دەستیان لە تەوسو توانجان هەڵگرت، چونکە بۆیان دەرکەوت کە تۆم کانتی بێنەوا پاشای ئینگلیستان نەبووە دەنا زۆر زووتر پەی بە گرینگیو بایەخی تەمغە گەورەکە دەبردو دەیزانی کە ئەم شتە گرانبەهایە بۆ گوێز شکاندن دروست نەکراوە.

لە چاو تروکانێکدا، شانێلە ئاڵدۆزیەکەیان لە شانی تۆم کانتی داگرتو دایان بە شانی ئیدوارد تودوردا. ئەوسا جێبەجێکردنی ڕێوڕەسمی ئاهەنگی تاجگوزاری بەردەوام بوو. پاشای چکۆلە تەشریفاتی ئاینیشی قەبوڵکردو دوای تۆزێك تاجی پاشایەتی ئینگلیستانیان لەسەرنا. ویەکسەر چەند تۆپێکیان تەقاندو هاواری شادیو قریوەی خۆشی لە هەر چوارنکالی شارەوە بەرزبووەوە.

((٣٣))

## ئیدواردی شەشەم، پاشای ئینگلیستان

مایڵز هندن کاتێ لە شەڕەکەی سەر پردەکە لە هاوڕێکەی دابڕاو کەوتە ناو قەرەباڵغییە خرۆشاوەکەوە، جلەکانی خۆی لە خۆیدا شڕوکۆن بوون، و کاتێ لەو شەڕە رزگار بوو هەم گیرفانیان بڕی بوو، و هەم جلەکانی هێندەی دی درا بوون. گیرفانبڕانی بێویژدان تەنانەت تاقە عانەیەکیشیان لە گیرفانیا نەهێشتبووەوە.

بەلام ئەمەی زۆر بە لاوە گرینگ نەبوو، گرینگ ئەمە بوو کە بە زووترین کات (کوڕە)کەی بدۆزێتەوە. مایڵز وەکو سەربازێکی راستەقینە بریاری دا کە بێبیرکردنەوەی دروستو نەخشە نەکەوێتە گەڕان بە دووی هاوڕێکەیدا، بۆیە کەوتە ڕامانو تێفکرین،و بەخۆی گوت:

"وا باشە دانیشمو بیربکەمەوە. بە مەزەندە ئەم کوڕە روو دەکاتە کوێ؟ پێموایە دەچێ بۆ کۆنە هەواران، چونکە پێموایە هەر کەسێك شێت بێ یان ئاقڵ کاتێ تووشی ئەم پێشهاتانە دەبێو لە هاوڕێکەی دادەبڕێ، بە سروشت بۆ کۆنە هەواری خۆی دەڕواتەوە، واتە بۆ ئەو شوێنە دەڕواتەوە کە دۆزینەوەی بۆ هاوڕێکەی ئاسان بێت. بەڵام دەبێ بزانم کە کۆنە ماڵەکەی لە کوێیە؟ بێگومان لە یەکێك لە گەڕەکە پیسو وێرانە هەژارنشینەکانی شاری لەندەنە. نازانم ئاخۆ زوو دەیدۆزمەوە یان درەنگ؟ پێموایە بە زوویيو بە ئاسانی دەیدۆزمەوە. چونکە لە ڕێگادا تووشی خەڵکانێکی هەژارو بێنەوای وەکو خۆی دەبم. دوورنیە ئێستا لە نێو کۆڕی بێکارانو سەرگەردانانەدا مژولی خوتبەدان بێتو پێیان بڵێ کە من پاشای ئینگلیستانم. هەڵبەتە دیسان ناچار دەبم سەری چەند کەسێك بشکێنمو نەجاتی بدەم. ئەگەر ئەمجارە دەستم بیگاتێو بیدۆزمەوە، لەگەڵ خۆدا دەیبەمو بەدڵو بە گیان چاودێریو ئاگادارییی دەکەم و کارێك دەکەم کە ئیدی هەرگیز لێم دانەبڕێت!"

مایڵز هندن، کەوتە ڕێ. بە سەعاتان ڕێی کردو بە کوچەو کۆڵانانی پیسو بۆگەنی شاردا سوڕایەوە. بگەیشتبایە هەر کۆمەڵێك لێیان ورد دەبووەوە، بە بەر هەر ماڵێکا رۆییشتبا

تەماشەیەکی ژوورەوەی دەکرد. کە هەتاو هەڵات مایلز هندن ماوەیەکی زۆری بڕی بوو لێ هێشتا هیچ سۆراخێکی هاوڕێکەی دەست نەکەوتبوو. داماوە برسی و شەکەت بوو، و زۆری خەو دەهات. مایلز تەنانەت بیری لەوەش نەکردەوە کە چەند دراوێك سوالْ بکات تا خواردنێك بۆ خۆی بکڕێت، یان شمشێرەکەی بە بارمتە لای کەسێك دابنێ. بە بارمتە دانانی شمشێر لە مەزەبی ئەودا نبوو، چونکە مایلز مەرگی پێ لە کاری وا باشتر بوو. ئەو بیرۆکەیەش کە بتوانێ هەندێ لە جلەکانی بفرۆشێت، نا واقیعی بوو و، چونکە جلەکانی هێندە شڕو شەپڕێو بوو کەس ئامادە نەبوو هەر دەستیشی تێوە بدات.

کات نزیکی نیوەڕۆ بوو، مایلز هێشتا هەر ڕێی دەکرد، بەڵام بە گەڵ ئاپۆڕایەك کەوتبوو کە دووی کاروان و کەژاوەی شا کەوتبوون، مایلز لە دڵی خۆیدا دەیگوت:

"ئەگەر هاوڕێکەم لێرەبوایە، بۆ خۆی بەم دیمەنە خەنی دەبوو!"

مایلز، تا کلێسای (ویستمنیستر) دەگەڵ ئاپۆڕاکەدا ڕۆیی. لەوێش زۆری چاو گێرا، لێ هاوڕێکەی نەدۆزییەوە. مایلز، ئاقیبەت لەوێ دوورکەوتەوەو لە دڵی خۆیدا گوتی:

"پێشبینییەکانم راست دەرنەچوون، وا چاکە نەخشەیەکی ئاقڵانەتر بکێشم و بە جۆرێکی دروست تر سۆراخ و تاقیبی هاوڕێکەم بکەم!"

مایلز هەستی کرد لە شار دەرچووە. کات لە نیوەڕۆ تێپەڕی بوو. لە پڕ خۆی لە کەناری روباری تایمزدا، لە بەرانبەر کۆشکێکی هاوینەی جواندا بینییەوە. تەمەشای هەر لایەکت دەکرد، کۆشك و تەلاری بەرزو رازاوەو جوان لە نێو باخی گەورەو خۆشدا خۆی دەنواند. مایلزی داماو کە ئەو وەزع و حاڵەی بینی هەستی کرد کە ئەوێ جێگەی بێکاران نیەو رووی خۆش بەو وێڵگەردان نادات.

چونکە هەوا کەمێك خۆش بوو، مایلز بە مەبەستی بیرکردنەوەو پشوودان لە پاڵ پەرژینێکدا راکشا، بەلەنگازە هێندە شەکەت و ماندوو بوو، هەستی دەکرد سەراپای بەدەنی سڕبووە. هەرکە رمبەی تۆپان بەرز بووەوە مایلز زانی کە پاشای تازە تاجگوزاری کردووە. مایلز بەرە بەرە خەوێکی قورسی لێکەوت. داماوە پتر لە سی سەعات بوو کە خەو نەچوو بووە چاوانی، بۆیە تا سبەینێ لە خەو ڕانەبوو.

مایلز، کاتێ سبەی بەیانی لە خەو ڕابوو، هەم برسی بوو و هەم لاقی دێشان. سەروچاوی خۆی خۆی پاك شت و بۆ دامرکانەوەی برسێتییەکەی خۆی یەك دوو قوم ئاوی خوارەوە، ئیدی لە دڵی خۆدا کەوتە سەرزەنشتی خۆی کە بۆچی تا ئەو کاتە نووستوەو ئەو هەموو وەختەی خۆی بە فیڕۆداوە. ئەوسا بە هەنگاوی سست و لەرزۆکەوە بەرەو کۆشکی (ویستمنیستر) ڕۆیی. برسێتی وای لێکردبوو بیر لە شتێکی سەیرو مەحاڵ بکاتەوە کە ئەویش ئەوە بوو بچێ سۆراخی هاوڕێ پیرەکەی بابی (سێر همفری مارلو) بکات و پارەیەکی لێ قەرزبکات تا پاشان دەروویەکی لێ دەبێتەوەو دەیداتەوە.

نزیکی سەعات یازدە، مایلز گەییە نزیکی کۆشك‌و تێکەڵی ژمارەیەکی زۆر لە پیاوماقولانی پۆشتەو پەرداخ‌و بۆشناخ بوو کە ڕێیان دەکرد. مایلز بە کونجکاوی دەیڕوانیە ئەو خەڵکەو لە دڵی خۆیدا دەیگوت:

"وا چاکە، من روو لە یەکێك لەم نەجیمزادانە بنەم‌و تکای لێبکەم کە بە (سێر همفری مارلو) بڵێت کە ئاشنایەکت کاری پێت هەیە، دەنا من دڵنیام کە بەم سەرو سیماو جل‌و بەرگە شڕەوە ڕێم نادەن بچمە ژوورەوە."

بەڕێکەوت لەم کاتەدا دۆستە دێرینەکەمان (همفری مارلو) کە (شەلاقخۆری) خاوەنشکۆ بوو، بەبەر تارمەیەکی کۆشکدا تێدەپەڕی! هەرکە چاوی بەسەرو سیمای مایلز هندن کەوت وەستا، چاوی خۆی هەڵگلۆفت‌و برۆی وێکهێنانەوەو لە دڵی خۆیدا گوتی:

"ناکا ئەمە هەمان ئەو گەدا بەدبەختە بێ کە خاوەنشکۆ هەموو جارێك هەواڵی لە من دەپرسێت. هەموو نیشانەکانی لەو دەچێت. بەڕاستی ئەگەر ئەو بێ چەند... نا، وا چاکە بچم قسەی دەگەڵ دابکەم‌و بزانم کێیەو چی دەوێ!"

همفری مارلو، لە سێ‌و دووی خۆیدا بوو کە لە پڕ مایلز، لەو دوو دڵییەی دەرهێنا، مایلز هەر کە بینی ئەو کوڕە سەیری ئەو دەکات، زاتی وەبەر خۆی ناو بەرەو لای ئەو رۆیی‌و لە پشت تارمەکەوە گرتی‌و لێی پرسی:

"ببورە، ئەگەر بە هەڵە نەچووبم، وا بزانم تۆ لە نێو کۆشکەوە دەهاتیە دەرێ!"

همفری مارلو گوتی:

"بەڵێ، کارێکت هەبوو؟"

"تۆ سێر همفری مارلو دەناسیت؟"

کوڕەکە گوێی لە نێوی بابی خۆی بوو ڕاچڵەکی‌و لە دڵی خۆیدا گوتی:

"ئێی باوکە گیان، بە رەحمەت بی!" ئەوجا بە دەنگی بەرز گوتی:

"بەڵێ کاکە، دەیناسم."

"باشە جەنابی ئێستا لە ناو کۆشکە؟"

همفری بە دەنگی بەرز گوتی: "بەڵێ"و ئەوجا لە دڵی خۆیدا گوتی: "بەلام لە ژێر خاکدایە."

مایلز گوتی:

"دەکرێ ئەگەر زەحمەت نەبێ عەرزیان بکەی کە یەکێك هاتووەو دەیەوێ قسەی دەگەڵ بکات؟"

"بەسەر چاو، دە خزمەتو دام."

"زەحمەت نەبێ پێی بفەرموو کە مایلز هندن-ی کوڕی سێر ڕێچارد هندن هاتووە."

کوڕیژگەی تاین کە گوێی لەم ناوە بوو ڕاچڵەکی‌و لە دڵی خۆیدا گوتی:

"ئاه... ئەمە ئەو ناوە نیە کە پاشا دەیفەرموو، ئەمە ئەو کەسە نیە کە شا سۆراخی دەکات‌و بە دوایدا دەگەڕێ، بەلام دوور نیە برای جمکانەی هەمان کەس بێت.

ئەوسا گوتی:

"تۆ لێرە چاوەڕوان بکە، هەر ئێستا دەگەڕێمەوە!"

مایلز لە هەمان شوێندا کە همفری مارلو بۆی دانا بوو وەستا. شوێنەکە بریتی بوو لە کوختەیەکی بچووك کە لە دیواری کۆشکەکەدا هەڵکەنرا بوو، و تەختێکی بەردینیان تیا دانا بوو تا پاسەوانانی کۆشکەکە لە کاتی باران بچنە ناوی‌و تەڕ نەبن، مایلز خۆی بەو کوختەیەدا کردو لەسەر تەختە بەردەکە دانیشت. زۆری پێ نەچوو کە مەفرەزەیەکی ناو شار بەسەرپەرشتی ئەفسەرێك گەیینە ئەوێندەر. ئەفسەرەکە ئەمری بە مایلز هندن کرد لە جێی خۆی هەستێت‌و ئەوسا دەستوری بە سەربازەکانی دا کە یەکسەر بیگرن. مایلزی بەلەنگاز وای هەست کرد کە کاری لە کار ترازاوە، بۆیە هەر کە ویستی ئیعتراز بگرێ، ئەفسەرەکە بە سەربازەکانی گوت:

"چەکی بکەن‌و گیرفانەکانی بگەڕێن!"

مایلز ئاهێکی پێدا هاتەوەو گوتی:

"دڵنیا بن کە هیچ شتێك لە بەرکی مندا نادۆزنەوە. چونکە من پێشتر گیرفانەکانی خۆم گەڕاوم‌و هیچیان تیا نیە."

بەڵام لە ڕاستیدا گیرفانی مایلز بە تاڵ نەبوو، چونکە پارچە کاغەزێکیان تیا دۆزییەوە. ئەم کاغەزە هەمان ئەو کاغەزە بوو کە کاتی خۆی شازادەی بچووك لە هندن هول بە ئینگلیزی‌و یونانی‌و لاتینی نووسیبوی‌و دابووی بە مایلز تا بیگەیەنێتە لەندەن‌و بیدات بە لۆرد هرتفورد. ئەفسەرەکە نامەکەی کردەوەو بەشە ئینگلیزییەکەی خوێندەوەو بێ ئختیار هاواری کردو گوتی:

"نۆبەتی ئەو قەوانەیە! دیسان داواچییەکی دیکەی تەخت‌و تاج پەیدا بووە! خوا رەحم بکات! ئەم داواچیانە کەرێشکە زێ دەکەن. کوڕینە ئێوە ئاگاتان لەم مێردەکە(بۆرەپیاو) بێت تا من یەکسەر ئەم نامەیە بەرمە خزمەت خاوەنشکۆ!"

ئەفسەرەکە بەلەز ڕۆیی. مایلز هندن زۆر ناڕەحەت بوو، لەفکران ڕاچوو و گوتی:

"ئیدی کارم تەواوە. ئەم کاغەزە لەعنەتیە ئاخری کاری خۆی کردو گەیاندمیە پای قەنارە. نازانم لە دوای من چی بەسەر کوریژگە ئازیزەکەم دێ؟ مەگەر هەر خوا خۆی بیزانێ!"

ئەفسەرەکە، دوای تۆزێك زۆر بە پەلە گەڕایەوە. هەرکە گەییە لای سەربازەکانی فەرمانی پێکردن کە زندانیەکە ئازاد بکەن‌و شمشێرەکەشی بدەنەوە. ئەوجا لە بەردەم مایلزدا سەری ڕێزی دانەواندو گوتی:

"تکایە دەگەڵ من وەرە."

هندن بە نە بەدڵی دووی کەوت، لێ یەجگار نیگەران بوو و لە دڵی خۆیدا دەیگوت:

"بۆرە پیاگی بێ شەرم، پێم رادەبوێرێ! ئاه... بە من بێ دەست بنەمە بینی‌و خەفەی بکەم. بەڵام نا، خوا بەردار نیە؟ من کە پێم بە لێواری گۆڕەوەیە بۆچی بەم دوا دواییە دەستی خۆم بەگوناح‌و تاوان بلەوتێنم؟"

بە جووتە بە حەوشی کۆشکدا تێپەڕین. کاتێ گەیینە دەرگا گەورەکەی سەرای کۆشك، ئەفسەرەکە مایلزی بە یەکێك لە پەردەدارەکان سپاردو خۆی گەڕایەوە. پەردەدارەکە بەرێزو حورمەتێکی زۆرەوە پێشوازی لە مایلز کردو بردیە ڕاڕاوەیێکی درێژەوە کە نۆکەران‌و خولامانی

تایبەتی لەم بەرو لەو بەریا بەریز وەستا بوون. نۆکەرانی ناڤبری کە چاویان بە روخسارو سەرو وەزعی شپرێوی مایلز کەوت، لە ژێر لێوانەوە کەوتنە پێکەنین و بە چپە بە یەکیان دەگوت:
"پەح! ئەم داهۆڵە کێیە؟"

ئەنجام کابرای پەردەدار گەییە بەردەم قاڵدرمەیەك و بۆ رێنوێنی پێش مایلز کەوت. پاشان گەیاندیە پشت دەرگایەکی گەورە کە بەسەر هۆڵێکی گەورەدا دەکرایەوەو دەستوری پیّ دا کە کڵاوەکەی داکەنێت. مایلز کڵاوەکەی لەسەر داگرت و چووە هۆڵەکەوە. لە ناو هۆڵەکەدا ژمارەیەکی زۆر لە ژنان و پیاوان هەموو بە جلی ئاڵاو واڵا رازاوە بە جەواهێراتی گرانبەهاوە وەستا بوون. هەموو تەمەشایان کردو بە دیتنی ئەو برۆیان وێکهێنایەوەو بە بزەی تەوسامێزەوە کەوتنە ریشخەن.

مایلز، پێی وابوو خەو دەبینیّ، پاشای تازە لە دووری شەش شەقاوی ئەوەوە لە ژێر چەترێکدا دانیشتبوو، بە ئاستەم سەری خوار کردبووەوەو دەگەڵ (باڵندەیەکی بەهەشتیدا) کە بێگومان دەبیّ یەکێك لە دۆکە گەورەکانی دەربار بێت، قسەی دەکرد. هندن لە فکران ڕاچوو و لە دڵی خۆیدا گوتی:

"ئێستا کە حوکمی مەرگم دەدەن چش، باکم پێی نیە، بەڵام بۆچی ئەم سزایەی من بە رۆژی نیوەڕۆ و بە بەر چاوی عالەمەوە دەدەن؟ بۆچی ئەم حەقارەتەم پێدەکەن، و دەمکەن بە قەشمەر؟"

بەلەنگازە، خوا خوای بوو هەرچی زووترە، چارەنووسی دیاری بکەن، چونکە چەند کەسێك کە لە نزیکیەوە وەستا بوون بە ئاشکرا گاڵتەیان پێدەکرد. پاشا سەری هەڵبڕی. مایلز کە نیگای لە نیگاو سیمای شا هەڵەنگوت، بەجۆریّ واقی وڕما خەریك بوو بتاسێت. مایلز مودەتێك بە زاری بەشەوە نیگای بڕییە سیمای نەجیب و جوانی منداڵەکە. ئەوسا بیّ ئختیار هاواری کردو گوتی:
"ماشەڵلا لە کاری خوا! چی دەبینم؟ خۆ ئەمە هەمان پاشا خەیاڵیەکەی خۆمە!"

ئەوجا تەمەشایەکی دەوروبەری خۆی کردو گوتی:
"نەخێر، خەو نابینم، هەر هەموو ئەم خەڵکە، کەسانی راستەقینەو زندوون!"

ئەوجا، جارێکی دی، رووی کردە شاو لە سیمای وردو بووەوەو لە دڵی خۆیدا گوتی:
"خودایا، ئەم منداڵە کێیە؟ ئایا پاشای قانونی و راستەقینەی ئینگلیستانە یان هەمان ئەو منداڵە شێتەیە کە من گرتبوومە ژێر باڵی خۆم؟ خودایا، کەسێك هەیە ئەم مەتەڵەم بۆ حەل بکات؟"

لە پڕ، چاوانی مایلز پرشنگیان دا، و بەرچاوی روون بووەوە، چونکە بیرۆکەیەکی تازەی بە مێشکدا هاتبوو. مایلز بەوپەڕی متمانەوەو بە هەنگاوی بتەوەوە بەرەو دیواری هۆڵەکە رۆیی، کورسیەکی هەڵگرت، رێك بەرانبەر بە شاو لە ناوەندی هۆڵەکەدا دایناو لەسەری دانیشت.

غەڵبە غەڵبی ناڕەزایی خەڵکەکە بەرزبووەوە. دەستێکی بەهێز بەر شانی مایلز کەوت و دەنگێکی توڕە لە گوێیدا زرینگایەوە.
"هەی گۆساخی بیّ تەربێت، تۆ چۆن وێرات لە حوزوری شادا دانیشیت؟"

ئەم دەنگە سەرنجی شای چکۆلەی راکێشا. شا یەکسەر قامکی بەرزکردەوەو گوتی:
"وازی لیّ بێنن! ئەم پیاوە بۆی هەیە هەمیشە لە حوزوری مندا دابنیشێت!"

ئامادەبووان مات و مەدهۆش لە جێی خۆ وشك بوون. شای چكۆلە لەسەر قسەكانی رۆیی و گوتی:

"لەوەیە هەمووتان بزانن كە ئەم پیاوە ناوی مایلز هندنە. ئەمە لە پیاوە هەرە دڵسۆزو خۆشەویستەكانی منە، من بە روح قەرزارباری ئەوو شمشێرە تیژەكەی ئەوم، ئەگەر ئەو نەبوایە، ئێستا ئێسك و پروسكیشم نەما بوو. بۆیە من لەقەب و پۆستی (شاسوار)م پێ بەخشیوە. هەروەها ئەوەش بزانن چونكە لە جیاتی من ئەشكەنجەیەكی بەدەنی زۆری دیتووە، بۆیە پایەی گەورەترین نەجیمزادەی ئینگلیستانم واتە (پر)م داوەتێ و لەقەبی (كونت دو كونت)م پێ كەرەم كردووە.هەروەها ئەوەش بزانن كە من ئەو ئیمتیازەم بە خۆی و بە نەوەكانی ئاینده‌شی داوە كە لە ئێستاو لە سەدەكانی داهاتووشدا، بەبێ پرس لە حوزوری من و ئەوانەی دوای مندا دابنیشن. بۆیە هەقتان بەسەر ئەوەوە نەبێت!"

دوو كەس لەو نەجیبانەی كە پێش پێنج دەقیقەیەك گەیی بوونە ناو هۆڵەكەو نەیانتوانی بوو لە رێورەسمی ئاهەنگی تاجگوزارییەكدا بەشداری بكەن، لەوانی دی پتر سەرسام بوون و بە واقی وڕەوە دەیانڕوانیە ئەو دووانە واتا (داهۆڵ)و شای تازە. ئەو دووانە یەكێكیان سێر هیو هندن بوو و دووەمیان لەیدی ئەدیت بوو. مایلز هندن یا (كۆنت دو كۆنت)ی تازە، چونكە روو لە شا دانیشتبوو، نەیدەتوانی ئەوان ببینێ. مایلزی بەختەوەر بە هەمان دەقەوە كە چاوی بڕی بووە سیمای منداڵەكەی ژێر چەترەكە، بیری دەكردەوەو لە بن لێوانەوە دەیگوت:

"وای لە من، خەجاڵەت خۆم! خۆ ئەمە هەمان كوریژگە بێنەواو گەداكەی لەمەڕ منە؟ هەمان ئەو منداڵە شێتەیە كە من بەرگریم لێدەكرد؟ كاتێ بیر لەوە دەكەمەوە كە دەمویست بۆ (هندن هول)ی بەرم و هەفتا ژوورەكەی ماڵە گەورەكەی بابم و بیست و حەوت خزمەكارەكەی پێ نیشان بدەم و خۆمی بەسەرا بنوێنم، كاتێ دەمویست منەتی بەسەردا بكەم لە ژێر باڵی خۆمی بگرم و وەكو منداڵی خۆم بە خێوی بكەم و ژیانێكی خۆش و ئاسوودەی لە (هندن هول)دا بۆ دابین بكەم، ئێستا شتەكە پێچەوانە بووەتەوە، تەریق دەبمەوە، لە خۆم گێلەپیاوێ. خۆزیا كیسەیەكم لاوە بوایەو سەری شەرمەزاریم تیا وەشێردبا."

لێ مایلز لە پڕ بیری كەوتەوە كە دەبێ هەستێ و رێزو حورمەت بنوێنێ، لەسەر كورسیەكە هەستا، لەبەردەم شای چكۆلەدا بە چۆكا هات. ئەوجا دەستی خستە نێو هەردوو دەستی شاو سوپاسی كرد كە ئەو پۆست و لەقەب و ئیمتیازە تایبەتیانەی دایەو سوێندی وەفاداری و دڵسۆزی خوارد. ئەوجا هەستاو چەند شەقاوێك پاشەوپاش كشایەوەو بەوپەڕی رێزو حورمەتەوە لە حوزوری شادا دەست لەسەر سینگ وەستا. ئەمجارەیان هەموو ئامادەبووان بە چاوی رێزو خۆشەویستییەوە لێیان ڕوانی.

لەم كاتەدا، لەپڕ شا لەنێو قەرەباڵغییەكەدا چاوی بە سێر هیو هندن كەوت. شا بە دیتنی ئەو بە جۆرێ ناڕەحەت و تورە بوو، كە بەدەنگێكی لەرزۆك هاواری كردو گوتی:

"هەر ئێستا ئەم دزە بگرن و هەرچیەكی دزیوە لێی بسەننەوەو لە زیندانی باوێن، تا خۆم لێی دەپرسمەوە با هەر لە زندانداا بێ!"

پاسەوانان، (سێر هیو)یان بردە دەرێ.

لە پڕ لەوپەڕی هۆڵەکەوە جم و جۆڵێك پەیدا بوو و سەروسەدایەکی زۆر بەرزبووەوە. دەربارییان ڕێگەیان چۆڵ دەکردو تۆم کانتی بە جلێکی یەجگار نایاب و جوانەوە، لە کاتێکدا یەکێك لە پەردەدارەکان پێشی کەوتبوو، دەهاتە پێشێ، تۆم هەرکە گەییە ئاستی تەختەکەی شا، هاتە سەرچۆکان، شا بە لوتف و میهرەبانیەکی تایبەتیەوە فەرمووی:

"من دەزانم لە غیابی مندا چیت کردووە، و بۆیە لەم بارەیەوە پڕ بە دڵ پیرۆزباییت لێدەکەم. تۆ لە بەڕێوەبردنی وڵاتەکەی مندا ئەوپەڕی دڵسۆزی و میهرەبانی و ئینساف و دادپەروەریت بەکار بردووە. وەکو زانیومە گوایە دایك و خوشکەکانت دۆزیوەتەوە، وانیە؟ لێ دڵنیابە من دەستورم داوە کە بە باشترین شێوە ئاگادارییان بکرێت. بەڵام سەبارەت بە باوکت، نازانم خۆت چی دەڵێی... ئەگەر تۆ رازی بیت و قانون رێ بدات، لە سێدارەی دەدەم."

ئەوجا رووی کردە ئامادە بووان و گوتی:

"ئامادەبووان، ئەی ئەوانەی لەم هۆڵەدا ئامادەن، ئێستا گوێ لە من بگرن! لەمڕۆ بە دواوە تۆم کانتی دەبێ بە یەکێك لە بەڕێوەبەرەکانی دەزگای((کرایستیس هۆسپیتەڵ))، و لەلایەکی ترەوە چونکە تۆم ماوەیەك پاشایەتی کردووە، من ڕێگەی دەدەم هەمیشە ئەم جلوبەرگەی ئێستا لەبەریدایە، بپۆشێت و هیچکەسێکی دی مافی نیە ئەم جۆرە جلە لەبەر بکات. چونکە دەمەوێ لە هەموو شوێنێکدا بیناسن و ڕێزو حورمەتی شایستەی خۆی و پلەو پایە بەرزەکەی بگرن. بۆ هەتا هەتایە دۆستی ئازیزو گیانی بە گیانی منەو لە ئێستاوە ئەو شەرەفەی دەدەمێ کە هەمیشە لەسایەی حیمایەتی خودی شادا بێ و بە لەقەب و عینوانی پاسەوانی شا بناسرێ و بانگ بکرێت!"

تۆم کانتی، بەختەوەرو کامەران و دڵخۆش و مەغروور لە جێی خۆی هەستاو دەستی شای ماچ کردو بەرەو دەرگا ڕۆیی. ئەوسا بە پەلە چوو بۆ لای دایك و خوشکەکانی تا مژدەیان بداتێ و بیانکات بە شەریکی بەشێك لە شادی و خۆشیەکەی خۆی.

## کۆتایی

### پاداشت و سزا

کاتێ هەموو کێشەکان چارەسەر بوون و نهێنییەکان کەوتنە روو، هیو هندن بەمجۆرە دانی بە گوناحەکانی خۆیدا نا:

"کاتێ مایلز گەییە هندن هول. من فەرمانم بە ژنەکەم دا کە خۆی لێبکات بە نەناس. ژنەکەم قەبوڵی نەکردو من هەڕەشەی کوشتنم لێکرد. پێی گوتم ئەگەر حەزدەکەی فەرموو بمکوژە، من ئەوەندە تامەزرۆی ژیان نیم. کە ئەوەم لێ بینی پێم گوت کەواتە تۆ ناکوژم، مایلز دەکوژم، ژنەکەم لەم هەڕەشەیە ترساو ملی دایە خەت."

**هەرچەندە هیو هندن، موڵكو ماڵو لەقەبو عینوانی هەقی مایڵزی زەوت كردبوو، بەڵام لەسەر ئەوە نەگیراو سزا نەدرا، چونكە مایڵز هندنو لەیدی ئەدیت ئامادە نەبوون لە عەلەیی ئەو گەواهی بدەن.**

**لەلایەكیی دیكەشەوە ئەگەر لەیدی ئەدیت، خۆیشی بیویستایە دژی مێردەكەی گەواهی بدات، یاسا رێگەی ئەو كارەی پێ نەدەدا. هیو هندن ئازاد بوو و بە تاقی تەنیا سەفەری كیشوەری ئەوروپای كردو زۆری پێنەچوو كە لە یەكێك لە وڵاتەكانی ئەوروپادا كۆچی دوایی كرد.**

**"كونت دو كونت"ی تازە، پاش ماوەیەكی كەم دەگەڵ لەیدی ئەدیت دا زەماوەندی كردو بەو بۆنەیەوە شاییو زەماوەندێكی گەورە لە كۆشكی هندن هولو لە ئاواییەكەی نزیكیدا بەرپا كرا.**

**دەربارەی بابی تۆم كانتی كەس هیچی نەزانیو هیچی نەژنەوت.**

**شای چكۆلە ناردی بە شوێن ئەو دێهاتیەی كە داغمەی "غ"یان بە رووومەتیەوە نابوو، و دوای ئەوەی لە بەندی غوڵامی ئازادی كرد، لە كۆڕی دزانی (ماتامۆر)ش نەجاتی دا. ئەوەندەی سەروەتو سامان دایە كە بتوانێ بە شێوەیەكی ئابڕومەندانە پێی بژی.**

**هەروەها كابرای گوێ بڕاوی لە زندان ئازاد كرد. جیازی بۆ كچانی ئەو دوو ژنە (ئانابابتیست)ەی كە بە زندویەتی خرانە ئاگرەوەو سوتێنران، فەراهەم كرد. توندترین سزای ئەو مامورەشی دا كە شەلاخی لە مایڵز هندن دابوو.**

**هەروەها شا، ئەو كوڕە گەنجەی كە بازێكی لە باخەكەی خۆیدا دۆزی بووەوەو،و ئەو ژنەی پارچە قوماشێكی دزی بوو، لە مردن رزگاركردن، لێ مخابن فریای ئەو داماوە نەكەوت كە دەیانگوت ئاسكێكی پاركی سەڵتەنەتی كوشتووە، چونكە ئەو نەگبەتە بەر لەوەی شا فریای بكەوێت، بەسزای گوناحی نەكردو گەیەنرابوو.**

**شا، چاكەی ئەو قازییە میهرەبانەی كە لە مەسەلەی دزینی بێچووە بەرازەكەی ژنە دێهاتیەكەدا، لوتفو میهرەبانی دەرهەق بەو (شا) نواندبوو، دایەوەو پۆست و پلەو پایەكەی بەرزتر كردەوە، تا لەبەر چاوی هاوشارییەكانیدا گەورەترو خۆشەویست تر بێ.**

**شا، هەندێجار بیرەوەری وبەسەرهاتەكانی ژیانی خۆی، لەو رۆژەوە كە پاسەوان لە كۆشكەكەی وەدەرنا بوو تا ئەو شەوەی كە هاوڕێ دەگەڵ كرێكارەكاندا خۆی گەیاند بووە حەوشەی كلێسای ویستمنیسترو لە پەرستگەكەی سەنت ئیدوارد لوكونفسوردا خەوێكی قووڵ بردبوویەوە، وەبیر دێنایەوە. بە تایبەتی بیرەوەری خەوی قورسی ئەو شەوەی پەرستگەكە، كە چۆن لەزگ بوو، لە رێوڕەسمی ئاهەنگی تاجگوزاریەكەی دوا بخات و لە ماڤی یاسایی خۆی مەحرومی بكات، هەر لە بیر نەدەچوو. شا زۆر جار بەخۆی دەگوت:**

**"هەق وایە من هەرگیز دژواریو نامرادیەكانی ژیانی خۆم لە بیر نەكەم. چونكە ئەم قۆناغە ناخۆش و تفتو تاڵانە بۆ من قوتابخانەیەكی پڕ سوود بوو، و فێری دەرسی بەنرخی ئەوتۆی كردم كە پێویستە میللەتی خۆمیان لێ سوودمەند بكەم. ئەو دژواریو نەگبەتیو نامرادیانە كانیاوێكی وەهایان لە دڵمدا هەڵقوڵاندووە كە هەرگیز وشك ناكاتو ئەویش كانیاوو سەرچاوەی میهرو مەحەبەتە."**

مایلز هندن و تۆم کانتی، لە دەورانی کورتی سەڵتەنەتی ئیدواردی شەشەمدا، لە هاودەمان و نزیکانی تایبەتی ئەو بوون و کە مردیش لە کانگای دڵەوە لەسەر مەزارەکەی گریان. ((کۆنت دو کۆنت))ی تازە زۆر لەوە ئاقڵتر بوو کە ئیمتیازاتە تایبەتیەکانی خۆی بە باری نەریێنیدا بەکار بێنێ، لەگەڵ ئەوەشدا دوای مەرگی ئیدوارد دوو جار، بەکاری هێنا، جارێکیان لە حوزوری شابانۆ ماری تودور، ناسراو بە (ماری خوێنمژ)و جارێکی تر لە حوزوری شابانۆ ئەلیزابت دا، سوودی لەو ئیمتیازە وەرگرت و بەبێ پەروا لە حوزوریاندا دانیشت.

یەکێك لە نەوەکانی مایلزیش لە حوزوری ژاکی یەکەمدا سوودی لەم ئیمتیازە وەرگرت.

بەلام دوای تێپەڕبوونی پەنجا ساڵ بەسەر ئەو ئیمتیازەداو لە کاتێکا کەس هەر لە بیری نەمابوو، یەکێکی دی لە نەوەکانی مایلز، ویستی ئەو ئیمتیازە بەکاربێنێ و لە حوزوری شارلی یەکەمدا دانیشت، لێیان کرد بە هەلایەك ئەوسەری دیار نەبێ، بەلام باش بوو مەسەلەکە بە خێر گەڕاو دوای ئەوەی دروستی و هەقانیەتی ئیمتیازەکەی سەلماند، کوڕەی لاو لەو قەزاو بەلایە رزگار بوو. دوا وەچەی ماڵباتی (کۆنت دو کۆنت) لە یەکێك لە شەڕە ناوخۆکانی ولاتدا کوژراو بە مردنی ئەو ئەم ئیمتیازە مێژووییەش خۆ بە خۆ سڕایەوەو نەما.

تۆم کانتی عەمرێکی زۆری کرد. لە دوا دوایی تەمەنیا پیرەمێردێکی جوان و بە هۆش و گۆش و زیتەڵ بوو، قژە سپییەکەی شێوەو هەیئەتێکی پڕ ویقارو میهرەبانی پێ بەخشی بوو. تا کۆتایی تەمەن هەر بەڕێزو خۆشەویستی خەڵکی بوو، جلە جوان و دەگمەنەکانی ئەوەی بەیادی میللەت دێنایەوە کە ( لە تەمەنی لاویدا بۆ چەند رۆژێك پاشا بووە) بە هەر شوێنێکدا تێپەڕیبا خەڵکەکە لەبەری هەڵدەستان و رێگەیان بۆ چۆڵ دەکردو بە گوێی یەکیاندا دەچپاند:

"کلاوەکانتان لەسەر داگرن، ئەم پیاوە دەستەبژێرو خۆشەویستی پاشایە!" ئەویش بە بزەیەکی شیرین کە زەوق و خۆشی بە دلان دەبەخشی، سلاوی خەڵکەکەی دەسەندەوە.

بەڵێ، ئیدواردی شەشەم تەمەنی کورت بوو، بەلام دەیزانی چۆن ئەم تەمەنە کورتە بە چاکەو لە رێگەی چاکەدا بەکار بێنێ. زۆر جار لەبەر ئەوەی لە رادەبەدەر دلۆڤان و بە بەزەیی بووە سەرزەنشت و لۆمەیان کردووە، زۆر جار شیرەتکارەکانی پێیان دەگوت:

"خاوەنشکۆ، ئەم قانونەی کە بە بۆچوونی تۆ زاڵمانەیە،و دوای ئەوەی چەند جارێك هەموارت کردووەتەوە،، بە بۆچوونی ئێمە ئێستا زۆر مرۆڤانییەو رەنج و زوڵم و گوشاری بۆ هیچ کەسێك تیا نەماوە."

لێ شا هەموو جارێ چاوانی، کە پرشنگی میهرو مەحەبەت و بەزەییان لێ دەباری هەڵدەبڕی و پێی دەگوتن:

"ئێوە لەکوێ مانای زوڵم و زۆرو رەنج و گوشار دەزانن؟ ئەمە شتێکە کە تەنیا من و میللەتەکەم دەیزانین و تەنیا ئێمە دەتوانین باسی بکەین، چونکە ئەزموونمان لەو بارەیەوە هەیە!"

با ئیدواردی شەشەم لێرەدا بەجێ بێڵین. لێ نابێ ئەوەمان لە بیربچێت کە ئەم پاشا چکۆلەیە لە سەدەیەکدا کە زوڵم و زۆرو دڵڕەقی و بێ رەحمی باڵی بەسەر کیشوەری ئەوروپادا کێشا بوو،

توانی بە روناکی رەحمو بەزەیی و دڵسۆزیو دلۆڤانی دڕ بە تاریکی بداتو مرۆڤانە حوکمڕانی بکات.

***تێبینی:***

***لە رۆژی ٢٠١١/١/٨، سەعات حەوتو نیوی بەیانی لە سلێمانی، گەڕەکی رزگاری، لە ماڵی خۆمان لە پاچڤەی ئەم رۆمانە بوومەوە کە لەم سەرچاوەیەوە کراوە بە کوردی:***

***شاهزادەو گدا / مارك توین***

***مترجم: محمد قاضی***

***چاپ چهاردهم: ١٣٨٨***

***انتشارات جامی باهمکاری انتشارات علمی و فرهنگی.***

**حەمە کەریم عارف**

* کەرکووکییە و لە ساڵی ١٩٥١دا لەدایك بووە.

- لە ساڵی ١٩٧٥ کۆلیژی ئەدەبیاتی بەغدای تەواو کردووە.
- یەکەم بەرهەمی شیعرێکە بەناوی (هەڵبەستێکی هەتیو کەوتوو) کە لە ژمارە (١٧٠) ڕۆژنامەی هاوکاری لە ١٩٧٣/٦/٨ بڵاوبووەتەوە.
- لە ساڵی ١٩٧٥ەوە بە بەردەوامی نووسین و بەرهەمی ئەدەبی بڵاو دەکاتەوە.
- سەرنووسەر یان بەڕێوەبەری نووسین یان سکرتێری نووسین یان ئەندامی دەستەی نووسەرانی ئەم گۆڤار و بڵاوکراوانە بووە: گۆڤاری گزنگی نووسەرانی کەرکووك، نووسەری کوردستان، کەلتوور،نووسەری کورد، گوڵانی عەرەبی، ئاڵای ئازادی تا ژمارە ٢٢٢، گۆڤاری نەوشەفەق.

* جگە لە ناوی خۆی، بە تایبەتی لە گۆڤاری گزنگی نووسەرانی کەرکووك،نووسەری کوردستان، کەلتوور، ڕۆژنامەی ئاڵای ئازادی تا ژ: ٢٢٢ بەناوی گۆڤەند، زنار، سیپان، پاکزاد، محەمەدی حاجی، سیروان عەلی، دیدار هەمەوەندی، هێژا، ح. ع ،هامون زێباری، با زەوان عەبدولکەریم بەرهەمی بڵاو کردووەتەوە.

*لە ساڵی ١٩٧٤ – ١٩٧٥دا پێشمەرگەی شۆڕشی کوردستان بووە، لە هەشتاکاندا بۆ ماوەی نۆ ساڵ، بێ وابەستەگی حیزبی پێشمەرگە بووە و وەکو بەشدارییەکی مەیدانی و ویژدانی لە خەباتی ڕەوای نەتەوەی کوردا شانازی پێوە دەکات و منەت بەسەر کەسدا ناکات، چونکە باوەڕی وایە کە ڕۆڵەی میللەتی مەزلوم مەحکومە بە پێشمەرگایەتی.

- لە هەشتاکانەوە تا ٢٠١٠/٨/٢٠ ڕاستەوخۆ سەرپەرشتی و سەرۆکایەتی لقی کەرکووکی یەکێتیی نووسەرانی کوردی کردووە.
- زۆر بەرهەم و کتێبی چاپ و بڵاو کردووەتەوە، لێ زۆربەی هەرە زۆریان، بە تایبەتی ئەوانەی لە چیادا چاپ بوون بە نوسخەی هێندە کەم بڵاوبوونەتەوە،لە نرخی نەبوو دان و هەر ئەوەندەیە کە لە فەوتان ڕزگار بوون. هەندێك لە وانە:

١- تیرۆژ، کۆ چیرۆك، چاپی یەکەم ١٩٧٩
٢- کۆچی سوور، ڕۆمان، چاپی یەکەم،١٩٨٨،چاپی سێیەم ٢٠٠٧
٣- بەیداخ، چیرۆك، چاپی یەکەم ١٩٨٨
٤- داوەتی کۆچەرییان، کۆ چیرۆك ،چاپی دووەم ٢٠٠٥
٥- لە خۆ بێگانە بوون، کۆمەڵە چیرۆك،چاپی یەکەم (١٩٩٩) دەزگای گوڵان
٦- کوچ سرخ، کۆ چیرۆك، بە فارسی، وەرگێڕان چاپی یەکەم ١٩٨٧ شاخ

٧-	نینا، رۆمان، سابت رەحمان، چاپی یەکەم،شاخ،١٩٨٥ چاپی سێیەم ٢٠٠٥
٨-	نامۆ، رۆمان، ئەلبیر کامۆ، چاپی یەکەم، شاخ١٩٨٧چاپی چوارەم ٢٠٠٩ وەشانخانەی سایە،سلێمانی
٩-	رێبەر، رۆمان، مەهدی حسین، چاپی یەکەم (شاخ) ١٩٨٣، چاپی دووەم، ٢٠٠٧
١٠-شکست، رۆمان، ئەلکساندەر فەدایەف، چاپی شاخ (راە کارگر)، چاپی دووەم، ٢٠٠٩ خانەی وەرگێڕان.
١١- هاومالەکان، رۆمان، ئەحمەد مەحمود، چاپی دووەم ٢٠٠٠ دەزگای گولان
١٢ – بێناسنامەکان، رۆمان، عەزیز نەسین، چاپی سێیەم ٢٠٠٦
١٣- قوربانی، رۆمان، هیرب میدۆ، چاپی یەکەم ٢٠٠٤ دەزگای شەفەق
١٤- دوورە ولات، رۆمان ع. ڤاسموف، چاپی یەکەم٢٠٠٠ دەزگای گولان
١٥- ئازادی یا مەرگ، رۆمان، کازانتزاکیس، چاپی یەکەم ٢٠٠٣ کتێبخانەی سۆران، چاپی دووەم: ٢٠٠٨
١٦- چیرۆکەکانی سەمەدی بیهرەنگی، چاپی دووەم، ٢٠٠٤ کتێبخانەی سۆران هەولێر
١٧- ئامانجی ئەدەبیات. م. گۆرکی، چاپی شاخ ١٩٨٥
١٨- ئەو رۆژەی کە ونبووم (کۆمەڵە چیرۆکی بیانی) چاپی یەکەم،٢٠٠٦
١٩- جێ پێ (کۆمەڵە چیرۆکی فارسی) چاپی یەکەم ٢٠٠٦،نووسەرانی کەرکوك
٢٠- زندە خەون، کۆمەڵە چیرۆك، چیخۆف،چ١،دەزگای موکریانی
٢١- چیرۆکستان ،کۆمەڵێك دەقورەخنەی جیهانی چ١ ،٢٠٠٥،نووسەرانی کەرکوك
٢٢-دیدارو دەق و رەخنە،چ٢٠٠٥،١
٢٣-دیداری چیرۆکڤانی، چ٢٠٠٥،١
٢٤-ئەو بەرخەی کە بوو بە گورگ ،چ٢٠٠٨،١نووسەرانی کەرکوك
٢٥- میوان، چیرۆك،ئەلبێر کامۆ

---

٢٦- مەسەلەی کورد لە عێراقدا،عەزیز شەریف،چاپی دووەم ٢٠٠٥
٢٧- مێژووی رەگ و رەچەڵەکی کورد، ئیحسان نوری پاشا،چ١٩٩٨١،١
٢٨- کورد گەلی لە خشتەبراوی غەدر لێکراو، د. کوینتەر دیشنەر، چاپی سێیەم ٢٠٠٤
٢٩- لە مەهابادی خوێناوییەوە بۆ کەنارێن ئاراس، نەجەف قولی پسییان، چاپی یەکەم ٢٠٠٦
٣٠- کورد لە سەدەی نۆزدەوبیستەمدا،کریس کۆچرا،چاپی چوارەم ٢٠٠٧
٣١ -کورد لە ئینسکلۆپیدیای ئیسلامدا،چاپی یەکەم ١٩٩٨
٣٢- چینی کۆن، چ١(      )دەزگای موکریانی

---

٣٣- دلێریی خۆراگرتن، ئەشرەفی دەهقانی
٣٤- خەباتی چەکداری هەم تاکتیکە هەم ستراتیژ، مەسعودی ئەحمەد زادە

---

٣٥- ڤنسنت ڤان گوگ، شانۆنامە، باول ئایز لەر
٣٦- بە دوعا شاعیرەکان، شانۆنامە، جەلیل قەیسی (گزنگ ژ:١٢)
٣٧- جولەکەکەی ماڵتا، شانۆنامە،کریستۆفەر مالرۆ.
٣٨- دادپەروەران، شانۆنامە، ئەلبیر کامۆ
٣٩- بەد حاڵی بوون، شانۆنامە، ئەلبیر کامۆ.
٤٠- چاو بە چاو، شانۆنامە، گەوهەر مراد (غوڵام حسەینی ساعیدی)
٤١- ریچاردی سێیەم، شانۆنامە، شەکسپیر.چاپی یەکەم ٢٠٠٩، بڵاوەخانەی سایە، سلێمانی
٤٢- گەمەی پاشا و وەزیر، شانۆنامە، عەبدوڵڵائەلبوسێری..

---

٤٣- منداڵە دارینە، چیرۆکی درێژ بۆ منداڵان.
٤٤- فاشیزم چییە؟ کۆمەڵە چیرۆك بۆ منداڵان، یەلماز گونای
٤٥- شوانە بچکۆلەکە، چیرۆکێکی درێژی چینی یە بۆ منداڵان
٤٦- زارۆکستان (چوار شانۆنامە بۆ مناڵان)
٤٧- چەند چیرۆکێك لە ئەفسانەی یونانی کۆنەوە (٢٣ئەفسانە)

---

٤٨- لە گەنجینەی حیکایەتی تورکمانییەوە. (ئەفسانەی ئەسپی ئاشق)چاپی یەکەم٢٠٠٨
٤٩- ئەفسانەێن گریکی و رۆمانی، چاپی یەکەم (٢٠٠٤) کتێبخانەی سۆران، هەولێر
٥٠- ئیلیادە، هۆمیرۆس، چ١،دەزگای سەردەم ٢٠٠٩

---

٥١- گۆڤەنـد و زنـار (فەرهـەنگی فارسـی - کـوردی) حەمـە کـەریم عـارف، چ١(٢٠٠٦-٢٠٠٨)دەزگای موکریانی
٥٢-چۆنیەتی فێربوونی زمانی فارسی، چ١، ٢٠٠١

---

٥٣- چرنیشفسکی، فەیلەسوف و زانای گەورەی میللەتی روس
٥٤- چایکۆ فسکی، ژیان و بەرهەمی.
٥٥- ئیدگار ئالین پۆ، ژیان و بەرهەمی.
٥٦- جاك لەندەن، ژیان و بەرهەمی
٥٧- گوگول، نووسەری ریالیست
٥٨- یەڵماز گونای، ژیان و بەرهەمی
٥٩- سادقی هیدایەت، ژیان و بەرهەمی
٦٠- خافروغ لە شیعر دەدویّ، ژیان و بەرهەمی

---

٦١- راگەیاندن لە پەراوێزی دەسەڵاتدا (بە شەریکی) چاپی یەکەم (٢٠٠١) دەزگای گوڵان
٦٢-راگەیاندن لە نێوان حەقیقەت بێژی و عەوام خەڵەتێنی دا، حەمە کەریم عارف،چ(١)،٢٠٠٥

٦٣- مێژووی ئەدەبیاتی جیهان (لە کۆنەوە تا سەدەکانی ناڤین).چاپی یەکەم٢٠٠٨
٦٤- مێژووی ئەدەبیاتی جیهان (لە سەردەمی رینیسانسەوە تا ئێستا).چاپی یەکەم٢٠٠٨
٦٥- مێـژووی ئـەدەبیاتی جیهـان (ئـەدەبیاتی ئینگلیـزی زمـان- ئـەمریکاو ئینگلیسـتان لـە سەرەتاوە تا ئێستا).چاپی یەکەم٢٠٠٨
٦٦- ریالیزمودژە ریالیزم لە ئەدەبیاتدا،سیروس پرهام،چ١،٢٠٠٤،دەزگای سپیرێز
٦٧- قوتابخانە ئەدەبییەکان،رەزا سەید حسەینی، چ٦،٢٠٠٦دەزگای موکریانی
٦٨- مێژووی ئەدەبیاتی روسی، سەعیدی نەفیسی
٦٩- لێکدانەوەیەك لەمەڕ نامۆ ، لویس ریی ،چ٢، ٢٠٠٦
٧٠- هونەروژیانی کۆمەڵایەتی، بلیخانۆف، چ١(٢٠٠٥)دەزگای موکریانی
٧١- گوزارشتی مۆسیقا،د. فواد زکریا، چ١،یانەی قەڵەم ٢٠٠٦
٧٢- رێبازە هونەرییەکانی جیهان
٧٣- پێکهاتەی بەدەنی و چارەنووسی ئافرەت،(چ١) ٢٠٠٦
٧٤- دەربارەی شیعروشاعیری، حەمە کەریم عارف، چ١،٢٠٠٧
٧٥- دەربارەی رۆمانو چیرۆك، حەمەکەریم عارف،چ١، ٢٠٠٨
٧٦- مـەرگی نووسـەرو چـەند باسـێکی دیکـەی ئـەدبی-رۆشـنبیری،حەمەکەریم عـارف،چ١، ٢٠٠٥نووسەرانی کەرکوك
٧٧- ناودارانی ئەدەب، حەمە کەریم عارف، (چ١) دەزگای موکریانی،٢٠٠٩
٧٨- پەیڤستانی من، حەمە کەریم عارف،چاپی یەکەم()
٧٩- پەڵکە رەنگینە، حەمە کەریم عارف،چ١، ٢٠٠٤
٨٠- خیانەتی حەلاڵ، حەمە کەریم عارف
٨١-بووکی هەزار زاوا، کۆچیرۆك، بزورگی عەلەوی
٨٢-ئەبوزەر، د.عەلی شەریعەتی
٨٣-ریوایەت، ڕۆمان، بزورگی عەلەوی
٨٤-وقفات في رحاب الثقافة الكوردية، حەمە کەریم عارف
٨٥-هەژاران، ڕۆمان، دوستوفسکی
٨٦-دەیڤد کۆپەرفیلد، (رۆمانی کورتکراوە بۆ نەوجەوانان) چارلس دیکنز
٨٧-ئۆدیسە، داستان، هۆمیرۆس
٨٨-ظل الصوت و قصص اخرى، تقديم و ترجمة جلال زنگابادی
٨٩-شازادە و گەدا، رۆمان، مارك توین
٩٠-شاکارێن ئەدەبیاتی جیهان
٩١- سفرەی فەقیران...حەمەکەریم عارف

